


# ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا

جەلال مەحمود عەلی

# وتەیەکی پێویست

هێشتا تەواو چاوم نەکرابووەوە بەلامەوە سەیر بوو لە زۆر هەلوێستدا هەندێك کەس لە بری ئەوەی مەرامێکی دلیان بە قسەی سادە دەربڕن ، بە پەندێك ، یان بە وتەیەك دەریان دەبڕی کە لێکچوواندنی تێدا بوو ، هەندێکی تێدەگەیشتم و زۆری نەء ئەو هەندە ، جۆرە خۆشیی و پێزێکی بە قسەکە دەداو هەندێکی تری وەك نوکتە ، یا گالتەو گەپ دەهاتە پێش چاوم . ئەوی تریشی پالی پێوە دەنام بیریان لێ بکەمەوە . یان شەو تا درەنگانێك ، چیرۆکی خۆشیان بۆ دەگێڕاینەوە . چیرۆکەکان لە بن نەدەهاتن . ئەوانە هەموو لە دل و مێشکدا جێگەیەکی دیاریان گرت ، کە گەورە بووین ، نرخی ئەو کەلەپوورەمان زانی ، زۆر کەس بەلایەوە ستەم بوو ئێستەش هەروەها ، کە بفەوتێت . لە کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی شەقلاوەدا ، کۆکردنەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی و فۆلکلۆر بە تایبەتی، یەکێك بوو ، لە بڕیارەکان . لە سەر بیرخستنەوەی من ، بە نامەیەك بۆ نەقابەی مامۆستایان لە سلێمانی ، لقی سلێمانی کەوتە گوڕ و گۆلی ئەنجام ئێمە کە دوا لیژنە بووین کتێبێکمان بە ناوی[1] (سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە ) دانا .

لە بەشی وێژەدا لەسەر پێشنیاری من ( وتەی جێگر ) واتا ئیدیۆم خرایە کتێبەکەوەو کرا بە بەشێکی تری وێژە . ناوەکەی لیژنە دایناو نموونەکان من یەکەم جار خستمە بەردەستیان . ئیتر لەو کاتەوە کەلکەلەی کۆکردنەوەی ئیدیۆمم کەوتە سەر ، وا ئێستا ئەم کتێبەتان

(١) بڕوانە پاشکۆی لاپەڕە ـ٣ـ لە کۆتایی کتێبەکە .

پێشکەش دەکەم ، کە رەنجێکی زۆرم لەگەڵ داوەو کتێبەکەیشم ناوناوە ئیدیۆم کە بەشێـــکە لە سەرچـاوە بەنرخەکـەی رەوانبێـــژیی ( بلاغــە ) زمانی کوردی ، کە زۆری تری وەکو منیش خەریکی بــن هێشتا هەر لەبن نایەت • بۆیە ناویشم ناوە ئیدیۆم ، چونکە بەشــی هەرە زۆری کتێبەکەم لەم بەشەیە ، بەشێکی لێکچواندنە ( تشبیــە ) کە بە ( دەڵێی ) یان ( وەك ) دەست پێ دەکات ، یان جاری وا هەیــە بێ ئامرازی لێکچواندنە • بەشێکی لێکچواندنەکە سادەیەو بەشــی هەرە زۆریشی لێکچواندنێکی بالآیە ، کە لەگەڵ سادەکەدا جیاوازییەکی گەورەی هەیە ، چونکە ناسادەکە شێوە ئیدیۆمەو ڕەگی لەســـەر زەمینەیەکی قووڵو مێژوویی پتەو دارِشتووە ، پێویستی بە لێکدانەوەو بەدوادا گەرِانێکی زۆری هەیە ، تا تێی بگەیت • ئەم لێکچواندنــە ئیدیۆمیــن • بەشی سێهەمی کتێبەکە خوازەیە (مجاز) کە خواستــن ( استعارە) بەشێکی گرنگی ئەو خوازەیەیە • بە پێی ئەو پێناسەیەی کە مامۆستا عەزیز گەردی لە کتێبەکەیدا کە (رەوانبێژی) یە ، کردوویەتی، کەوەرگێرِانی رەوانبێژیی (بلاغە)ی زمانی عەرەبییە ، خواستـــن ( بریتییە لە بەکار هێنانی وشەیەك بۆ دەربرِینی مانایەکی تر بێجگــە لەمانای دروستی (حقیقی) وشەکە بە مەرجێك پەیوەندیی تێـــوان مانای دروستو مانای خوازی وشەکە ویچوون ( مماثلة ) بێـــت ، دەبێت نیشانەیەکیش هەبێت کە ئێمە مەبەستمان بەم وشەیە مانـــا خواستراوەکەیە نەك مانا دروستەکە ، بەلآم ــ ئیدیۆم ــ یان ، درکە ــ وەك ئەو ناوی بردووە ــ دەشێت ئێمە مەبەستمان مانا خوازەکە بێت یان دروستەکە وەك بڵێین ( دەستی گرت ) بە هەردوو ماناکە بەکار دێت ، کەواتە ئەوە ئیدیۆمە • بەلآم ( بە باڵی خۆت بفرِە ) ئەمەیــان خواستنە ، چونکە مرۆڤ بە باڵ نافرِێت •

بەم شێوەیە کتێبەکەتان پێشکەش دەکەم ، ئومێدەوارم لە کەم‌و کووڕی ببوورن ، ئەوەی بۆ روونکردنەوە پێویستیش بێت بەم خاڵانەی خوارەوە پێشکەشتانی دەکەم :

١ ـ ئەو واتا لێکدراوانەی لەنێوان دوو کەوانەدان لە سەرچاوەکەوە وەرم گرتووەو هی خاوەنەکەیەتی ، بەڵام ئەگەر بە پێویستم زانیبێت دەستکاری داڕشتنی ڕستەکانم کردووە ، ئەوەی لە نێوان دوو داشدایە زیادەی خۆمە ، ئەوەیشی لە کەوانەدا نیە هەر هی خۆمە . لەگەڵ ئەوەدا کە دەمتوانی بەشی زۆری ماناکان لێکبدەمەوە حەزم کردووە هی سەرچاوەکان بنووسم بە پێزانینێکی رەنجی خاوەنەکەیم داناوە سەرچاوەکانیش لە کتیبەکەدا تۆمار کراون .

٢ ـ ئیدیۆم یا خواستن‌و لێکچواندنی وا هەیە بە چەند شێوەیەك دەوترێت بەپێی توانا نەم‌هێنتووە دووپات بینەوەو بە شێوەیەکیان نووسیومە وەك ( بوو بە ئاردی ناو دڕکان ) ـ وەك ئاردی ناو دڕکانە ـ دەڵێی ئاردی ناو دڕکانە ـ ئاردی ناو دڕکانە .

٣ ـ لە لێکدانەوەی هەندێکدا دەشێت بە چەند واتایەك لێکم دابێتەوە ، کە ئەگەر تەماشایان بکەیت وا دەزانیت واتاکان هاو واتان ( مرادف ) ، بەڵام لە راستیدا وا نین ، چونکە بە رای من تا ڕادەیەك لە یەك جیان‌و هەر یەکەیان لە جێیەکدا دەوترێت ، بە تایبەتی ئەو وشانە هێشتا لە کوردیدا پلەی واتاکانیان بۆ جیاو دیاری نەکراوە ، لەبەر ئەوە بە پێویستم زانی کە بیاننووسم ، بۆ پاشەرۆژ ، بۆ ئەو کەسەی قامووس بۆ زمانی کوردی‌و زمانێکی تر دادەنێت ، یاریدەدەرێك دەبێت .

٤ ــ بە پێی تواناو سۆراخ ئیدیۆمــی ( تێکــچرژاو[١] )م لێکداوەتەوە بەڵام هەیشە لەبەر کەمیی سەرچاوە ، کە پێویستی بــە قاموسی زمانە ئێرانییە کۆنەکانو ئاوێستاو هیندۆئەورووپییەکــان هەیە ، مانای وشە ( گیراوەکە[٤] )یم بۆ ساخ نەبۆتەوە ، لەگــەڵ ئەوەشدا تۆمارم کردوون بە ئومێدی ئەوەی هەبێت لە دوارۆژدا ئەو ئەرکە بگرێتە ئەستۆی خۆی •

٥ــ لە لێکدانەوەی ماناکانیاندا گەلێك جار بۆ مانای جیاجیا ، یان لە بری ژمارە فاریزەم داناوە •

٦ ــ دەشێت لە لێکدانەوەی مانای ئیدیۆمێکدا بە ئیدیۆمێکی تر واتایم لێکدابێتەوەو ئەمەی دواییشم لە شوێنێکی تردا تۆمــار نەکردبێــت •

٧ ــ لە لێکدانەوەی واتاکاندا هەندێکی واتای سەرچاوەکــەم نووسیوەو خۆیشم لێکم داوەتەوە ، هەردووکی راستە ، بــەڵام هەریەکەیان جۆرە دەربڕینێکە ، بە پێویستم زانی هەردووکی بخەمە پێش چاو ، وەك : لووتی بەرزە ، واتا : فیزی زلە ، ( بە دەعیــەو دەمارە ) •

٨ ــ ئەوەی کە پێویستە بیلێم ئەوەیە کە لێکدانەوەی واتــاو سەرچاوەی گەلێك ئیدیۆم لێکچواندنو خوازەکان پێویستی بــــە لەسەر رۆیشتنو شیکردنەوەیەکی زۆرتر هەیە کە ئەگەر ئــــەوەم بکردایە دەبوو هومێدی چاپکردنی کتێبەکەم ببڕیایە • من ئەمە وەك

---

( )(٢) وشەی زمانی کوردی د• ئەورەحمانی حاجی مارف

سەرچاوەو بنچینەیەکی دادەنێم کە لە دەرفەتی تردا بتوانین تێـــرو تەســـەلتر لە هەر یەکەیـــان بکۆڵینەوە ـ ژمارەیەکیش لەو واتایانەی کە لەناو کەوانەدان لێکدانـــەوەی ئـــەو بەرێزانەن کە بـــە دەمـــی ئیدیۆمەکانـــم لـــێ وەرگـــرتوون وەك هی مامۆستـــا محمد مصطفی کوردیو مامۆستا محمد شەڵماشیو ..

جەلال

١٩٨٠/٨/٢٦

# ئیدیۆم

ئیدیۆم دەربڕەو « پێکهاتنێکی[1] تایبەتیو ئالۆزە کە لە یەکگرتنی هەندێك وشە واتایەکی تایبەتی پەیدا دەبێت کە لە مانادا لە وشە نزیك دەبێتەوە » • بیرێك ، هەستێك ، مەبەستێکی تایبەتی پێ دەردەبڕرێتو دەگرێتەوە ، بنچینەکەیشی لەسەر لێچواندنو هێما بووە • سیفەتـی کەسێك ، شتێك ، مەوسووفێکی پێ دیـــاری دەکرێـــت وەك ( دەنەسرین )[2] دەڵێت : « ئەوەیە کە ڕاستەوڕاست ناوی شتێـــك نەیەیت ، بەڵکو ناوی شتێکی تر ببەیت کە پەیوەندیی بە مانـــای یەکەمەوە هەبێت ، بۆ ئەوەی پیاو لە مانا باسکراوەکە بۆ مانا مەبەستە

هێما بۆ کراوەکە بچێ » • یان وەك عەزیز گەردی دەڵێت[3] «ئەوەیە وشەیەك یان دەستە وشەیەك بێنیت کە واتایەکی دروستی خـــۆی هەبێت هەر لەو کاتەدا لە رستەکەدا مانایەکی تر بدات بە دەستەوەو مەبەست ئەم مانایەی دوایی‌یە بێت ، دیسان دەشێ واتا دروســـتو نەژادیەکەت مەبەست بێـــت » •

ئیدیـۆم[4] دیاردەیەکە لە دیاردەکانی رەوانبێژی ، لـە زۆر وێنەدا راستیت بە بەڵگەوە بەردەست دەخات ، کارەکەت (القضیة) بۆ روون دەکاتەوە ، سەلماندنی لە تویێ خوێندا نیشـــان دەدات •

---

(١) وشەی زمانی کوردی دە ئەورەحمانی حاجی مارف

(٢) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ـ زانستگای بەغدا ژمارە ١٩ ساڵی ١٩٧٦ ز

(٣) رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا ـ بەرگی یەکەم ـ عەزیز گەردی

(٤) جواهر البلاغە فی المعانی والبیان والبدیع ـ احمد الهاشـــمی الطبعە (١٢) سنە ١٩٦٠م

جوانیو ڕەوانبێژیی ئیدیۆم لەوەدایە کە وێنەیەکی وا بۆ مەبەستو ماناکە دەکێشێت کە بەتەواویو ئاشکرا هەستی پێ بکەیــتو دەروونت بهەژێنێت ، کە ئەمەش سیفەتی تایبەتیی هونەرە بە گشتی • دەبینیت وێنەکێشێك وێنەی هومێد ، یان ناهومێدیت بۆ دەکێشێت ، وێنەکان دڵت رادەکێشنو سەرسامت دەکەنو ئەوەی کە بەزمـــان نەتدەتوانی دەری ببڕیت ، هەستی پێدەکەیتو لــــەلات روونو ئاشکرا دەبێــت •

هەروەها ئیدیۆم ناسکترینو وردترین هــۆی رەوانبێژی یە ، گەلێك لەوە کاریگەرترە کە تۆ راستەوراست راستییەك ئاشکرا بکەیتو بیلێیت ، چونکە ئەم پاڵت پێوە دەنێت بیر لە قسەکە بکەیتـــەوە ، هەروەها یاریدەت دەدات کە رای خۆت بەرامبەر شتێك ، ناحەزێکت دەرببڕیت لە کاتێکدا کە تۆ نەتەوێت رەپو ڕاست بیلێیت ، سا لەبەر هەر هۆیەك بێت ) ئینجا بیری وردو قووڵ ، سەرنجی تیژو خەیاڵــی فراوانو بەرز بەراوردکردنێکی بلیمەتانە ، دەوڵەمەندی لە وشەدا ، زیرەکیو وریاییو مەشرەبخۆشی ، دەورو بەرێکی تێــرو تەســەل ، سروشتێکی رەنگین لە دیمەنداو تاقیکردنەوەیەکی زۆری ژیانی گەل،ئەو دەربڕە وێنە ئاساییانەی هێناوەتە ئەنجام کە پاشماوەی هـــەزاران ساڵەی باوو باپیرانە ، « بە درێژایی[5] مێژووی ــ میللەت ــو زمان ، هەریەکە لە جێیەك و لە دەمو کاتێکدا ، بەرە بەرەو بە پێی پێویستو پێشکەوتنی زمان ــ وژیان ــ دروست بوونو دەبن » • دەربڕەیەکی

---

(٥) د• نەسرین فەخری ــ گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژمارە (١٩) ساڵی ١٩٧٦ ز

ئامادەی زمانەو لە کاتی پێویستدا بە کار دەهێنرێن • لە هەموو رووداوو کارەساتێکی رۆژانەو مێژوویی‌و هەموو هەڵوێستێکی دەروونی‌و نادەروونی‌و ژیان‌و بوون رەفتارو سیفەتی هەموو ئاژەڵ‌و زیندەوەرێك کە ماڵی بوون‌و نەبوون‌و ناسیون‌و ناوبانگی بەر گوێ کەوتووە ، کەڵك وەرگیراوەو کراوە بە سەرچاوەی ئیدیۆم‌و لێکچواندن ( تشبیه )و خوازە (مجاز) • ئیدیۆم ئاوێنەی پلەو قۆناغی تێگەیشتن و دانایی‌و ژیانی کوردەوارین ، کۆن‌و نوێیان یەك خستووە ، پێکیانەوە بەستوون ، لەگەڵ پەندی پێشیناندا لە ناوجەرگەی کۆمەڵەوە هەڵقولیون ، سەرچاوەیەکی روونی رۆشنبیری‌و پەروەردە کردنێکی باڵای کۆمەڵن ، لەگەڵ خوازەو لێکچواندنە فۆلکلۆرییەکەدا رانومای مرۆڤی کورد دەکەن لە رووی رەوشت‌و نەریت‌و پەروەردەکردنی گیانی کۆمەڵایەتییەوە ، بە رێگای نا راستەوخۆ ، هەموو نەریتێکی ناپەسندو سیفەتێکی ناشیرین رسوا دەکەن‌و هانی گرتنی رێگەو خووی جوان‌و بەرزو پاك دەدەن •

جاری وا هەیە ، شێوەی گاڵتەجاری‌و نوکتەبازی ، بۆ ئەو ئامانجە دەگرن • ئیدیۆم ئاوێنەی رووی کۆمەڵە ، بە باری چاك‌و خراپیەوە ، لەرووی کشتوکاڵ‌و پیشەسازی و رامیاری‌و زانست‌و بیرو باوەڕو ئاین‌و ئەفسانەو مێژوو گەلێك رووی ترەوە • لەگەڵ پەندی پیشینان‌و خوازەو لێکچواندنە فۆلکلۆرییەکاندا خشڵی رازاندنەوەی زمانی کوردین • ئاوێنەی پلەی بەرزی‌و جوانی‌و بەتوانایی‌و زیندویی‌و پێشکەوتنی زمانەکەن • نیگارێکی رەنگینی دڵفرێنن بۆ رازاندنەوەو نواندنی بەهێزی‌ی زمانەکە • دەتوانیت رای خۆت بەرامبەر هەڵوێستێك بارێك ، کەسێك ، سیفەتێك ،

پەیوەندیەك ، شتێك بە چەند وشەیەكی سادە دەربڕیت ، بـــەلام تـۆ بە ئیدیۆمێك ، خوازەیەك ، لێكچواندنێـك دەری دەبڕیـت ، تـا قسەكەت بەهێزترو خۆشترو كاریگەرتربێت ، جوانترو چاكتـر سەرنج رابكێشێتو بچێتە دڵەوەو خۆشی بەدڵو دەروون بدات ، چاو روون بكاتەوە • بڕوانە دەڵێت :

ناتێكی بەو رۆنەوە خواردووە ، ئەسپێ لە باخەڵیدا سەوزەڵـە گیانم دەڵێت ، مل لە چەقۆ دەسوێت • نانخۆری سفرە دڕە • خوێنی سیاوەخشە • چی لەم وتانە بالآترو پڕ ماناترو وێنەدارترو كاریگەرترە•

د• ئەورە حمانی حاجی مارف لە رووی رادەی یەكگرتـــنو پەیوەندی ئەو وشانەی ئیدیۆمەكە پێك دەهێننو لە رووی ئەوەی كە مانای گشتیی ئیدیۆمەكە بە هەر وشەیەكی ئەو ئیدیۆمەوە تـــا چ رادەیەك بەندە كردوونی بە سێ بەشەوە[٩]

١ ــ تێكچڕژاو ، ٢ ــ یەكگرتوو ، ٣ ــ تێك ئالآو

تێكچڕژاو : ئەوانەن كە مانای گشتیان بە هیچ جۆرێك بەنـد نییە بە مانای ئەو وشانەوە كە پێكیان هێناوە ، بەڵكو بەشێك لـــە ئیدیۆمەكە بریتییە لە وشەیەك كە خاوەنی مانای سەربەخۆی خۆی نییە وەك ( شتو مت ، گوڵو موڵ ، گێژو وێژ ، هاتەرانو پاتەران ••• هتد ) • واتا بۆیە بوونەتە ئیدیۆم ، پێكەوە هاتوونو یەكێكیان هیچ واتایەك نابەخشێت و بە هۆی ئەوەوە بە ئیدیۆم دەناسرێنو واتای ئیدیۆمەكەش ئاشكرایە ) • هەروەها د• ئەورەحمان دەڵێت : ( لـــە زمانی كوردیدا فرێزی وا هەن كە وشەی مردوویان تێدایە ( الكلمة الميتة ) ، لە زانستی زماندا ئەو جۆرە وشانەش هەر بە (فریزیولۆژیی تێكچڕژاو ) ــ واتا ئیدیۆمی تێكچڕژاو ــ دەژمێردرێن چونكـــە

---

(٦) وشەی زمانی كوردی د• ئەورەحمانی حاجی مارف

مانای گشتیی فریزەکە ناتوانرێت لە رێگەی سەرپاکی مانـــای وشەکانەوە وەربگیرێــت ) •

بەلام بە رای من ئەمانە لەبەر ئەوە نەبوون بە ئیدیۆم کـــە یەکێکیان مانای نییە ، بەلکو لەبەر ئەوەیە واتایەکی خوازەی (مجازی) جیا لە واتای هەردووکیان ، واتا جووتە وشەکە دروست دەکەن ، یان مانایەکی فراوانی جیا ، وشەیەکی مانا قووڵی وێنەدار (تصویری) پێك دەهێنن ، هەروەها هەندێك لەو جووتە وشانە یەکێکیان تەنها بـــۆ تەواوکردنی ئیقاعی وشەکەی پێشووی دەهێنرێت ، واتـــا هـــاو ئیقاعیەتی ، هەر وشەی یەکەمە بەلام پیتی یەکەمی دەکرێت بە (م) ، ئەمەش وەك وتم تەنها بۆ تەواوکردنی ئیقاعەکەیە کە زمانی کوردی زۆر بە تەنگیەوە هاتووەو دێتەو لە سازاندنی وشەکانیدا پەیڕەوییەکی بالای کردووەو ئاوازی موسیقیی وشەی هەمیشە پاراستـــووە • کەواتە وشەی (مت)، (موڵ) کە ئەو بە نموونە لە ( شـــتو مـــت) ، (گوڵو موڵ)دا هێناونییەوە لەو ریزەن کە بۆ ئیقاعی بەشی یەکەمـــی هاتوون •

بڕوانە ئەم وشە لێکدراوانە : دەستو برد = دەست بزواندنو بردن پێکەوە بووە ، لە کاتێکدا بووە ، یان دەست بۆ کێشانو بردن یەکێك بووە ، واتا : خێرا ، گورج •

دەستبەجێ : دەست بزواندنو بەجێهێنانی کارەکە یەك بووە واتا : گورج کارەکە کراوە •

پێچو پەنا : ئاشکرایە کە پێچی رێی کێو شیـــوو هەلـــەن دەبڕێت یان توون توونی کێوەکە دەبڕێتو هەموو پێچێك پەنـــای

تێ دەکەوێت کە دۆڵو شیو یان تونکەکەیە ، بەمـــە واتایەکـــی ( تصویری ) دروست دەبێت • دەڵێن بە پێچو پەنایە .

واتا : ناڕاستە یان فێڵبازە • هەروەها دەشێت یەکێك لەو جووتە ناوە کە ئیدیۆمە سیفەت بێتو لەگەڵ هاوەڵەکەیدا واتایەکی بەهێز دروست بکەن ، وەکو : گژو گیا ، واتا : گیایەك کە زۆر هەستابێتو بەگژ یەکدا چووبێت • بەم شێوەیە دەتوانین ژمارەیەکی زۆری تری لەم بابەتە بهێنین کە وشەی تصویری بن • ئینجا لێرەدا من دەڵێـــم دۆزینەوەی مانای دوو پارچەکەی ئیدیۆمی تێکچرژاو ، جگە لـــەو وشانەی هاو ئیقاعی ، پێویستی بـــە لیکۆڵینەوەیەکی زۆر هەیـــەو بەراوردکردن لەگەڵ زمانە کۆنەکانی ئێرانو ئاوێستـــاو هینـــدۆ ئەورووپیدا ، بۆ ئەوەی واتای ئەو پارچانە بزانرێت ئاشکرایشە وشە مردووەکانیش ئەگەر سەرچاوەی تەواو هەبێتو سۆراخی بنچینەیان بکرێت واتاکانیان هەر دەدۆزرێتەوە •

٢ ــ ( فریزیۆلۆژی ــ ئیدیۆمی ــ یەکگرتوو : ئەوەیە کە مانای لە ڕێگای سەرپاکی ئەو وشانەوە پێکیان هێناوە ئاشکرا دەبێت ، بەشی هەرە زۆری ئیدیۆمی کوردیش لە بەشی یەکگرتوودا دادەنرێت، وەك : زماندرێژ ، سەرسەخت ••• هتد ) •

٣ ــ فریزیۆلوژی ــ ئیدیۆمی ــ تێك ئاڵاو : بەشێك یـــان وشەیەك لە فریزەکە کە مانای سەربەخۆی خۆیشی هەیە ڕەگـــی ئیدیۆمەکەیەو بەو وشەیە ، یان بەشە دەبێتە ئیدیۆم وەك : خۆی لـــە تەل داوە • لێرەدا ( لە تەل داوە ) ئەو بەشە گرنگەیە کە فریزەکـــەی پێکهێناوە ــ واتا کردوویەتی بە ئیدیۆم ــ • ئیدیۆم هەیە یەك واتـــا دەداتو بۆ یەك مەبەستە وەك مل لە چەقۆ دەسوێت ، واتا : خـــۆی هاویشتۆتە مەترسییەوە هەیشە فرە واتان وەك : دووکەڵ لە ماڵـــی هەڵناسێت ــ واتا : ڕژدە ، یان هەژارە ) •

هەشن[٧] دژ بە یەکن ، وەك : رووگرژ × روو خۆش • قەرزَ کوێر × سەر راست • دلپیس × دڵپاك • کـون لـە جەرگیـــدا نییە × کونە مشکی لێ بوو بە قەیسەری •

هەشن هاو مەبەستن وەك لووت بەرزە = تڕ زلـە • زمـان درێژە = درێژ دادڕە •

ئیدیۆم لە رووی پێکهاتنەوە دەشێت وشەیەك بێت یان جووتە وشە ، یان چەند وشەیەك بێت کە پێکەوە گونجابێت • یـــان رستەیەك یان چەند ڕستەیەکی پێکەوە بەند بێت • ژمارەیەکی زۆری وشە لێکدراوەکان ئیدیۆمن ، چونکە واتایەکی مەجازیی جیا لـــە وشە رەسەنەکانی خۆیان دەدەنو ئەوەی زمانی کوردی بزانێت بـــە ئاسانی لە واتاکانیان دەگات وەکو : دەست کورتە ، دڵتەزێنە ، خوێن گەرمە ، چاو قایمە ••• هتد یان بە شێوەی سەجع[٨] ، یا شیعـر دێـن وەك :

گیانی هەموو جەڕبەندە × بە نوشتەی مالووم بەندە •
من هەمەو تەختەیەك دەوار×شەڕی پێ دەکەم لەگەڵ هەزارسوار
نەدیو بدی کوڕێکی بوو × ناویان لێنا سەلکە کودی •
نەدیو بدی کوڕێکی بوو × بری ناوکی چووکی بڕی
ڕوو بە ڕوو دەم چەور × پاشملە دەم تەور
لە عەرش هەتا قورش × کەس بە دۆی خۆی نالێت ترش •

(٧) د• نەسرین فەخری ، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژمارە (١٩) سـالی ١٩٧٦

(٨) د• نەسرین فەخری ، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژمارە (١٩) سـالی ١٩٧٦

شتێکی ئاشکرایە ئەو نەتەوانەی دراوسێ بن ، سالەهای سال
نزیك یەك ژیابن ، لە ئاسایش‌و شەڕدا پەیوەندییان نەپچرابێت ، ئالوگۆڕی بیرو باوەڕو شێوەی بینین‌و تەماشاکردنی ژیان‌و باری
سەرنجیان لە یەکەوە کەم‌و زۆر وەرگرتووە ، ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت
کە ئەو نەتەوەیە لە بیرکردنەوەدا جیا نەبوو بێت سەربەخۆیی بیرو
باوەڕو نەریت‌و خاسییەتی خۆی نەبوو بێت ، بەڵکو ئەمە دیاردەیەکە
سەرپاکی مرۆڤایەتی گرتۆتەوەو دەستوورێکی گشتی‌یە ، شارستانەتی‌ی
ئەمرۆش بەری رەنج‌و مێشکی مرۆڤە بە گشتی • کوردیش کە لەم
دەرگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەدا هەزاران ساڵە ژیاوەو
خاسییەتی نەتەوایەتی خۆی پاراستووە بە پێی دەستووری
دراوسێیەتی‌و تێکەڵاوی‌و ئاینی ئیسلامەوە هەندێك وشەی تورکی‌و

فارسی‌و عەرەبی هاتۆتە ناو زمانەکەیەوەو لە پەندو ئیدیۆم‌و بەشەکانی
تری رەوانبێژیدا خۆی نواندووە • وەك چۆن دراوسێکانی لە هی
ئەم کەڵکیان وەرگرتووە ئینجا جاری وا هەیە هەموو وشەی ئیدیۆمەکە
بێگانەیە وەك : قەرەبالغ یان قەڵەبالغ • وارو وێخ • ئاڵتم‌و ساڵتم
کە ئەمانە هەمووی تورکین • یان جوعەلبەقریەتی واتا ( جوع البقر )
کە عەرەبی یە • عاساتی‌و عاباتی بڕۆ بە خێر هاتی کە (عاساتی‌و عاباتی)
یەکەی عەرەبی‌یە یان تێکەڵە لە کوردی‌و زمانێکی تر وەك : گوێ
قوڵاخ کە ( قوڵاخ )ەکەی تورکی‌یە یان عازای ئەندامی کە عازا
( اعضاء )ی عەرەبی‌یە هەیشە[٩] هاو مەبەستەکەی لە زمانێکی تردا هەیە
وەك : رووو بە ڕوو دەم چەور پاشملە دەم تەور کە عەرەبییەکەی (بالوجه
مرایە بالتگفە سلایە ) • یان چاوی پێ هەڵنایەت ،کە توورکییەکەی
( گوێز ئوندەن سوو ئیچمز ) •

(٩) د• نەسرین فەخری ، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ژمارە (١٩
سالی ١٩٧٦

ئەركی ئیدیۆم : دەرخستنی ١ ـ ئاوەڵناوی[10] (صفە) کەسێك یان شتێکە ، باش یا خراپ بێت ، دەشێت بە ئاسانی سیفەتەکە دیاری بکرێتو واتای ئیدیۆمەکە روون بێت ، یان دەشێت لێکدانـــەوەو شیکردنەوەو چوونە بنجو بناوانی بویت وەك : یاری بە پارە دەکات زمان درێژە . ئاگر لە ماڵیدا ناکرێتەوە . عاسمانو رێسمانە کە ئـــەم دوانە ی دواییان پێویستی بە بیرکردنەوەو چوونە پنجو بنـــاوانو شیکردنەوە هەیــە .

٢ ـ یان بۆ دیاریکردنی خاوەن ئاوەڵناوەکە (موصوف) وەك گوێدرێژ شەولەبـــان .

٣ ـ یان بۆ دەرخستنی باری شتیك ، کەسێك ، بە باشی یـــان بە خراپی پیشان بدات ،بەئاسانی تێیبگەیت ، یان واتاکەی قووڵ بێت، پێویستی بە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئیدیۆمەکە بکات ، وەك : ها لە بان کای ئاگر تێ بەردراودا ، ناوکەرێژی کرد .

ئەگەر سەرنج لە ئیدیۆمەکانو ئەوانەی بۆ خواستن (استعارە)و لێکچواندن (تشبیە) هاتوون بدەینو لەو سەرچاوانە بکۆڵینەوە کـــە

---

(١٠) رەوانبێژی بەرگ (١) عەزیز گەردی

ليانَ هەلێنجراون‌و وەرگیراون‌و کراون بە کەرەسەی دارشتنیان ئەم تێبینیانەمان بەر چاو دەکەوێت :

١ ـ زۆر قەوماوو کارەساتی مێژوویی کراوە بە نموونەو لـەو جۆرە هەلوێستانەدا بەکار دەهێنرێت کە بشێت پێی بچوێنرێت وەك ئیدیۆم ، وەك خوازە بەکار بهێنرێت . وەك :

( خوێنی سیاوەحشە ) . بۆ قسەیەك ، کارێك ، ئاشووبێك کـە درێژە بکێشیت . ( فەرهاد کوژە ) بۆ یەکێك کە فیتنەباز و دووزمان بێــت . (رەنجی فەرهادی دا ) بۆ کەسێك کە رەنجێکی زۆر بدات‌و رەنجبێوەر بێت . گەلێکی تر لەم شێوەیە .

٢ ـ ئاوێنەی‌گەلێك نەریت‌و دەستووری ژیانی کۆمەلایەتــی‌ی کوردەواری‌یە کە هەندێکی ئێستە وازی لێ هێنراوە ، هەیشـــــە ئێستەش پەیرەوی دەکرێت وەك : (سەرت شین کەیت) ( سەرت لە خوم تێیت ) کە بۆ کۆستکەوتن‌و کارەساتی جگەربـر سەرشیـن دەکرا ، لە خوم دەنرا . واتا کۆستێکی گەورەت بکەوێت . ( شاربەدەر کرێت ) ، ( سەری بە تاشین چێت ) کە ئەمانە بۆ ئەتکی ئافرەتـــی سۆزانی دەکرا ( پرچی بە برین چوو ) ئەمەش جاری وا هەبوو بـۆ کوستکەوتن ئافرەتێك پرچی خۆی دەبری ، وازی لە دنیا دەهێنـا ، سا بۆ چەندێك بووایە . ( وەجاخی روونە یان کوێرە ) واتا نێرینەیان هەیە یان نییانـە .

٣ ـ جاری وا هەیە ئیدیۆمەکە ، یان خوازەکە (مجاز) لە بنچینەدا پەندە ، بەشێك لە پەندەکە . کە کورۆکی پەندەکەیە وەردەگیرێت بۆ ئەو مەبەست‌و مانایە ، لە هەلوێستێکدا کە بۆی بگونجێت بەکـــار

دەهێنرێت وەك ( شیردا بۆ داپیردا ) ، ( گیسکەکەی هەیاسی خاسە ) • ( شاخی لێ ڕوواوە ) ( بۆ جوانان هیچ عەیب نییە ) کە لە قرژاڵیـان پرسی بۆ بە دوو سەرە دەرۆیت ، وتی : بۆ جوانان هیچ عەیب نییە ، ئەمەش تەشەرە لە یەکێك دەدرێت کە کردەوەیەك بکات جێی بـە بێت و نەشێت بکرێت ، یان ئەو کەسە بێبار بێت •

بەم شێوەیەدەتوانرێت ئەو بەشە گرنگەی پەند بکرێت بە ئیدیۆم، یان بۆ خوازە بەکار بهێنرێت بۆ نموونە ( وتیان بەردە بۆ وا ڕەقیت ) وتی بەرداوبەرد کەوتووم • ئێستە دەتوانین بڵێین فیسارەکـەس بەرداوبەرد کەوتووە ، وەڵامی ئەوەدا کە بۆچی وا دڵڕەقە ، یـان بۆ لێبوردنی نییە • واتاکەیشی ئەوەیە کە لەگەڵێدا خراپن بۆیـە ئەمیش وایـە •

یان هەندێك ئیدیۆم وەك پەند دێتە پێش چاوو پەندیش نییـە وەك ( هەموو کەسێك مەنی ماڵی خۆیەتی ) واتا گەورەی ماڵـی خۆیەتی و بەوەوە خۆشی و ناخۆشی و بوون و نەبوونی دەردەکەوێت • لێرەدا د• ئەورەحمانی حاجی مارف لە کتێبی ( وشەی زمانی کردی )دا ( دەڵێت : هەندێك لە زانایان پەندی پێشینان و قسەی نەستەقیش هەر بە فریزیۆلۆژی ــ ئیدیۆم ــ دەدەنە قەڵەم ، ئەگەرچی زۆر پەند لـە ڕووی بەخشیتی ماناو پێکهاتنی ڕێزمانییەوە جیاوازیيان لەگـەڵ فریزیۆلۆژیدا هەیە بێگومان پێویستە پەنجە بۆ ئەوە رابکێشین کـە دەتوانرێت هەندێك لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەق بە تایبەتی لـە ڕیزی فریزیۆلۆژی دابنرێت ، ئەویش بەتایبەتی ئەوانـەی کـە خاوەنەکانیان دیارن ، لە سنووری پێکهاتنی فریز دەرنەچوون •

٤ ــ زۆر کردگاری رۆژانەی باش یا خراپ کــە رووی‌داوە ، کراوە بە نموونەو بۆ لێچواندن‌و دەربڕینی واتایەکی تایبەتی ، یــان بۆ دەربڕینی بارێکی دەروون کراوە بە ئیدیۆم‌و لە شوێنی خۆیــدا بەکار دەهێنرێت وەك : گۆزەکە لە سەری ئەودا شکا دوای کلاوی بابردوو کەوتووە • یەخەی خۆی دادڕی • شاباشی خــۆی داوەو قنج هەڵدەپەرێت • تەشی‌ڕێسە • جاو دەبێتەوە • خەڕەك دەڕێسێت• شەقڵی شکاند •

٥ ــ گەلێك دیاردەی فسیولۆجی هەیە کە لە ئەنجامی هەندێك هەڵوێست‌و باری دەروون یا لەشدا دەردەکەوێت ، دەکرێت بـــــە ئیدیۆم بۆ نیشاندانی باری دەروون ، یا کردەوەیەك کە لە ئەنجامــی ئەو بارە دەروونییە ، یا لەشەدا پەیدا دەبێت وەك •( خوێن لـــــە بەدەنیدا نەما ) واتا : ترسا • ( چاوی پەڕییە پشتــی ســـەری ) ، ( خوێــن زاوەتــە چـــاوی ) ، واتـــــا : تــــوورە بـــوو ( دەستی پێوە دەلەرزێت ) ، واتا : رژدە ، یان دەیەوێت دەســـت بگرێتەوە و پاشەکەوت بکات • ( لچی داهێشت ) ، واتا تۆرا یــان دڵگیر بوو ( تووکەسەر بوو ) ( خوێن پڕ چاوی بوو ) ، واتا : توورە بوو • گەلێکی تر لەم شێوەیە •

٦ ــ هەندێك ئیدیۆم‌و خواستن ( استعارە) لەسەر بیـــــرو باوەڕێك دانراوە ، کە دەشێت زانستانە نەبێت‌و ئێستە باوی نەمابێت یان لەسەر ئەفسانەو چیرۆکە ئەفسانەییەکان دانراوە گەلێك کەلـــك لەسەر گوروشتەو چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان وەرگیراوەو ڕستـــەو هەڵوێستی ناویان بۆ داڕشتنی لێکچواندن و ئیدیۆم‌و خواستـــن

بەکار هێنراوە • وەك : ( خوێنی بۆ گەڕی دەشێت ) واتا زۆر پیسەو گوایا پیسیش بە پیسییەوە دەڕوات • ( دایکی ئـــاڵ بردیـەوە ) ( شەوەگوش کراوە ) ( مێردەزمەیە ) ( حووچـی بنی حەلـــەقە ) سندەڵقۆی برای شەیتانە ) ( دەڵێی گوڕنەتەڵەیە ) •

٧ ــ هەندێك ئەندامی لەش لە پێکهاتنی وشەی لێکـــدراوی کوردیدا دەورێکی باڵا دەبینن کە بەشێوەی ئیدیۆمیش بەکـــار دەهێنرێن ئەوەش دیاردەیەکە لە گەلێك زمانی تریشدا هەیە ، بـــە تایبەتـــی لە زمانە هیندۆ ئەورووپییەکاندا • ئەو ئەندامانەش ( دڵ ، چاو ، سەر ، دەست ، شان ، پشت ، مل ، زمان ، روو ، پێ )ن کە زۆر بەکار دەهێنرێن ، وەك : دەستکورتە ، زمانپیسە ، رووسوورە سەرڕاستە ، چاوسوورە ، ملکەچە ، پشتئەستوورە ، دڵپاکە •

٨ ــ کەلك لە هەموو کەرەسەو کەلوپەلێك‌و شتێك وەرگیراوە کە لە ژیانی رۆژانەدا بەکار هێنراوە ، بۆ داڕشتنی ئیدیۆم‌و خوازەو لێکچواندن ، بۆ دەربڕینی بیرێك‌و بە پێزو بەهێزکردنی قسەیەك ، تـا زیاتر کاریگەربێت‌و ئامانج بهێنێتە دی وەك : مەقاشی دەستی ئـەم‌و ئەوە • خەنجەری دەبانە • ئاگری بن کایە • شیری میسرە ــ بەرماڵی بە سەر ئاوەوە دەگەڕێت • بە کاڵەو پێناوەوە دەچێتە بەهەشـــت • سەر ەگوریسێکی بەدەستە عاسمان‌و ڕێسمانە •

٩ ــ گیانی نوکتەبازی‌و گاڵتەو گەپ‌و پێکەنین‌و مەشرەبخۆشی یا تەوس‌و تەشەر لە زۆر ئیدیۆم‌و خوازەو لێکچواندنی فۆلکلۆری کوردیدا خۆی نیشان دەدات ، وەك : کەوڵە کۆنە • ڕێوی گەزیزان

خواردووه • له گوێی گادا نوستووه دەڵێی گەنەی گوێ گایە• پوول بە قنگ هەڵدەگرێت •

گوێ تەپە • گونی مێش دەخەسێنێت • حەپۆل مێشخۆرە • گوو ناکات نەك برسی بێت • بۆ پوولێك سەگ ڕاودەنێت • گەلێکی تری لـەم بابەتـە •

١٠ ــ گەلێك ناوی ئافرەت یا پیاو یا هـی ئـاژەڵو ماڵاتو زیندەوەری تر کراوە بە نموونەو بۆتە ئیدیۆم ، یان بۆ لێکچواندنو خوازە بەکار هێنراوە ، لەبەر سیفەتێك ، گردگارێك ، کە پێـــوەی دەرکەوتووە وەك • دەڵێی فاتە کوڕانییە • مچەی حەبێ کشمیشە • حەمە قەدۆی مووسڵە • دیوەخانی ئەلیاسە فڕەیە ماڵی میران بەگی جافە کوڕی عەنە تڕپاشایە • سەگی کونەماسی یەو پاسی چڕتـاوا دەکات • گازلی ئەحمەد عەربەتییە •

١١ ــ کورد کەلـکی زۆری لە هەموو زیندەوەرێك وەرگرتووە، ماڵی بووبن یان نەبووبن ، یا بگرە هەر ناویشی بیستبنو ناسیبن ، بۆ بەراوردکردنو لێچواندنی مرۆڤێك بەو زیندەوەرە ، بۆ سیفەتێکی باش یان خراپی ، یان جووڵانەوەو هەڵسو کەوتی کەسێك ، بـــۆ هەڵنانی ، یا شکاندنو سووك کردنی ئەو کەسە ، یان هـەر بـــۆ دەربڕینی سیفەتێکیو هیچی تر • هەروەها کەلـکی لە هەمـــوو ئەندامێکی ئەو زیندەوەرانە بۆ ئەم مەبەستە دیوە ، لە ناو ئـــەو زیندەوەرانەشدا ناوی سەگ ، گورگ ، کەر ، ڕێوی ، زۆر دێنـە بەرچاو بۆ ئەو لێکچواندنە ، وشەی ( وەك ) یان ( دەڵێی ) بەکـار هێنراوە ، بەڵام بەشی هەرە زۆری ئەو لێکچواندنانە لێکچواندنـی

بالآیە کە لەگەڵ لێکچواندنی سادەدا جیاوازییەکی گەورەی هەیــە ، چونکە ئەم شێوە ئیدیۆمە ، رەگی لەسەر زەمینەیەکی مێژوویی پتەو دارشتووەو مانا قووڵەو پێویستی بە لێکدانەوەو بە دوادا گەڕانێکی زۆری هەیە ، تا تێی بگەیت • ئەمە لێکچواندنی ئیدیۆمییە • ئەمە هەندێك لەوانەیە کە ( وەك ) یان دەڵێی بۆ بەکار هێنراوەو لێکچواندنی سادەیە : دەڵێی شێرە وەك ماسییە • وەك گورگە • دەڵێی بڕەتۆکە • دەڵێی بەرازە جاری واش هەیە کە ئەو ئامرازی لێکچواندنەش فڕێ دەدرێت وەك : گای قەشەیە • کەرەکەی عوزێر پێغەمبەرە مارەکەی شێخ هۆمەرە • گوێ درێژێکە بۆ خۆی •

نموونە بۆ بەکارهێنانی ئەندامی زیندەوەر وەك : کلکی لە کولە کەمترە • کلکی خۆی دەکورۆژێت • گاپێ یە کلکە لەقێیەتــــی • دەڵێی حوشتری مل درێژە • لەگەڵ کلکی خۆیدا شەڕ دەکات •

١٢ ــ زۆر ناوی کەس یا شوێن بە ئیدیۆم و خوازەو لێکچواندن ئەمری بۆ خۆی پچڕیوە ، وەك : دەڵێی گاکەی حەســــەن تمـزە تانجییەکەی ئەحمەدی عەزیز ئاغایە • دەڵێــی گاکــــەی ئەحمــەد عەربەتییە • مارەکەی شێخ هۆمەرە • کەڵەشێری بلقاسمە رێوییەکەی قامچوغەیە • سەگی کونە ماسییەو پاسی جڕتاوا دەکات • دەڵێــــی سەگی هەوشارە • دەڵێی بەکر مەرگەوەڕە • بزنی دێلێژەیە • دەڵێــی توونی بابایە • رەنجی فەرهادی داوە • خوێنی سیــا وەحشـــــــە وگەلێکی تریش لەم شێوەیە •

## ئـ

ئابڕوو ــ ئابڕووی چوو :ــ

ئابڕوو = ئاوی ڕوو = سووریو جوانیی ڕووه ، که نیشانهی سهربهرزیو پاکی‌یه ، که چـوو ڕوو زهرد ههڵدهگهڕێت ، ئاشکرایشـه پیـاو له شهرمـــهزاریو سهرشۆڕیدا زهرد یا سپی دهبێت • واتا : سووك بوو ، ڕسواو سهرشۆڕی ناو کۆمهڵ بوو •

ئاخـــر ــ ئاخر خێـر :ــ

١ ــ نزاو دۆعای چاکهیه بۆ یهکێك که وابێت

٢ ــ به پیرێك دهوترێت کهچاکهی لێ بووهشێتهوهو لهوه دوور بێت که خراپهی بۆ کهس ههبێت • دهووترێت ئاخر خێـر بێـت •

ئاخـر شهڕ :ــ

نزاو دۆعای خراپهیه بۆ یهکێك ٢ ــ به پیرێـــك دهوترێت که خراپهی لێ بووهشێتهوه • چ به زمان چ به کردهوه ــ دهوترێت ئاخر شهڕ بێت •

ئاخـوڕ ــ ئاخوڕی بهرزه :ــ

( به یهکێك دهوترێت که لووتبهرزو بهفیز بێت )

ئاخوڕی خوارە :ــ

( بە کارێکی چەوتو چەواشە دەوترێــت )

ئاخــوڕ ــ ئاخوڕی چەورە :ــ

( بە یەکێك دەوترێت کە ساماندارو سایە چەور بێت)

ــ ئاخوڕی خۆی لێ تێکچووە ــ گۆڕاوە :ــ

واتا : لە خۆی گۆڕاوەو بایی بووە •

ئاخۆران ــ ئاخۆرانو باخۆرانە ــ بخۆرانە :ــ

بە ڕۆژو سەردەمێك دەوترێت کە دامو دەسگاکەی هیچی بەسەر هیچەوە نەبێت ، پشێوی تێدا بێت • زۆرو ستەم لە ئەندازە بەدەربێــت •

ئــارد ــ ئارداوێژی خۆشە :ــ

( دراوی قسەی خۆشە ) • قسەی بە دەم خۆشە •

ئــارەق ــ ئارەقی کردەوە : ــ

١ ــ شەرمەزار بوو • تەریق بووەوە

٢ ــ سەرنەکەوت •

ــ ئارەقی پێ کردەوە :ــ

١ ــ شەرمەزاری کرد ٢ ــ تەریقی کردەوە ٣ ــ ترساندی

ــ ئارەقی ڕەشو شینی کردەوە :ــ

١ ــ زۆر ماندوو بوو ٢ ــ زۆر شەرمەزار بوو •

ئـاروو ـ ئارووی بڕکێکن ـ مێرووی کوتێکن :ـ
( واتا لە ڕەچەڵەکێکن ) •

ئـاری ـ ئاری کەچەڵە = مانگ ئەوەجەی بە ئەموست نییە :ـ
واتا : ١ ـ کارەکە وایە ، خوارە ٢ ـ فیسارەکەس خراپەو پێویست ناکات دووپاتی بکرێتەوە ، ئاشکرایە •

ئـــازا ـ ئازا گۆو ئازا مەیدان :ـ
واتا هەی لە گوتندا ئازا ئەوە مەیدان • بۆ هاندانی یەکێك دەوترێت کە هەربە قسە تەواو بێتو لە کردگاردا سست بێت •

ئاســـار ـ ئاساری لە سەر پاداری نەماوە :ـ
١ ـ لە ناوچووە ٢ ـ شیرازەی تێکچووە ، هیچ شتێکی لە جێی خۆیدا نەماوە •

ئاسانـە ـ ئاسانەی سووکە :ـ
بە ئافرەتێك دەوترێت کە بە ئاسانی مندالی ببێت ـ لێی بێتەوە •

ـ ئاسانەی گرانە :ـ

بە ئافرەتێك دەلێن کە بە گرانو درەنگ مندالی ببێت ـ لێی بێتەوە •

ئاســـمان ـ ئاسمان ئەستوونی دەوێت :ـ
بۆ سەر سوڕمان دەوترێت • واتا : قسەیەك یا کارێکـە

زۆر ستەمە ، پیاو سەرسام دەبێت چۆن کراوە ، یان دەکرێت !!؟

ئاسمان ـ ئاسمان دوورو زەوی سەخت :ـ
( یەکێك دەیلێت کە لە تەنگانەدا بێتو دەستی بە کەسدا نەگات ) دڵ پڕ لە داخو خەفەت فریاکەری نەبێت ، خۆیشی چارەی تەنگانەکە ـ هەڵویستەکەی پێ نەکرێت .

— ئاسمانی لە بەر چاو تاریك بوو :ـ
١ ـ پەستو توورە بوو ٢ ـ نائومێدی گرتیو سەری دنیای لێ هاتەوەیەك .

— ئاسمان لێفە بێت دای ناپۆشێت :ـ
پاشلی هێندە پیسە ئابڕووی چووە . بەد ناوبووەو ناوی زڕاوە .

— ئاسمانو ڕیسمانە :ـ

ڕیسمان = پەت = گوریس بۆ بەراوردکردنی دوو شتە کە هەر ناگەن بە یەك ، وەك چۆن گوریس نییە بگاتە ئاسمان . وەڵامێك پەیوەندی بە پرسیارێکەوە نەبێت . حاڵی دوو شتی جیاوازو دوور لە یەك .

ئاسن ـ ئاسنی سارد دەکوتێت :ـ
کارەکەی بێ ئەنجامەو بێهوودە خۆی ماندوو دەکات .

ئاش ـ ئاشی نەزانە ـ ئاشی نەزان خوا دەیگێڕێت :
بە یەکێك دەڵێن کە کارەکەی بۆ جێبەجێ بێت ، لەگەڵ ئەوەدا کە نەزانکردو نەشارەزایە .

— ئــاش بەبا دەگێڕێت :ــ

( بە یەکێکی بێباك دەوترێت کە کارەکەی بێ خاوەن
مابێتەوە پێك نەیەت ) • بۆ تەشەرە •

— ئاشـــی ناگەڕێت :ــ

کاری وەستاوە ــ پەکی کەوتووە •

— ئاشبگیریان کرد :
تالآنیان کرد • مالیان وێران کرد •
ئاشبگیر = لەناکاودا تاقمێك چەك بەدەست هەلدەکوتنـــە
سەر ئاشێك ــ ئاشی ئاو ــ هەرچی ئاردو دانێکی تێـــدا
دەبێت دەیبەن ، ئەوە ئاشبگیرە •

— ئاشی بــۆ ناوەتەوە :ــ
دەلێن : ئاشێکی بۆ ناوینەتەوە هەرچی دەکەیـــن
رزگاریمان نایەت • واتا : گێرەو کێشـــەیەکی بـــۆ ساز
کردووین ، پیلانێکی ئەوتۆی بۆ ناوینەتەوە گرفتـــاری
کردوویـــن •

— ئاشو ماش ــ ئاشتو ماشت :ــ
قسە لە یەکتر دابڕینی منـــدالآنە • دەلێـــت : بڕو ئاشو
ماش واتا : ئیتر ناتدوێنـــم •

— ئاشبەتالی لێ کـــرد :ــ
ئاشبەتال = هاوارێکە ئاشەوان دەیکات ئەگـــەر
ئاوایی نزیك ئاشەکە بێت لەسەر بانی ئاشەکـــەوە

هاواردەکات ، خۆ ئەگەر دوور بێت ، دەچێتە ناو ئاوایی‌و هاوار دەکات کە ئاشەکە بێ‌دانە ، تا باراشی بۆ بهێنن •
واتا : وازی لە کارەکەی هێناو دەستی لێ هەلگرت‌و بەنیوەو نیوەچڵ بەجێی هێشت •

ئاش لە خەیالێك‌و ئاشەوان لە خەیالێك :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە باسی شتێك بکات دووریێت لەوەی ئەوی تر مەبەستی بێت‌و قسەی لێ بکات •

ئاشێك لە میزن بوو هەر دەمیزێت :ـ
ئاشەکە دەمیزێت = ( کونی بەرداشی ژێرەوە کراوەتەوەو دانەکەی پێدا دەچێتە خوارەوە ) یان ئاوی ئاشەکە تێکەڵ بە دانەکە دەبێت • واتا : کارێك کە روو لە خراپە بوو ، ئەنجامەکەی هەر خراپ دەردەچێت

ئاشتی ــ ئاشتیی کتك‌و مشکە :ـ
کتك = پشیلە • واتا : ئاشتی لە نێوانیاندا سەر ناگرێت چونکە ئاشتیی زۆردارو زەبوونە •

ئاشقە ــ ئاشقەو ماشقەن :ـ
ئاشقە = عاشق • ماشقە = معشوق بە دوان دەڵێن کە مۆگری یەك بن‌و هەمیشە پێکەوە بن • نێرو مێی مار کاتی جووت‌گرتنیان پێیان دەڵێن ئاشقەو ماشقە •

ئاشنا ــ ئاشناو رۆشنا :ـ
ئاشنا = ناسیاو • رۆشنا = دۆست
دەڵێن : هەزار ئاشناو رۆشنای هەیە •

- ئاشنایەتیم لەگەڵ ــ ئەو خواردنەدا ــ نییە :ــ
واتا حەزی لێ ناکــەم •

ئاشــوو ــ ئاشــوو پاشوو ــ ئاشەو پاشــە :ــ
( قسەی شرم برم ) • قسەیەك هیچی بەسەر هیچەوە نەبێت

ئـاگـا ــ ئاگای لە مەحمودی بێزەواد نییــە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە ئاگاداری کارێك نەبێتو هیچی لــێ نەزانێــت •

ئـاگـر ــ ئاگــر خۆش دەکات :ــ
هانە هانە دەداتو ئاشووبەکە گەرمتر دەکات • بۆ شــەر تیژی دەکات • گۆبەند دەگێرێت •

ئـاگر ــ ئاگر لە کای کۆن بەرنەبێت :ــ
( بە کۆنە ئاشقێك ، یا خەفەتبارێك دەوترێــــت کــــە دلدارییەکەی یان خەفەتەکەی تازە بێتەوە ) •

- ئاگــری گرتووە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە ١ ــ زۆر بزوێت ٢ ــ ســزای خەڵك بداتو بەدی بکات •

- ئاگر دەکاتەوە ــ ئاگری لێ دەبارێت ــ ئاگر لە چــاوی دەبارێت ــ دەبێتەوە :ــ
زۆر توورەیە ، رقی هەستاوە ــ لە قینا چــاوی ســوور هەڵگەڕاوە •

— ئاگری تێ بەربووە ـ تێچووە ـ تێ کەوتووە :ـ
١ ـ سرەوتی لەبەر براوە ، هەر پەلەقاژێیەتی شتێك دژی یەکێك بکات ٢ ـ هاروهاجە ، بە کەسێك ، بە منداڵێك دەوترێت بەمو بەودا بپلۆسێتو زیان ببەخشێت .

— ئاگری بۆی تێ بەربووە :ـ
دلی بۆی دەسووتێت . بەزەیی پێدا دێتەوە ـ سرەوتی بۆی لەبەر براوە .

ئـاگـر ـ ئاگـر کەوتە مالی :ـ

پشـێوی کەوتە مـالی

— ئاگرەکـەی کوژاندەوە :ـ
ئاژاوەکە ، شەرەکەی براندەوەو دامرکاندەوە .

— ئاگـر بارانە :ـ
١ ـ شەڕو تەقەو فەرتەنەیە ٢ ـ هەوا زۆر گەرمە

— ئاگـربڕ دەکات :ـ
کاتێـك پاوەنێك ، یا دارستانێك ، ئاگر دەگرێت بۆ ئەوەی ئاگرەکە نەتەنێتەوە ، بە دەوری ئاگرەکەدا خەنەق بە پانایەکی وا هەڵدەکەنن کە ئاگرەکە نەتوانێت بپەڕێتە ئەو بەریەوە ، ئەوە ئاگربڕ کردنە . واتا نەگبیری ئـەوە دەکات کە ئەو قەوماوە ، ئەو قسەیەی کە لە کایەدایـە ئەو نەگرێتەوە .

— ئاگری پێوەنێت بوکورۆوز ـ بۆسۆ ـ بۆچڕووك ـی لی هەڵناسێـت :ـ
واتا : زۆر ڕووتو ڕەجاڵە ـ هەژارە .

ئاگری لە ماڵی بەردا :ــ

١ ــ ماڵ وێرانی کرد • تووشی زیانێکی زۆری کرد

٢ ــ ئاژاوەی خستە ناو خێزانەکەیەوە •

ــگــر ــ ئاگــری تــێ بەردا :

١ ــ بەزەیی جووڵاند ٢ ــ هەستیجووڵانــــــد

٣ ــ حەزی جووڵاند ٤ ــ رقی هەستاند ٥ ــ هانیدا •

ئاگــریــان دا :

١ ــ بە فیشاڵو قسە کابرایان لە مەیدان دەرکــردو

قسەی پێ نەکرا ٢ ــ تێزیان کردو هانیان دا •

ئاگــرو دووی بڕێــت :ــ

ماڵەکەی وێران بێت ، نەئاگری تێدا بکرێتەوەو نەدۆیشی

هەبێــت •

ئاگری لە دەمدایە :ــ

١ ــ دەم هەراشە ٢ ــ بێشەرم و ئابڕووە •

ئاگــری قوورەتە :ــ

قــوورەت = قــدرە •

١ ــ هاروو هاجە ٢ ــ ئاشوبگێڕە ٣ ــ زۆر بەتوانــاو

لێهاتووە •

ئاگــرە ســووری لە خۆم دووری :ــ

واتا : خۆم بێوەی بم ، چ کارم بەسەر ئەمو ئەوەوەیە •

ـ ئاگری بن کایە :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە بەنهێنی ئاشووب بگێڕێت • زیان بە خەڵك بگەیەنێت ، خەڵك بەگژ یەکدا بکات • ئاگرێك لە بن کادا بێت کەس پێی نازانێت ، دزە بۆ هەموو لایەك دەکاتو کاکەش دادەمرێنێتەوە •

ئاگر ـ ئاگرو بایان نەوتووە :ـ
بە دوو کەس دەوترێت کە سروشتیان دژی یەك بێتو پێکەوە هەڵنەکەن ، نەگونجێن •

ـ ئاگر لە سەفینو مەنجەڵی ئاو لێرە :ـ
( بە کارێك دەوترێت کە بە هیچ جۆرێك نەکرێت )

ئاڵ ـ ئاڵ ـ دایکی ئاڵ ـ بردیەوە :ـ
مردنی زەیستانە لە ئەنجامی منداڵ بووندا :ـ
دایکی ئاڵ = ( ئاڵ ژنێکی جنۆیە ـ ئەفسانەیە ـ دوژمنی ئەو ژنەیە کە منداڵی دەبێت • لە کاتی منداڵ بووندا خۆی دەگەیەنێتە منداڵدانی ئافرەتە زەیستانەکەو دەست بە چڕنووك گرتن لە منداڵدانی ئافرەتە زەیستانەکە دەکات ، وردە وردە پارچە پارچەی دەکات • ئەگەر خوێنی زۆر لەبەر ڕۆیشت دەڵێن دایکی ئاڵ چۆتە منداڵدانیەوە • خۆ ئەگەر بەو خوێن لەبەر ڕۆیشتنە مرد . دەڵێن ئاڵ بردیەوە ) •

ـ ئاڵو گۆڕ :ـ
گۆڕینەوەو گوێزانەوە

ـ ئـالو بـۆل :ـ
واتـا : دەنکەکانی گەورە بووەو بۆل بۆلەیشی ئـــال
بـووە • واتا : نیوەگەییو بـووە •

ئـــال ـ ئـالو والآ :ـ
رەنگیـــن • دەلێن بەرگی ئالو والآیان لەبـــــەر
کـردووە •

ئـــالآ ـ ئـالآ ـ بەیداخ ـی بۆ هەلکرد :ـ
ئابـڕوو ناموسی برد ، ناوی زڕاند • بەدناوی کرد •

ئـالۆز ـ ئالۆزە • مندالەکە ـ پیاوەکە ـ ئالۆزە :ـ
تووڕەو کەم چیکلدانە • لەگەل کەسدا ناگونجێت •

ئالیـاوا ـ ئالیاوا لە قنگیەوە دیـارە :ـ
١ ـ هەژارو نەدارایە ٢ ـ کەمو کوورِی زۆرە

ئـامـان ـ ئامانی ـ نیە ـ بۆ نیە :ـ
١ ـ ناپاکە ، پشتی پێ نابەسترێت ٢ ـ وەزندی زۆرە •
٣ ـ جەربەزەیە •

ئـــــاو ـ ئـاو لە دلی دەروات ـ دەتکێت :ـ
واتا : زۆری برسی‌یە
ـ ئـاو لە بێژنگ ـ سەبەتە ـ دەکات :ـ
( رەنجی بێهوودە دەدات )

ئـــــاو ــ ئـاو بێنەو دەست بشــۆ :ــ

کار تەواو بووە • ( بەشتێك دەوترێت کە هیچی نەمابێت)

ــ ئـاو بە شوێنی لێژەوە ناوەستێت :ــ

( بەیەکێك دەوترێت کە دەستبڵاو بێت ، پـارە بـــە دەستیەوە نەمێنێت )

ــ ئـاو بە ئاگـردا کـرا :ــ

١ ــ ئاژاوەکە کوژایەوە ٢ ــ گوڕو کفەکـــــەی دامردەوە ٣ ــ رقەکەی نیشتەوە •

ــ ئـاو لە دنگدا دەکوتێت :ــ

دنــگ = دۆلی دارە •

واتا : رەنجەکەی بێهوودەیەو کارەکەی بێکەلکەو لـــە ژێرییەوە نییە •

ــ ئـاو لە دەستی ناتکێت :ــ

زۆررژدو چرووکـە

ــ ئـاو لە سەرچاوەوە لێلە :ــ

( بەشتێك ــ بەکارێك ــ دەوترێت کە هەر لەسەرەتایەوە ــ لەبنچینەوە ــ باش نەبێت ــ بە خواری بێت )

ــ ئاو لەســەر زولفی دەتکێت :ــ

زۆر گەنجو جوانە •

ئـــــاو ــ ئاوی کردە ژێــری :ــ

جێی پێ لێژکرد ، دەری چەپاند •

- ئاوێکی خراپی رشتووه ــ رەنگێکی خراپی رشتووه :ــ
کارێکی خراپی کردووەو ئێستە چاوی لێ دەکەن ، کراوه
بە باو • دامو دەستوورێکی خراپی داخستووه •

- ئــاوی ئاموونو توونی بابا چێت :ــ
ئاوی ئاموون : ( چەمێکە لە ئاسیای ناوەندا بە قــەراغ
شاری خوارەزمدا دەڕوات ، لە نێوان تورکستــــانو
خۆراساندایە ) توونی بابا : ( دۆڵو دەرەیەکی زۆر دوورو
درێژو بە پێچو پلووچە لەولا دەربەندی خانەوەیە )
واتا = بڕواو نەیەتەوە • چوونی هەبێتو هاتنــــــەوەی
نەبێــت •

- ئاوی لە ئاوەڕۆ کــردووه :ــ
( لە ئەندازە بەدەر خراپە دەکات ) •

- ئــاو لە ئاوەڕۆ بــڕاوه :ــ
( سەرچاوەی خێر ــ قازانج ــ سوود کوێر بۆتەوه )

- ئاوی لەبەر هەڵنیشتووه :ــ
١ ــ ئارەقی زۆری کردۆتەوه ٢ ــ منداڵەکە میـــزی
بەخۆیدا کردووه •

ئــبــاو ــ ئاوی لە جێ ماڵەکەی کرد ــ ئاوی لە ماڵەکەی بەردا :ــ
١ ــ ماڵی وێران کرد ٢ ــ تووشی گاشەیەکی گــەورەی
کــــرد •

- ئاوی لێ ناخواتەوه ــ ئاو لەو کارە ناخواتەوه :ــ
خۆ لە کردنی ئەو کارە ناگێڕێتەوه ، ناپارێزێت ٢ ــ دەست
لە بردنی ئەو شتە ناگێڕێتەوه •

ئــاوو ئــاو چێت :ـ
تووشی گاشەیەك بێت رزگاریی لە دوا نەبێـــت ،
هەر وەكو ئاو بچێتو ونبێت •

ئــاوی بێلغاوی خواردۆتەوە :ـ
١ ـ چەرداوەڕووە ٢ ـ سڵ لە كەسو لە هیچ ناكاتەوەو
كار بە ئارەزووی خۆی دەكات •

ئاوی چاوی خۆی دەدات :ـ
چاوی خۆی روون دەكاتەوە بە تەماشاكردنی شتی جوان
ـ ئافرەت ، دیمەن ••• هتـــــد

ئاوی چـــاوی ســـەند :ـ
ترساندی ، تۆقاندی ، ترسی نایەبەر •

ئــاوی حەیاتە :ـ
( ئاوێكی ئەفسانەیە ، گوایا هەركەسێـــك لێــی
بخواتەوە نەمردەبێت ، وا باوە كە خدری زیندە لەو ئاوەی
خواردۆتەوە )

ئـــــاو ـ ئاوی پێی داهات :ـ
زۆر بە پێوە وەستاوەو پێی ماندوو بووە •

ئــاوو گڵ هەڵی گــرت :ـ
مەرگ لەو شوێنەدا بۆی هاتو ئاكامی هات • ئاوو
گڵــی ئەو شوێنەی بە نسیب بوو •

- ئـاوه چۆرەی هێنایەوه :ــ
( هەموو شتێکی لێ چووه قات ) •

- ئـاو بەژێر کادا دەبات :ــ
بە نهێنی کاردەکات ، پیلان دەگێڕێت •

- ئاوی رووی تکاوه :ــ
شـەرم‌و شکۆی نەماوه •

- ئاوی ژێر کاسەیە :ــ
بێ‌کەڵکـە •

- ئاوی وا بە جۆگەوه ــ بێڵەوه :ــ
١ ــ کاری باش بۆ ڕایی دەبێت ٢ ــ دارایە •

- ئـاو ڕژاوه گرد نابێتەوه :ــ
کارلـەکارترازاوه •

- ئاوەڕەشـی هێنایـەوه :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە سەری دنیای لێ هاتبێتەوه یــەك ، هەواڵی ناخۆشی‌ی دنیا بە هەموو لایەك بگەیەنێت •

- ئـاو بە ئاوه دانیدادەچێت :ــ
بە کەسێك دەڵێن ئاو زۆر بخواتەوه • واتا : گەدەی پڕەو‌تێـره بۆیە هێنده ئاو دەخواتەوه •

ئـــاو ــ ئاوی گوێچکەی دا :ــ
ئامۆژگاری کرد • تەگبیری کارەکەی بۆ کرد لـە کارەکە ئاگاداری کـرد •

ـ ئـاوی ڕاوەستاوە :ـ
به کەسـێك دەڵێن کە هیچ نەگۆڕێـــتو پێش نەکەوێت • واتا : وەك ئاوی ڕاوەستاو بۆگەنی کردووە •

ئـــاوڕ ـ ئاوڕ لە کەس ناداتەوە :ـ
١ ـ لە خۆی گۆڕاوە ، بایی بووە ٢ ـ دەستـی کەس ناگرێت ، یارمەتی کەس نادات •

ئاوسـاو ـ ئاوساوە : ـ
لە داخو خەفەتدا وەڕسو بێزارە • پەستە •

ئاوێنـه ـ ئاوێنە بە دەمیەوە دەگرن ـ ئاوێنە دەگرنە رووی :ـ
( بە یەکێك دەوترێت نەخۆش بێتو زۆر کەشەنگ بێت ـ ئاوێنەکە بۆ ئەوەیە ـ تا بزانن هەناسەی تێدا ماوە ؟ )

ئایشـێ ـ ئایشێ کوێدرێژ :ـ
بە کەر دەڵێن وەك شتێکی خەیاڵیش منداڵـیان پـێ ترساندووە •

ئایـن ـ ئایینو ئۆینی زۆر لە ژوور سەردایە ـ ئایینو ئۆینبازە :ـ
١ ـ مرۆڤێکی فێڵبازو ناڕاستو بە پێنچو پەنایە ٢ ـ پشتی پێ نابەسترێت •

ئەراگیـل ـ ئەراگیـلە :ـ
( ئەرا = هەرا « لە ئاوێستادا » = کێو • گیل = گەڕان • واتـا وێڵی کێوو چۆڵو بیابانە ) •

ئـەرێ ــ ئەرێو نەرێیەتی :ـ
ئەرێ = ئـا • نەرێ = نـا
واتا : ڕاڕایەو دوودڵـە •
دەڵێن : ئەم ئەرێو نەرێیەت لە چییە کارەکـــەت زوو ڕاپەڕێنە •

ئەژدیها ــ ئەژدیها ــ هەژدیها ــ یەکە بۆ خۆی ــ هەژدیهای حـەوت سەرە : هەژدیها = مارێکە لە ئەفسانەی کـوردا ، زۆر گەورەیـە ، ئاگر لـە دەمی دێتـە دەرێ ، شـاخدارە ، تووکنە ، چاوی وەکو ئاگر دادەگیرســـێت • واتا : مرۆڤێکی زۆر بەوەزندە ، لە خراپەکردندا زۆر بەتوانایە •

ئەژنـۆ ــ ئەژنۆی دادا ــ چۆکی دادا :ـ
١ ــ بەزی ٢ ــ تێشکاو ژێرکەوت ٣ ــ بە سەریـــدا زاڵبوون •

ئەســپ ــ ئەسپی باو بۆرانـە :ـ
تیـژ ڕەوە

ئەســپێ ــ ئەسپێ دەکوژن لە دەوری لە باتی کولێرە چەوری :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە زۆر لات بێت ) •
ئەســپێ لە باخەلیدا سەوزەلەگیانم دەلێت :ـ
واتا : زۆر لاتو هەژارە •

ئەســتۆ ــ ئەستۆی خوارە ــ کەچە ــ لارەملە :ـ
١ ــ مەلوولوخەفەتبارە ٢ ــ ناتەواوو بار کەوتووە ، سا لە روو یمادییەوە بێت یان معنوی ٣ ــ بێکەسە ٤ ــ تەنێ نادروستە •

ئەستۆی ــ ملی ــ شکاند :ــ
١ ـ ... تەنەکە بە رقەوە بە یەکێك دەوترێت کە حەز لــە چارەی نەکرێت • واتا : باش بوو رۆیشت ، لە ناو چوو ٢ ــ لە ناوی برد و فەوتاندی ٣ ــ تووشی گاشەیەکی ، چورتومێکی گەورەی کرد ٤ ــ هەڵی داو لە خشــــتەی بـــــرد •

ئەستووران ــ ئەستووران دەڕێسێت :ــ
واتا : قسەی ناپوختو بێ جێو ڕێ دەکاتو دەڵێت •

ئەســتێ ــ ئەستێو پووشوون ــ ئاگرو پووشوون :ــ
ناتەبان • ناکۆکن • هەر گەیشتنە یەك بەگژ یەکدا دەچن •

ئەستێرە ــ ئەستێرەی لە ئاسماندا نەماوە :ــ
١ ــ ناهومێدە ٢ ــ بێکەسە ٣ ــ بــەد بەخــتو چـــارە ڕەشــە •

ئەگــەر ــ ئەگەر مەڕم نەدیوە لە هۆزێ ، پشقلم دیوە لە پەرێزێ :
واتا : شتم بەخۆمەوە دیوەو ئەم شتە هیچو پووچانە دەبینم گاڵتــەم بەدنیا دێــت •

ئەگــەر ــ ئەگەر دەستی بڕوات پیاو لە پشتەوە سەر دەبڕێت :ــ
١ ــ بێویژدانە ٢ ــ زەلامێکی خۆ پەرستە ، لە پێنــاوی کەڵکی خۆیدا کــۆ لە خراپە ناکاتەوە •
ئەگەر کاوێژی بکردایە ، گۆشتی بۆ خواردن دەشیا :ــ
١ ــ گەمژەو گێژە ٢ ــ ساویلکەو بێلێکدانەوەیــــــە ٣ ــ بێدرکو بوودەلەیــە •

ئەلـــف ـ ئەلف لەیلە دەخوێنێتەوە :ـ
واتا : درێژە بەقسە دەداتو هەر نایبڕێتەوە •

ئەلقـە ـ ئەلقـە لەگوێ یە :ـ
نۆکەرێکی گوێ ڕایەڵە ، وەك کۆیلە مل شۆڕەو چی پێ بڵێن بێبیرکردنەوە دەیکات •

ئـــەم ـ ئەم هەویرە ئـاو زۆر دەکێشێت :ـ
١ ـ ( بە قسەیەك دەوترێت کە مانای زۆر بێت ) ٢ ـ بـە کارێـك دەوترێــت کە لکـی زۆر لێ بێتەوەو گۆلمەزو سەریەشەی بە دواوە بێـت •

ئـەم دیوو ئەو دیوی کـرد :ـ
١ ـ لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر هاتوچۆی کرد ٢ ـ لێـی کۆلییەوە ٣ ـ سەرنجی لێ گرت ، لێی ورد بۆوە •

ئـــەم ـ ئەم قەوانە هەر نەبڕایە !!؟ قەوانە !!؟
بۆ بێزاری دەوترێت ، کاتێك دەوترێت کە قسەیەك ، باسێك هەر بکرێتو بکرێتەوە •

ئەم ترەکەڵەکێیە هەر سەرناگرێت = وشکە کەڵەکە :ـ
واتا : ڕەنجی بێهوودە دەدەنو کارەکەیان بەبێ ئەنجامە ، چونکە کارێکە بنچینەکەی پتەو نییە ، وەك خانوویەکـــی وشکە کەڵەك وەستایانە دانەمەزرابێتو بێلێکۆڵینـەوەو بەکار هێنانی کەرەسەی پێویست •

- ئەم كاسەیە بێ ژێركاسە نییە :ـ
١ ـ ئەم‌كارە نهێنییەكی تێدایەو لە ئێمەی دەشارنەوە
٢ ـ ئەم كارە بێ بنج‌و بناوان نییە •

- ئەم كەرە لەو قوڕاوە دەربهێنە = دەومرە ئەم كەرە لەو

قوڕاوە دەربهێنە :ـ
بەداخەوە یان تەوسەوە لە هەڵوێستێكدا دەوترێت كە
یەكێك تووشی هەڵوێستێكی نالەبار بوویێت ، دەستەوسان
بەدەستیەوە دۆش داماییێت •

- ئەم نانە بەو ڕۆنە :
واتا : دەستی ناگاتە ئەوەی ئاواتی بۆ دەخوازێت‌و هەر
دوور بەدوور دەبێت ئاخی بۆ هەڵبكێشێت •

ئەمە ـ ئەمەیە یەكساڵە دوو ساڵە دەخەڵەتێنێت :ـ
لە هەڵوێستێكدا دەوترێت كە یەكێك بیەوێت یەكێكی تر
لە خۆی گەورەتر ، یا زۆرزاتر ، بەدەسەڵاتتر ، لە خشتە
بەرێت یان بەسەریدا زاڵ‌بێت •

- ئەمە خوێی چێشتە :ـ
واتا : هێشتا ئەمە كەمە • لەمە زۆر خراپتری
بەسەردێت •

ئەمرت ئەمری ـ عومری ـ خوای بەجێ هێنا :ـ
واتا : مرد

ئەمــڕۆ ــ ئەمڕۆ بەسبەیم پێ مەکە :ــ
مەم خاێنەو دەستی دەستیم پێ مەکە •

ئەمــــلا ــ ئەمــلا دەکەم ئاو دەمیاتو ئەولا دەکەم گـــــورگ دەمخــوات :ــ
( یەکێك دەیلێت کە لە ناوەند دوو بەڵای گەورەدا بێت )
بە دەست رۆژگارەوە دامابێت •

ئەموست ــ ئەموستە چاو ئەنگوستە چاو :ــ
زۆر تاریکەو چاو چاو تابینێت • ئەموسـت بە چـــاودا دەچێت دەڵێن : شەوێك بوو تاریك ئەموستەچاو •

ئـــەو ــ ئەو رۆنە ــ سیرە ــ لە سمێلی من مەدە ــ مەسوو :ــ
واتا : ئەو کەڵەکە لە من مەدە ، من بە تۆ لە خشتە نابرێم •

ئـــەو ــ ئەو سەرە سەری خۆی نییە :ــ
بە یەکێکی چەتوونی زۆر سەرچڵ دەڵێن کە کۆ لە هیــچ نەکات واتا : دوایی سەری خۆی بە فەتـــارەت دەداتو لەناو دەچێــت •

ئـــەو سوارو من پیـــادە :ــ
١ ــ کۆششەکەم بێسوودە نایگەمێ ٢ ــ حەقەکـــەم ــ قەرزەکەم ــ بۆ لێ ناسەندرێتەوە • بەسەد فێڵو سەد رێکا خۆی دەپەرێنێتەوە ، دەرباز دەکات •

ئەو سەرینە بخەرە ژوور سەرت = ئەو دەستە بنـــى
ژوورسەرت : بە تەوسەوە ، بە ڕقەوە دەوترێت واتا : دڵنیابەو
لێت سووربێت کە ئەوەی بۆی تەقەلا دەدەیت دەستگیرت
نابێتو نایگەیتێ •

ئـــەو ـ ئەو شوێنە پاك بێت خۆمی تێدا دادەنیشم :ـ
واتا : چیمە بەسەر ئەمو ئەوەوە ، دوورم لە هەموو کوڕێك
هەر خۆم پێوەی بـم •

- ئەو کاروانچیو من خانچـــی :ـ

واتـــا : هەموو ڕۆژێك میوانەو من خزمەتـــــــی
دەکـــەم •

ئـــەو ـ ئەو خورمایەی ـ مێوژەی ـ تۆ خواردووتە دەنکەکەی
لە گیرفانی مندایە : ( ئەو فڕوفێڵەی کە تۆ دەیکەیـــت ،
من لەو سەری دێمەوە )

- ئـــەو ترەی لە قنگتایە بیکەنە :ـ

چیت لە دەست دێت بیکە ، منەتت لێ نازانم ، لێت ناترسم

- ئـــەو کانییەی ئاوی لێ دەخۆیتەوە بەردی تێ مەهاوە :ـ
کەڵکت لە هەر شتێك ، کەسێك وەرگرت ، زیانی پـــێ
مەگەیەنە،سپڵە مەبە •

ئـــەوا ــ ئەوا تێرم‌خوارد ئێقم هاتەوە لا بێژن وەلالوّم بێ بمباتەوە:
بە تەوسەوە یەکێك دەڵێت کە چاوەڕێی خزمەتێکی زۆر بوو بێت کەچی لە بری خزمەت پشتی تێ بکرێت ، یـــان خراپەی دەرباره بکرێت ، یان قسەیەکی بەڕوودا بوترێت کەجێی دلشکستی بێت •

ئـــەوە ــ ئەوە ئاوی ساردو ئەوەش بەرەوژوورەی سەخت ــ کام

کەلە سەختە بیگرە :ــ

واتا : چیت لەدەست دێت بیکەو بە هیچت نازانم •

ئەوە ئەرزو ئەوە گەز :ــ

بۆ بەرەنگار بوونە ( تحدّی ) ، واتا : فەرموو وەرە پێشـــەوە کارەکەت بکە ، زۆرانو ململانێکەت بکـــە •

ئـــەوە ــ ئەوە خەوێك بوو دیتو نایبینیتەوە :ــ
( بە یەکێك دەوترێت کە خۆشییەکی دیبێتو لە دەستـــی چووبێت ) •

ئەوە گۆڕی بێـــت :ــ

واتا هەڵدەگرێت وای بەسەر بێت •

( به یه‌کێك ده‌وترێت که به‌لاساری کارێکی ناپه‌سند بکات له پاشان تووشی تۆڵه‌ی خۆی بێت ) .

ئه‌وه په‌ز ده‌مرێت جا ئه‌وه چییه ؟

په‌ز = مـه‌ڕ

گوایه کوردێکی کۆچه‌ر هه‌واڵێك ده‌بیسێت ، شپرزه‌یه‌ك دێته به‌ر چاوی ده‌پرسێت ئه‌وه چییه ؟ ده‌ڵێن فلآن پیاوه گه‌وره مردووه ، ئه‌ویش به ساردیو گاڵته پێکردنێکه‌وه ئه‌وه ده‌ڵێت . واتا : ناهێنێت وا خۆتان شپرزه کردووه .

- ئه‌وه ملی منو ئه‌وه‌ش چه‌قۆی تۆ :ـ

به یه‌کێك ده‌ڵێن که زویر بوو‌بێت . واتا چیـم لـێ ده‌که‌یت سه‌رم له ڕێته . جاری واش هه‌یه به ته‌وسه‌وه به یه‌کێك ده‌وترێت که له‌سه‌ر شتێکی هیچه لێت زویـــر بێت .

- ئه‌وه خه‌ته‌نه‌سوورانه ، زه‌ماوه‌ند ها له دواوه :ـ

واتا خۆشیی گه‌وره ، به دوای ئه‌م خۆشییه‌وه دێت .

ئه‌وه‌نـده ـ ئه‌وه‌نده‌ی بڵێی یه‌کو دوو :ـ

به‌خێراییه‌کی بێ ئه‌ندازه .

- ئه‌وه‌نده‌ی مست له چاوان ده‌ی :ـ

( به خێرایی )

ـ ئەوەندە شیرینە بە قوزلقورتەوە دەخورێت :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە ڕەوشتو کرداری هێندە جوان بێت شایستەی پیا هەڵدان بێت •

ـ ئەوەندە ساغە دەڵێی دارەکەی قەرەداخە :ـ
واتا : وەك دارەکەی قەرەداخ ساغە ، کە بە هۆی ساغییەوە تەمەنێکی زۆری هەیەو بۆتەمەن درێژی دەوترێت • دەڵێن : بە دارەکەی قەرەداخ بیت •

ـ ئەوەی لەژێر بەڕەدا بێت دەکەوێتە سەر بەڕە :ـ
واتا : شت ئاشکرا دەبێت ، درەنگو زوویی کەوتووە •

ئەوە یلەبەر چاوانە ، لەبەر دڵانە :ـ
واتا : خۆشەویستە •

ئەوی ـ ئەوی لە سووری دۆراندووە ، لە کایەی تۆی هەڵدەهێنێتەوە : واتا : ئەوەی لەپێشەوە لە دەستی چووە ، چاوەڕێ یە لە دواییدا تۆڵەی بکاتەوە ، وەك بلێین لە گەنجیدا خوا پەرستی نەکردبێت ، لە پیریدا بیەوێت بە گەرم تۆڵەی ئەوە بکاتەوەو نوێژ قایم بێت •

ئێختە ـ ئێختەیان کرد :ـ
١ ـ رامیان کرد ، هێنایانە ژێر بار ٢ ـ خەساندیان لە هەڕەو گیفو گوڕەیان خست •

ئێسك ـ ئێسكو پرووسك :ـ
ئێسك = ئێسقان • پرووسك = ئێسکی پوواوی

رزیـو • دەلێن : مردووەکە ئێسکو پرووسکی نەمـاوە

ئێسکی گرانە خوێنی تاڵە ــ رەزای قورسە ــ گرانە:ــ

واتا ناچێتە دلەوە ، ناشیرینە ۲، ــ حەز لە چارەی ناکرێت لەبەر کردگاری ناشیرینی دەبێزرێت •

ئێسکی سووکە ــ خوێنی شیرینە ــ رەزای سووکە :ــ

۱ ــ جوانە ۲ ــ دەچێتە دلەوە ، سا یا لەبەر شێـــوەی جوانی یا لەبەر رەفتاری شیرینی •

ئیـــلان ــ ئیلانو بیلان :ــ

ئیلان = الا • بیلان = باللە بۆ هەتـەریو لەسەر قسە سووربوونە • واتا : هەر دەبێت ببێت یـــان ئەو شتە ئەو کارە بکرێت •

ئینســـــان ــ ئینسان گایینە هەر لە پێستیکدا بێت :ــ

واتا : بەرەو باشی دەگۆرێتو دەڕوات ، لە هـــــــەر روویەکەوە بێت ، پێش دەکەوێتو چاکتر دەبێت •

ئێـــوارە ــ ئێوارە وەختە جرپن بە چەختە :ــ

بە تەوسەوە ( بە ئافرەتی تەمەڵ دەوترێت کە درەنـــگ کەوتبێتە خـــۆی ) •

# ب

بـــــا ـ با باوێــژ لە سکی خۆی دەرکات :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە توورە بوو بێتو بە قسەی هەڕەشــەو گورەشە بکــات •

با بێت شەن دەکاتو باران بێت ئاشی دەگەڕێت :
١ ـ بە کەسێك دەڵێن کاری دروستبێت ، دارا بێــتو پەکی نەکەوێت ٢ ـ بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کــە لەگەڵ هەموو دەستەیەکدا دەستی هەبێت •

با دیــزە بە دەرخۆنە بێت :ـ
دیزە = مەنجەڵی گلینــەو ســـوور کراوەتـــەوە •
دەرخۆنە = سەرقاپی دیزەکەیە ؛ ئەویــش گلینـــــەو سوورکراوەتەوە • واتا : با نهێنییەکە شاراوەبێت کەس پێی نەزانێت • جاری واش هەیە بە تەوسەوە دەوترێت •

بـــا دەیهێنێتو باران دەیسووڕێنێت :ـ
کارەکە چەواشەو شپرزەیە •

با گولــە بێتەوە لە کانــی :ـ
بۆ گاڵتە پێکردنو تەوسە • واتا : ئەو شتە هەر نایێت • ئەو داخوازییە نایەتە دی •

با لە کوێوە بێت ئەو لەوێوە شەن دەکات :ـ
( بە یەکێكو دەوترێت بە پێی رۆژ هەڵسووڕێت ) واتا : لەگەڵ هەموو دەستەو تاقمێکدا خۆی دەگونجێنێت •

بـــــا ــ با تۆش لەسەر دەی بێت :ــ
واتا : با ئەم بارەش لەسەر بارەکانی تربێت •
بـا ی‌تێ چووە :ــ لە خۆی بایی بووە • فیزی پەیـــدا
کــردووە لە خۆی گۆڕاوە •

بای تێ کراوە :ــ
١ ــ هەڵیانداوەو لە خشتە براوە ٢ ــ هانیان داوەو تێزیان
کردووە بۆ مەرامی کاری خۆیان هەڵیان ناوە •

بابــە ــ بابــە عەمرەیە :ــ
١ ــ ( ئادەمیزادێکە بە دیمەن منداڵو بە تەمەن پیر
ئەم حاڵەتە هۆی فسیۆلۆژی هەیە ، زیاتر ئینســانــی وا
کۆستە دەبێت ) ٢ ــ یان بە یەکێك دەڵێن بەتەمەن منداڵ،
بەڵام بە قسە گوستاخو زۆرزان بێت •
بـــــاخ ــ باخی بەبەرە :ــ
١ ــ ئاواتەکەی هاتۆتە دی ، رەنجەکەی دەچنێتەوە
٢ ــ هەموو کارێکی سازو لە بارە •

بـاخ بەرەڵایە :ــ
بە شتێــك دەوترێت بێخاوەن بێت ، یا خاوەنەکەی
بێدەسەڵات بێتو گوێی نەداتێو خەڵك چاوی تێبرێتو
هەڵپەی بۆ بکات •

بـــاران ــ باران باری بە تەقەتەق × درزو درومان هاتەوە یەك :ــ

به خزمانێك دەڵێن كە پاش لەیەك بوونو دلگیربـــوون ئاشتیان بێتەوەو یەك بگرنەوە .

بـــــار ــ بارەبەرە :ــ

واتا : بەكێشو ئارامە . گەلێك جار بە تەوسەوە بۆ گاڵتە پێكردن دەوترێت . واتا : ساویلكەو بەسزمانە ، یا بوودەڵەو گوێ تەپــە .

ــ بارەكەی شووشــەیە :ــ

١ ــ ( بە یەكێك دەوترێت كە كارێكی ناســـكی بەدەستەوە بێتو نەتوانێت دەنگی دەرچێنێت ) ــ پەل بە هیچ لایەكدا بكوتێت ؛ ٢ ــ ئافرەتەكە ســـكی پـڕەو مەترسیی لەبارچوونی لێ دەكرێت .

ــ بارت بگرەو باجت بسێنە :ــ

( بە چاوی خۆت شتێكت نەدی قسەی لێ مەكە )

ــ بـاری خستووە :ــ

١ ــ پشوو دەداتو دەحەسێتەوە ٢ ــ تابوشتـــی هەستان ، كاری نییە .

بـــــار ــ باری كەوتووە :ــ

١ ــ داماوو خەفەتبارو پەككەوتەیە ٢ ــ نوشوستی هێناوەو گرفتارە ٣ ــ لە كۆمەڵدا سووك بووە .

ــ بـاری گرانە :ــ

ئەركی زۆرەو زۆر ماندوو دەبێت ٢ ــ خێزانـــــی زۆرە .

بارەگوێز ــ بارە گوێــزی لێ بنێن خڕەی نایەت :ــ
١ــ ساویلکەیە ٢ ــ نەشارەزایە ، لە هیچ نازانێت •

باریـــك ــ باریك‌و بنێسی :ــ
دەڵێن داویەتیە باریك‌و بنێسی واتا : لەڕو لاواز بووە

باریکـــان ــ باریکان دەڕێسێت :ــ
( زۆر درێژە بەقسە دەدات )
٢ ــ نووزە درێژە • بە تەوسەوە دەوترێت ، بەتایبەتی بۆ منداڵێك کە بگری‌و نووزە نووز بکات •

بـــــاز ــ بازی بە سەرەوە نیشتۆتەوە :ــ
١ ــ کراوە بە پیاوێکی گەورە ٢ ــ خێرێکی گــەورەی تووش بووە • لە چیرۆکی ئەفسانە کۆنەکانی کورددا ، کە پاشا دەمرد ، بۆ هەڵبژاردنی پاشای تــازە ، بازیــان هەڵدەدا ، جا بەسەر کێوە بنیشتایەوە ئەوە بە پاشــــا دەبــوو •

بـــازار ــ بازاری کەساسە ــ کزە :ــ
١ ــ دەرامەتی کەمە ٢ ــ نافرۆشرێت ــ بۆشت ــ ٣ ــ کەس بــە لایدا نایەت‌و پشتگوێ خراوە • کەس گوێی لــێ ناگرێـــت •

بـــازاری گەرمە ــ خۆشە :ــ
١ ــ شتەکە باش دەفرۆشرێت ٢ ــ ( بۆ ئافرەت ) داواکاری

دەوترێت کە کرداری نائاسایی بێت • بەتەوس‌و ڕقەوە وای پێ دەوترێت واتا : ڕەسەن نییەو شتەکانی ، پارەکەی ، خۆی خۆش دەوێت‌و کەس کەلکی لێ نابینێت •

تـــازە ــ تازە ــ قەللاّیە ــ بابەتە :ــ
بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێت تازە هاتبێتە سەر کارێك ، یان تازە دەستی دابێتە پیشەیەك ، تازە پـــێ گەیشتبێت سا هەر جۆرە پێگەیشتنێك بێت •

ــــــ تازە کوورەیــە :ــ
تـــازە دامەزراوەو لێی نازانێت • هێشتا قاڵ نەبووە•

ــــــ تازە کیسەیە ــ تۆ کیسەیە !ــ
١ ــ بە یەکێك دەڵێن کــە تـــازە کەوتبێتە پارە پەیـــدا کردن ٢ ــ تازە دەوڵەمەند بـــووبێـــت‌و پـــارەی لا زۆر خۆشەویست بێت • بە تەوس‌و تەشەریشەوە دەوترێت •

تـــاس ــ تاس بردیەوە :ــ
١ ــ سەرسام بوو ٢ ــ پەژارە دایگرت •

تـــاس ــ تاس‌و لووس :
خۆ جوان کردن‌و دەم‌وچاو پوخت کردن دەڵێن : تاس‌و لووسی خۆی داوە •

تـــاق ــ تاق‌و لۆق ــ تاك‌و لۆك ــ تەك‌و لۆ ــ تاك‌و تووك :ــ
١ ــ جیا جیا ٢ــ پەرش‌و بڵاو ٣ ــ یەکە یەکە ــ دەڵێن بە

تاكو تووك دەڕۆن • واتا یەكە یەكەو بە جیا جیا •

تـــاك ــ تـــاكو تەرا :

١ ــ یەكە یەكە ٢ ــ ناو بەناو •

تـــالآن ــ تالآن بە مالـــم :ــ

لە هەلوێستێكی ناخۆشدا دەوترێت كە مەترســـی زیان ، قەوماوێكی گرنگ هەبێت •لە خەفەتدا لە ترساندا واتا : هەی هاوار مالم بەر تالآن كەوت •

تـــالانی ــ تالآنی‌یە !! :ــ

شتێك بە هەرزان فرۆشرا ، بـــە خۆڕایی بـــرا بە تەوسەوە ، بە داخەوە ، دەوترێت تالآنی‌یە !!؟ وا مالەوای لێ دەكرێت ؟ واتا : گوایا بە بەلاش دەست كەوتووە ؟

تـــالـــی ــ تالی‌و سوێری زۆر چەشتووە :ــ

خاوەن تاقیكردنەوەی زۆرەو شتی زۆر بەسەر هاتووە • قال بووە ، لە ژیان گەیشتووە •

تـــــام ــ تامی تێ كـــرد :

بە تەوسەوە ، واتا : خواردنەكەی لە بەرچاو خست چونكە ، بە شێوەیەك باسی كرد كە پیاو بێزی لێ بێتەوەو دلی لێ هەلكەندرێت •

تـــامی ــ تامی تامی دەدات :ــ

خۆی دەیخوات‌و مەزەی ئەو دەجوولێنێت بە بێ‌ئەوەی

بەشی ئەو بدات ۲ ــ هانی دەدات •

تــــان ــ تانو پۆ ئاوریشمە :ــ

تانو پۆ = رایەلی درێژیو پانیی هەمــــــوو چنراوێکە • دەلێن تانو پۆ ئاوریشمە •

۱ ــ لە ناو سەیدو بەگزادەدا بە کەسێك دەلێن کە لــە هەردوو سەرەوە لە دایكو باوکەوە سەید ، یان بەگزادە بێت •

۲ ــ قەشەنگو جوانە • یان بەتەوسیشەوە دەوترێت واتــا کردەوەکانی • جوانیی ، ناتەواوو نارەسەنە •

تــانــه ــ تانەی سەر چاوە :ــ

بە یەکێك ، بەشتێك ، دەوترێت کە حەز لە چــارەی نەکرێت • یان بە تەوسەوە دەوترێت وەك گلەییەك • واتا : بۆ دەبێت حەز لە چارەی نەکەن !!

تـــــاو ــ تاو توو :ــ

ئامادەکردن ، هەلگێرو داگێر کردن •لێکدانــەوەو بیر لێ کردنەوە • دەلێن : بارەکانیتاوتووکرد • واتــا : ئامادەی کردن •

ــــــــ تــاو تــوان :ــ

تاو = ورووژم • توان = هێزو دەسەلات واتا بــە هێزێکی زۆرو تەوژمێکی قایم •

تـــــاو ــ تاوو تــۆف :ــ

تۆفێکی توندو تاوێکی قایم . دەڵێن : تاوو تۆفێکی قایمە .

تەپ ـ تەپو تۆ :ـ

تەپ = دەنگی کەوتنە سەر زەویە = چەندانەیەکی (مقدار) زۆر . دەڵێن : ئاسمان تەپو تۆیەتی = ( پڕ ـەکیی بارانە ) واتا : کردوویەتی بە تۆزو باو بڕێکی زۆر .

ـــــ تەپو تۆز :

تەپە کردنو تۆز هەستاندنێکی زۆر .

ـــــ تەپوتل ـ تەپاو تل :ـ

گلان ، گلاندن بەم دیوو بەو دیودا دەڵێن:لە جێگەکەدا هەر تەپاوتلیەتی .

ـــــ تەپو دووکەڵ :ـ

دووکەڵێکی زۆر

ـــــ تەپو کۆ :ـ

دەڵێن بە تەپو کۆ دەڕوات . واتا ناتەواو ، ناڕێک دەڕوات ، هەر دەکەوێتو هەڵدەستێتەوە . دەڵێن فلانەکەس لەبەر کزیی چاو بەشەو هەر تەپو کۆیەتی .

ـــــ تەپ گل :ـ

واتا تەپەی دێت ، بەزەویدا دەکەوێتو گلیش دەبێتەوە .

تـەپ ــ تەپو مژ :ــ

( پێشەکی باران ) ، دلۆپی گەورە گەورەی بـــاران تەپەی دێتو بەدەم بای بارانەوە تۆز هەڵدەستێنێت ،

تـەپ ــ تەپو نـم :ــ

نم = نمەی باران ، دەڵێن تەپو نم باران دایکـرد نمە نمە دایکرد لەگەڵ تۆزێك کە بای بارانەکـــە ، یـا دلۆپی بارانەکە هەڵی بسێنێت ،

ـــــ تـەپو هوورِ :ــ

تەپەتەپێکی زۆر

تـەپـە ــ تەپەترِە یە : ــ

بە منداڵێك دەڵێن کە زوو زوو بکەوێتو قایم نەبێت،

تـەپـڵ ــ تەپڵـی بێعاریی کوتاوە :ــ

پەردەی شەرمو شکۆی درِیوە ، چەقاوەسووو بێ شەرمە

ـــــ تەپڵیتۆپێنی ئەو ناوەی پێ کرد :ــ

١ ــ وەك تۆپ دایە بەر نووکی شەق ، سووکو رِسوای ئەو ناوەی کرد ٢ ــ تووشی گاشەیەکی زۆری کرد ،

ـــــ تەپڵـی درِاوە ــ دەنگ نادات :ــ

بە یەکێك دەوترێت کە بەهۆی شتێکەوە بێ رێـز بووبێت ــ و کەس بەقسەی نەکات ،

تەپـڵ ــ تەپڵی زرِاوە :ــ

( بە یەکێك دەوترێت کە تەنگییەکی بووبێـــتو دەرکەوتبێت ) ،

تەتـەڵە ــ تەتەڵەمیرانێکە بۆ خۆی ــ دەڵێی تەتەڵەمیرانن :ــ
تەتەڵەمیران = جۆرە کرمێکە تووکن وەك هارێ ، گورج و چالاکە ٠ بە قەڵەبالغییەکی زۆر دەوترێت لە شوێنێکـدا
واتا : زۆرن و دێن و دەچن و داویانە بەیەکدا ٠

تەخـت ــ تەخت و تاراجی ماڵەکەی تێك دا :ــ
تەخت = بنچینەیە ــ تاراج = شتی ناو ماڵە ٠ واتـــا :
ماڵەکەی پەرش و بڵاو کردۆتەوەو لە بنچینە دەری هێناوە٠

تــــەڕ ــ تەڕو تازە :ــ
تازەیەکی ناسك و ئاودار

ــــــــ تەڕو ــ تڕو ــ تفاق :ــ
کەل و پەل = شت و مەك ٠
ــــــــ تەڕو تووشی :ــ
تووش بوون بە هۆی تەڕیبەوە ٠ واتا : بـاران و بەفرو لێزمەوە ٠ دەڵێن بەم تەڕو تووشییە بۆ کـــوێ دەچیــت ٠
تەڕ بۆتەوە ــ خۆی تەڕ کردۆتەوە :ــ
بە پیاوێکی بەساڵا چوو دەڵێن کە ژنی تازەی هێنابێـــت

تــــەڕ ــ تەڕەتۆڵەکەی ناگاتێ :ــ
تۆڵەکە جۆرە گیایەکە ، گەڵاکەی پانە بە کاڵـــی و کۆڵاوی دەخورێت واتا : هێندە هەرزانە لە تەڕەتووڵەکەش هەرزانترە ٠

ـــــ تـەڕە ژن :ـ
ژنێکـی گەنجی جوان •

ـــــ تەڕەماشی بـۆ کردووە :ـ
واتا : هیچی بۆ نەکردووە • بە تەوسەوە ، یـــا
گەمەوە دەوترێت چونکە تەڕەماش ـ ماشی ڕەش ـ بە
هیچ ناکرێـت •

ـــــ تـەڕ پیرە :ـ
پیرێکـە حەز لە بەرگی ئاڵو والآو خۆ ڕازاندنەوە
دەکات •

ـــــ تـەڕ پۆشـە :ـ
حەز لە بەرگی ئاڵو والآو جوان دەکات

ـــــ تەڕ دەستە :ـ
١ ـ زۆر شارەزایە ٢ ـ لە کاردا چالاکە

ـــــ تـەڕ دڵـە :ـ
حەز لە کالآی ئاڵو والآو جوانی دەکات •

تـەرزە ـ تەرزە شکێنی کرد :ـ
وەك تەرزە قسەی ناخۆشی بەسـەردا بارانـد ،
شکاندی ، سەر کوتی کرد •

تـــەڕ ـ تەڕزمانـە ـ تەڕدەمە :ـ

ـــــ زمانلووس و قسە زانە ، قسە خۆشە ، قسە ڕەوانە •

تـــەڕ ـ تەڕ نایێت :ـ

تەریق نایێتەوە ، قسەو توانجو هیچ ناگرێتە خۆی ،
لەو ڕێگە خراپەی گرتوویەتی لا نادات •

ـــــــ تەڕی کرد :ـ

بە جنێوو قسەی ناشیرین شکاندی •

تەزاندی ـ تەزانـدی :ـ

سزای دا ، سڕی کرد ، زیانی پێ گەیاند •

تـەزوو ـ تەزوویەك بە سەریدا هات :ـ

ترسا ، سام گرتیو کەوتە بیرکردنەوەوە

تەشپی ـ تەشپی ترێنە :ـ

تەشپی = دەفرێکی دارە وەك لەگەن
واتا : تەشپییەك خواردن ، چێشت ، دەخوات • واتـا
زۆر خۆرە •

تەشت ـ تەشتی تەلآ بەسەرتەوە بنێ :ـ

تەلآ = زێڕ ، فارسیە • واتا • دنیا ئاسایشە ، هیچ لـە
ئارادا نەماوە • دڵنیابەو مەترسە •

تەشـی : تەشـی ڕێسـە :ـ

١ ـ زۆر بلێیەو لە هەموو بابەتێك دەڵێت
٢ ـ مەرایی دەکات • مێچکە مێچکەی دەکات •

تەفر — تەفرو توونا بوو :ـ
توونا : دەربەدەر ٠ واتا : ئەوتا ، لەناو چىوو دەربەدەرو ئاوارە بوو ٠

تەق — تەقو تۆق :ـ
تەقەیەو تۆقاندنە ٠

— تەقو دەو :ـ
تەقەو دەنگ ٠

— تەقو رەو :ـ
لە ترسی تەقەو بێ ئاسایشی رەو کردن ٠

تەقاندیەوە — تەقاندیەوە :ـ

١ ـ باسەکەی کردوو بوو بە هەرا ٠

٢ ـ نهێنیەکەی ئاشکرا کرد ٠

٣ ـ رەتاندیو کاری زۆر پێ کرد ٠ دەڵێن : کرێکارەکەی زۆر تەقاندەوە ٠

تەقە — تەقەی سەری دێت :ـ
لێی نازانێت ، شارەزا نییە ٠ لە قسەکان ناگات ٠ دەڵێن : لەم کارەدا تەقەی سەری دێت ٠

— تەقەی لێ کرد :ـ
گاڵتەی پێ کرد ٠ تەشەری لێدا ، توانجی تێ گرت ٠

تەك — بە دوو شت دەوترێت کە یەکێکیان کورتو ئەویتر درێژ بێت

تەلەکــە ـ تەلەکەبازە :

بە یەکێکی کەلەکباز دەڵێن ، بە پێچو پەناو ناراست بێت ، بۆ ئەمو ئەو هەر خەریکی تەڵە نانەوە بێت •

تەمــاڵ ـ تەمالــم هەلگرت :ـ

( تەماڵ = دیاری کردنی شوێنی گیاندارێك کــــە ڕاودەکرێتو بەدی‌کردنی ، واتا : نێچیرم دۆزیـیەوە )

تەموورە ـ تەموورە زەنانێکە ـ بۆ خۆی ـ مەپرسە :ـ

تەموورە = پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆسیقا ، ملێکـــی درێژی هەیە • تەموورەزەن = ئەو کەسەیە تەموورە لــێ دەدات واتا : چڕیو بە یەکداچوونێکە ، کەس لە کەسەوە دیار نییەو ژاوەژاوو غەلبەغەلبێکە سەیر • لە چیرۆکـــە ئەفسانەییەکاندا دەڵێن : دێوەکــــە بە تەموورەزەنــــان دەڕۆیشت ، واتا : دەنگە دەنگو گمە گمێــکی زۆری بەدواوە بوو •

تەنــاق ـ تەناقبازە :ـ

لەسەر صەد پەت یاری دەکات بێبارو کەلەکبازە •

تەنــك ـ تەنكو تیــواڵ :ـ

زۆر تەنك وەك توێژاڵ •

تەنــگ ـ تەنگو چەلەمە :ـ

سەختیو گیروگرفت •

تەنــگ ـ تەنگی پێ هەلچنی ـ تەنگە تاوی کرد :ـ

زۆری بۆ هێنا ، ناچارو بێزاری کرد •

تەنگاوە ــ تەنگاوە :ــ

١ ــ کاری ئاودەستی هەیە ٢ ــ تەنگژی هەلچنراوە شیرزەبە ، لە تەنگانەدایە •

تەنگــە ــ تەنگە گرتی :ــ

لە رووی سووکییەوە یان بە رقەوە دەوترێـــت •

واتا : پەست بوو • هەلچوو ، بە قسەیەك ، بە کردارێك •

تەنگە = قایشێکی پانە ، زین یا کورتانی ولاخی لە ژێــر سکەوە پێ قایم دەکرێت •

تەنوور ــ تەنوور تا گەرمە نان دەبرژێنێت :ــ

کار تا گەرمە تەواوی بکە ، کە ساردبۆوە تەواو ناکرێت •

کار سستی لێ نەکرێت باشتر کەلکی لێ دەبینرێت •

ــــــ تەنووریان بۆ داخستووە :ــ

١ ــ ( واتا : بە گەرم باسی خراپەی دەکەنو ناوی لــــە پاشملە دەهێنن ) کۆڕیان بۆ گرتووەو گەلەکۆمەکییان بــە نهێنی تەگبیریان لێ کردووە •

تەنیــا ــ تەنیــا باڵە :ــ

هەر خۆیەتیو یاریدەدەری نییە

تەوەرە ــ تەوەرەی دەکردە دار :ــ

ئاشووبی دەگێــڕا •

تـەوق ـ تەوقی عەزازیلە چۆتە گەردنی :ـ
تەوقەکەیە کە کرایە ملی شەیتان • بە یەکێك دەوترێت کە زۆر خراپ بێت ، پیاو یا ژن بێتو کرابێت بە هاوسەری یەکێکی تر ٢ ـ بە یەکێك دەوترێت کە حەز لە چارەی نەکرێت لێی بێزار بنو لە کۆڵ نەکەوێت ، نەبێتەوە •

تـەون ـ تەونی لێ گرتووینە دار :ـ
واتا : بیانوومان پێ دەگرێت •

تەیـر ـ تەیری گول عاشق بە داری زەقنەمووتە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە عاشق بە شتێکی هیچو پووچ بێـت ) •

تـڕاند ـ تڕانـدی :ـ
١ ـ پەکی خست ، شپرزەی کرد ٢ ـ بۆڕی دا

تـــڕ ـ تڕە کەلەکێیە :ـ
١ ـ کارێکی بێ بنچینـــەیە ، هەڕەمەکـــیە
٢ ـ هەولێکی بێ هوودەیە :ـ

ـــــ تڕەکەی تڕ نییە جەوالدڕە :ـ
( زۆر بە دەعیەو دەمارە )

ـــــ تـڕەمەڕۆیە :ـ
بێ هێزو توانایە.شتێکی هیچە •

تـــڕ ـ تـڕ بێتو بەردەمی با بکەوێت :ـ
قسەیەك بێتو بەردەمی دەمدڕاوێك بکەوێت ئەوە لـە

هەموو قوژبنێکی ئاوایدا دەنگ دەداتەوە •

تـرپ ــ ترپو هوورِ :ــ
ترپە ترپێکی زۆرو توند • ترپە دەنگی پێیە •

تـرِزل ــ ترِزلـە :ــ
بەفیزە لووتبەرزە •

تـرش ــ ترشو تـالە :ــ
مـۆنو گـرژە •

تـــرِن ــ ترِنـە :ــ
بۆ کورِو کاڵ بە کاردێت • واتا : هیچ لە باردا
نەبووە • بێ هێزە • هێشتا منداڵە •
تـرِو ــ ترِو تۆپی زۆرە ــ بە ترِو تۆپە :ــ
بە دەعیەو فیــزە

ـــــــ تـرِو زرِ = ترِو تۆپ ــ ترِو فیــز :ــ
گەنجەفەو لووتبەرزی

تـرِی ــ ترِی بـرِی :ــ
یەکی خـسـت ، بەرِی لێ گرت ۲ ــ بەسەریـدا
زاڵ بوو ــ بۆرِی دا •

ـــــــ تـرِی سوێر دەکەێت ــ ترِی گەورە لێ دەدات :ــ
۱ ــ خۆی هەڵ دەترِێنێتو خۆی گیف دەکاتەوە •
۲ ــ خۆی بە زل دەزانێتو داوای شتی گەورەو گران

دەکات بە شتی کەم ، ئاسایی داناکەوێت .

تـــڕی ــ تڕی گۆڕە دەکێلێت ــ کون دەکات ــ تڕی گوێــزی کوێر دەشکێنێت :ــ
واتا : زۆر بەدەعیەو فیــزە

تریــق ــ تریقو هووڕ :
پێکەنینێکی بەرزو زۆر

تـــس ــ تسی دایەوە ــ فسی دایەوە :ــ
١ ــ وازی لە کارەکە هێناو دانیشت ٢ ــ پەکی کەوت
٣ ــ بەزی ٤ــ تابوشتی کردنی کارەکەی نەما .

تــف ــ تف کە ڕۆ کرا هەڵ ناگیرێتەوە :ــ
بەڵێنێك کە درا نابێت لێی پەشیمان بێتەوە .

ـــــــ تفی بەرەوژوور ناو چاوی خۆت دەگرێتەوە :ــ
( بە یەکێك دەوترێت کە ناوی کەسێکی خۆی بە خراپــە بهێنێت )
واتا : شکاندنی ئەو شکاندنی تۆیە .

ـــــــ تف هەڵدەیت ناگاتە زەوی :ــ
سەرمایەکی ئەوتۆیە کە هەر بە حەواوە تەڕایی دەیبەستێت

تەنگ ــ تەنگ بە تاریکییەوە دەێت :ــ
نەشارەزایانەو لە گۆترە ١ ــ قسە دەکات ٢ ــ بڕیــــار دەدات ٣ ــ خەڵك گوناهبار دەکات .

تـــك ــ تـك‌و تـاس :ــ

دەڵێن کۆرپەکە هێندە گریا لە تك‌و تاسەوە چوو •

واتا خەریکە دەتاسێت‌و هەناسەی دەگیرێت •

تلـپ ــ تلپی تەڕی تێــدا نەماوە :ــ

١ ــ مردووە ٢ ــ خەوی لێ کەوتووە ٣-پیر بووەو پەکی کەوتووە ٤ ــ هێزی لەبەر بڕاوە

تـــۆ ــ تۆ مەیکەو خــوا بیـــدات :ــ

بە یەکێك دەوترێت کە لە لاوە خێرێکی دەستگیر بوویێت بێ ئەوەی هەوڵێکي بۆ بدات ــ هەوڵێکی ئەوتۆی بۆ بـــدات •

تـــۆبە ــ تۆبەی گورگ مەرگە :ــ

پیاوی ناپاك تۆبەی نییە ، راست نابێتەوە •

تـــۆپ ــ تۆپیان ــ سەر تۆپیانێ هاتـــن :ــ

واتا : هەموویان هاتن

تۆپین ــ تۆپینی کەرەو زەماوەندی سەگ :ــ

کەوتنی باری یەکێك کە نەفام‌و ساویلکە بێت هەڵە بۆ یەکێکی بێ‌ویژدان کە کەڵك لەوە ببینێت‌و پێی پـــێ بکـــات •

تـــوورە ــ توورەو ترۆیە :ــ

بە یەکێك دەڵێن کە بەگڕو فش بە ئاسماندا بچێت ، قسە نەجوێتەوەو بیکات‌و گونجانی نەبێت •

تووره‌که ـ تووره‌که له مله :ـ

١ ـ کچۆله‌یه‌کی جوانی نه‌شمیله‌یه‌و که پێگه‌یشت زوو ده‌یقۆزنه‌وه‌و پاره‌ی زۆری بۆ خه‌رج ده‌که‌ن

٢ ـ خوازلۆکه ، سوالکه‌ره ، ده‌روونی سووکه .

تـــۆز ـ تۆزی لێ نایێته‌وه ـ لێ هه‌ڵ ناسێت :ـ

واتا : زۆر چرووکه .

ـــــ تۆزی به ئاسماندا بـرد :ـ

١ ـ په‌رش‌و بڵاوی کرده‌وه ٢ ـ فه‌وتاندی

تـووش ـ تووشی‌داوی ئه‌و بووه :ـ

گرفتاری ده‌رد بووه به‌ده‌ست ئه‌وه‌وه ، تووشی زیانـی کرد . یا فێڵی لێ کرد . یان به‌هۆی په‌یوه‌ندی به‌وه‌وه گرفتاری زیان‌و خه‌فه‌ت بوو .

ـــــ تووشی داوێکی کرد :

پیلانی لێ گێڕا . بوختـانـی بـۆ کردو گرفتـاری ناهه‌مواری کـرد .

ـــــ تووشی گونده‌شی خۆی بوو :ـ

به‌داخ‌و پێکه‌نینه‌وه به یه‌کێك ده‌وترێـت تووشـی

یه‌کێکی ملوزمی چه‌پخوونی هارو هاج ، ببێـت سـزای پێ بنووشێت‌و زیانی پێ بگه‌یه‌نێت‌و لێی نه‌یێته‌وه .

تووش ـ تووشی شه‌یتان بووه :ـ

واتا : داوی‌بووه‌به‌داوی یه‌کێکی زۆرزانی به‌ده‌وه
که به‌ڕێی خراپدا ده‌یبات‌و تووشی سزای ده‌کات •

— تووشی نیری شه‌ش کون هاتووه :ـ
(به یه‌کێك ده‌ڵێن که تووشی کاره‌ساتێکی گه‌وره هاتبێت‌و
نه‌توانێت رزگاری بێت )•

تووکه‌سه‌ر ـ تووکه‌سه‌ر بـوو :ـ
زۆر تووڕه بوو له رقدا تووکی سه‌ری راســـت
بۆوه •

تـووڵ ـ تووڵ به ته‌ڕی بچه‌مێنه‌وه :ـ
منداڵ به منداڵی بشکێنه‌وه فێری ژیان‌و ئه‌رك‌و کار
بکه ئه‌گینا به گه‌وره‌یی فێر نابێت‌و ناته‌واو ده‌رده‌چێت •

تونـــد ـ تونــدو تـۆڵ :ـ
تۆڵ = پته‌و • ده‌ڵێن : گۆشته‌کــه‌ی تونـــــدو
تۆڵـه ، واتا : پته‌وو تونــده •

تونـــد ـ توندو تیـژه :ـ
تووڕه‌و ڕه‌قه = سه‌ر گه‌رمه • ده‌ڵێن: پیاوێکـی
توندو تیژه • واتا به‌سه‌ر هه‌ڵه‌ی که‌سه‌وه ناڕوات •

تـــۆو ـ تۆوی ده‌تکێت :ـ
به منداڵی نێرینه ده‌ڵێن • گوایا ئه‌گه‌ر له‌به‌رده‌می
منداڵێکی نێرینه‌دا شت بخۆیت‌و به‌شی ئه‌وی لـــێ

نەدەیت تۆوی دەتکێت • گوایا دلۆپێك ئاو لە لووتیەوە دەتکێتە خوارێو ئەوە گەوهەری پیاوەتییەتی کە ئەوەش تکا نەزۆك دەردەچێت • ئاشکرایە کە ئەمەش ئەفسانەیە •

تونکـــل ــ تونکلی تێ دەگرێت :ــ
گاڵتەی پێ دەکات ، تەشەری لێ دەدات •

تێـــر ــ تێـر سکی خۆی ناخوات :ــ
١ ــ هـەژارە ٢ ــ چرووکـــە ٣ ــ دەســـت دەگرێتەوەو پاشەکەوت دەکات •

تیـــر ــ تیـر لە تیردانیدا نەماوە :ــ
( بە یەکێك دەڵێن ئەو هێزەی لە کارێکدا بوویەتی نەیمایێـت ) •

ــــ تیـر لە کەوان دەرچووە ــ کار لە کار ترازاوە :ــ
تازە کارەکە تەوماوە ، قسەکە کراوەو لەدەم دەرچووەو براوەتـەوە •

تێـــر ــ تێرنـەخۆرە بانگـی کردووە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە تێرخواردن نەزانێت چییـەو بـە تەوسـەوە ئەوەی پێ دەڵێن ( هەر وەکـو تێرنەخــۆرە گیانلەبەرێك بێتو ئەمی وەك خۆی لـێ کردبێـــتو کردبێتیبە هاوەڵی خۆی ، بە تێرنەخواردن رای هێنابێت )

ــــ تێـرو پـڕ ــ تێرو تەسەل :ــ

تیـــرەو ، گەدەی ، چاوی ، پـــڕە ، تەســـەلای دلـــــی هاتووە ٠

تیـــــر ــ تیرو شیر لەیەك دەسوون :ــ
زۆر ناحەز ، دوژمنـــی یەکن ٠

ـــــ تیـــرو توانـــج :ــ
توانجو قسەی تالی جەرگبڕی وەك تیر

تیرێـــك ــ تیرێكو دوو نیشانـــە :ــ
بە قسەیەك ، کارێك دەوترێت دوو ئامانج یا زیاتر بهێنێتە دی ٠

تـــێـــز ــ تێـــز ــ تیژ ــ ی کرد ــ لێی تیژ کرد :ــ
لێی هان دا ٠ لێی تێزە تێزە دا ٠ رقـــی هەلـــســـتاند ٠
تێز = بۆ تفەنگی ساچمەزەن بەکار دەهێنرێت ئامـــادەی تەقاندن دەکرێت ٠ تیژکردن = گوڕدانە بە شتێك ٠ یان پلەی بڕینی تیغەکە زیاد بکرێت ٠

تێســـکە ــ تێسکەی تفەنگ نایگاتێ :ــ
واتا : زۆر خێرایە ٠

تێـــــك ــ تێـــكو پێـــك :
تێکدانو بەیەکدا دان کاول کــــــــردن ٠ لێك هەلوەشاندن :

تێکـــەل ــ تێکەلو پێکەل :ــ

تێك ئاڵانو بەیەکدا کران ، چوون

تێکـە ـ تێکەو لێکەیە :ـ

هەر کەسە بۆ خۆیەتی ، شیرازە تێك چووە ، کەس لە کەس ناپرسێتەوە •

تێکوتانە ـ تێکوتانە ـ تێکوتەو تێبڕەیە :ـ

هەرکەسە خەمی خۆیەتیو بەتەنگ کەسی ترەوە نایەت •

زۆرو ستەم لە ئارادایە • بەرەڵایی و خۆ پەرستییە •

تێی گیراوە ـ تێی گیراوە :ـ

١ ـ تەگەرە هاتۆتە ڕێی کارەکەی ، چورتومـــــی هاتۆتە ڕێ ٢ ـ تووش بووە ، پەکی کەوتووە •

تێـــی هێنا ـ تێـــی هێنا :ـ

کارەکەی بە باشی کرد ـ سەری لێ دەرچـــــوو توانای بەسەر کارەکەدا شکا • شایستەی کردنی ئـــــەو کارەیـــە •

# ـ ج ـ

جـــاش ـ جاشی ماکەرێکـــن :ـ

بـــۆ ســـووك تەماشاکـــردنی دوو شت ، دوو کەس دەوترێـــت • واتا چـــون یەکـــن •

جاو ـ جاو دەبڕنەوە :ـ

جاو = چنراوێك (قوماشێك) بوو وەك خام‌گەلێك ڕەنگی هەبوو • بۆ دامەزراندنی ڕایەڵەکەی دەبوو زۆر بهاتنایەو بچوونایە • واتا : زۆر دێت‌و دەچێت •

حــەرگ ــ جەرگ ئــاوس بوو :ــ
واتا : خەفەتی بەدەستەوە زۆر خوارد ، بێزار بوو .

ــــ جەرگــی بــڕی :ــ
١ ــ داخی زۆر دایە ٢ ــ سزاو زیانێکی ئەوتۆ گەورەی پێ گەیاند کە لە ئەندازەی کوشتندا بوو ٣ ــ زارۆڵەکەی کوشــت فەوتانــد .

ــــ جەرگی بۆ هیچ کارێك نییە :ــ
ناوێرێت خۆی لە هیچ کارێك بــدات .

ــــ جەرگی چووزاندەوە :ــ
داخی دایە ، ژانی بردە دڵیەوە .

ــــ جەرگی ســووتا :ــ
منداڵەکەی مــرد .

جەهەنەم ــ جەهەنەم ــ قیری سیا ــ قیرو سیا ــ جەهەنەمی لێ پڕ بوو ــ پڕ بێــت :ــ
وتەیەکە بە ڕقەوە بە یەکێك دەوترێت ، تۆرابێت ، تووڕە بووبێت ، هەڵوێستێکی نادۆستانەی هەبێت ٢ ــ دەربڕینی بێزاریو رقە لە شتێك . واتا : چش ، ئەوچاتر .

جُــڕ ــ جڕ بۆزە :ــ
وتەیەکە لە ڕاوە بەرازدا بەرازی پــێ تــووڕە دەکرێت . واتا : وەك بەرازێکی کێوییە .

جـــرپ ــ جرپو جۆپ ــ جرتو فرت :ــ

جـرپ = جـرت = جـرپنـــیو بزێـــوی کـــردن •
فرت = بەخێراییو پەلە دەرپەڕین • دەڵێن : قوڕ بە تڕت
خاك بە پۆپت کەس نیە بێتە جرپو جۆپت • واتا : جرپنیو
فرتە فرتی نابەجێت •

جـــڕ ــ جـڕ جونگانیڕە :ــ

تووڕەو تڕۆیـــە •

ــــ جڕو جیـــاز :ــ

( پــڕو پیتی نـــاو مـــاڵ )

جڕنیـــا ــ جڕنیاو فڕنیا :ــ

ختوکەو گدەگدە • دەڵێـــن : جڕنیـــاو فڕنیـــــای
مندالەکە مـــەدە •

جـــل ــ جـــل خوارە :ــ

بێگانە پەرستە • نۆکەری بێگانەیە •
زوو بەو کوردانەیان دەوت کە تورکخــــواز بـــوونو
تورکچێتیان دەکـــرد •

جلـــەو ــ جلەوی بۆ ــ شل کرد ــ بەردا :ــ

١ــسەربەستو بەرەڵای کرد ٢ ــ رێی دا ٣ ــ لەگەڵیدا
نەرم بـــوو •

ــــ جلەوی شـــلە :ــ

بەرەلآیە ، بێ لغاوە .

ــــ جلەوی ــ بەربووە ــ هەل تەکاندووە ــ پچڕیوە :ــ
یاخی بووە . مل بۆ کەس دانانەوێنێت .

حــــل ــ جلو جــۆڕ :ــ
( شڕەی نــاو مال )

جمــە ــ جمەی دێــت :ــ
واتا : زۆر چڕە ، خەلکێکی زۆری تێدایە .

جــــن ــ جــن تێــی تســیوە :ــ
بە شتێك دەلێن کە لەبەر چاوی یەکێك زۆر کەمی
کردبێت . واتا پیتی نەماوەو کەس نازانێت چۆن وا کەمی
کردووە ، وا زوو تەولو بووە .
جـــۆ ــ جۆ بە دیواردا هەلدەگیرێت :ــ
زۆر بە تواناو دەسەلآتە ، سا لە ڕێی دینەوە بێت یان دنیا
( کاری وا قورس‌و گران دەکات بە کەس ناکرێت ) .

جـــۆ ــ جۆی لێ بــڕی :ــ
واتا ( پەکی‌خست ، دەستەوسانی کرد )

جوانــاو ــ جواناو دەرێژێت :ــ
ئارەق دەرێژێت بە تەوسیش بە یەکێکی بێکــارەی
تەمەل دەوترێــت .

جووتە ــ جووتە وەشێنــە :ــ

١ ـ قسەتڕنو نەزاندووە ٢ ـ توورەوتڕۆیە قسەی ناشیرینو بەرزو نزم بەخەلك دەلێت .

جووجەلە ـ جووجەلە لە پاییزدا دەژمێردرێت :ـ
کاربەئەنجامە .

جووخێن ـ جووخێن ـ خەرمان ـی لەبەر بایە :ـ
رەنجەکەی هاتۆتە کۆو دلیشی خۆشە .

جوست ـ جوستو جـۆ :ـ
کۆششو تەقەلادانو دواکەوتنی شتێك ئامانجێ

جـۆلا ـ جۆلا بە سەردری خۆی نارازییە :ـ
١ ـ بە یەکێك دەلێن بە رەسەنی خۆی ، بەکاری باوو باپیری خۆی ناقایل بێت ٢ ـ بە کارەکەی خۆی ناقایـل بێـت .

جومعە ـ جومعەی پێ تەواو ناکرێـت :ـ
بە تەوسو گالتەوە بە یەکێك دەوترێـت کە نمـوودی نەبێت واتا : بە پیاو دانانرێت . جومعەی دروست نابێت ئەگەر چل کەس نەبـن .

جیـق ـ جیقی دەرهێنا :ـ
١ ـ پلیشاندیەوە ، کوشتی ٢ ـ وای لێ کرد لـە ئاوا هاوار بکات . دەلێن خۆ تۆ جیقی منداڵەکـەت دەرهێنا
جیق = دەنگی فلیقانەوەی شتە

جێـی ـ ـ جێی ئەوی گرتەوە :ـ

وەك ئەوە لە کردەوەدا ، لە گوفتاردا ، لە باشیدا ،
لە خراپیدا .

ـــ جێی باوەڕە :ـ

سەرراستە ، راستە ، متمانەی پێ دەکرێت

ـــ جێی پێ نەپێوو :ـ

قەلەبالغێکی بێ شومار بوو .

ـــ جێی ـ جێگەی ـ پێ لەق ـ لێژ بوو :ـ

١ ـ تەنگی پێ هەلچنرا ، خەریکـن دەری پەڕێنـن
٢ ـ ژیانی لێ تاڵ بوو کەوتە دلخوردی .

ـــ جێی خۆی خۆش دەکات ـ گەرم دەکاتەوە :ـ

خۆی تەواو دادەمەزرێنێت ، خۆی بنجبەست دەکـات
بەزمانی شیرین بەکردەوە ، بەهەر ڕێگەیەکی تر .

ـــ جێی سەبری سووتاوە :ـ

ئارامی لەبەر بڕاوەو خۆی پێ ناگیرێت .

چـاڵ ـ چاڵو چـۆڵ :ـ

نارێكو ناتەخت . بەرزیو نزمی شتێك

چـاو ـ چـاو باشقالـە :ـ

بە یەکێك دەلێن کە هەر چاو بۆ ئافرەت بگێڕێت ،

که ئافرەتی دی ، سەرنجی زۆر لێ بدات ، چاوی لێ نەترووکێنێت •

— چاو بازەو ناگیرێت :ـ
( یەکێك دەیلێت کە پێی بلێن بۆ نەوەندە تەماشای ئافرەتی نامەحرەم دەکەیت )

— چاو بە چاو دەکەوێتو ڕوو بەڕوو :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە بەدیەك بەقسە ، بەکردەوە ، بەرامبەر بە یەکێکی تر بکات کە لەوێ نەبێت • واتا : ئەو خراپەیە مەکە چونکە دەبێتە مایەی شەرمەزاریت • یان یەکێك خۆی دەلێت : ئەوە ناکەم ، ئەوە نالێم تا شەرمەزاری ئەو کەسە نەبم چونکە بەرەو رووی یەکتر دەبینەوە •

— چاو بەرەوژێرە :ـ
دەستیاوی بەسەرەوەیە ، قەرزاری چاکەو پیاوەتی‌یە

— چاو بەستی لێ کرد :ـ
فێلی لێ کرد ، کەلەکی لێ دا •

چاو ـ چاو چنۆك :ـ
١ ـ چاو چلێسە ، چاوی بە هەر خواردێك بکەوێت دلی دەچێتە سەری ، مەزەی بۆی دەجوولێت ، بە تایبەتی مندال ٢ ـ بە یەکێکی تەماعکار دەلێن کە چاوی بە هیچ تێر نەبێتو بۆ مالی دنیا هەموو ڕێگەیەك بگرێتو لای شەرم نەبێت •

— چاوت ــ رۆشن ــ روون :ــ
رستەیەکە بۆ دەربڕینی پێ خۆش بوون دەوترێت •
دەڵێن : چاوت روون کوڕەکەت لە شار هاتەوە •

— چاوت ئەفرێت :ــ
چاوەڕوان بە ، پەلەت نەبێت • ( بە یەکێك دەڵێن
کە چاوەڕێی ناخۆشییەکە ) • وا باوە گوایا چاوی راست
کە فڕی خۆشەویستی پێ دەبینرێت ، چاوی چەپ کە
فڕی پێی دەگری •

— چاو ــ بەرچاو ــ تێرە :ــ
١ ــ نانیدەیەو دەستی ئەمو ئەو دەگرێت
٢ ــ بەبەشی خۆی دادەکەوێت • هەڵپەی چاو برسیانە
ناکات •

— چاوچاو نابینێت ــ دەرناکات :ــ
دنیا هێندە تاریکە ، شەوەزەنگێکە بۆ خۆی• تارووناکی ی
چاویش نابینرێت •

چاو ــ چاوو ڕاو دەکات :ــ
فێڵو تەلەکەبازی دەکات •

— چاوسوورکەری نییە :ــ
گەورەی نییە کە جلەوگیری بکاتو نەهێڵێت بەرەڵا
بێت ، لێی بپرسێتەوە • واتا : چاوی لێ سوور بکاتەوە •
— چاو کراوەیە :ــ

دنیا دیدەو خاوەن تاقیکردنەوەیە ، تێگەیشتـووە ، چۆتە ناو کۆمەڵەوەو فێری ژیان بووە •

ـــ چاوکونـە سووژن :ـ
به یەکێك دەڵێن چاوی زۆر ورد ، بچووك بێت •

ـــ چاوی لە چاو شەرم دەکات :ـ
بۆ کارێك کە چویتە لای کەسێك کە چاوی پێت کەوت شەرم لە رووت دەکاتو کارەکە جێبەجێ دەکات •

ـــ چاو لەدەرە :ـ
به یەکێکی داوێن پیس دەوترێت کە هەر عەودالی سێکس بێـت •

ـــ چاو نەترسە ـ چاو قایمە ـ چاو توندە :ـ
دلێرە ، لەهیچ سڵ ، کۆ ناکاتەوە •

چـــاو ـ چاوی بەرایی نایــەت :ـ
دلی هەڵناگرێت ئەو شوێنە ، ئەوشتە ئەو کەســە ببینێت یان بەکاری بهێنێت ، یان بەو شوێنەدا بــڕوات چونکە یادی کەسێك ، رۆژانێك ، شتێکی خۆشەویستی بیر دەخاتەوەو ئەو یادە خەفەتی دەداتێ •

ـــ چاو ی بڕیوەتە لاکی :ـ
به یەکێك دەڵێن کە بەتەمای مالی یەکێك بێـت ، بۆ هەڵ بگەڕێت ، پیلانی لێ بگێرێت •

— چاوی پەڕیە پشتی سەری :ـ
زۆر تووڕە بـوو

— چاوی پێ ـ بەسەری ـ هەڵ نایەت :ـ
زۆر ڕقی لێیەتی ، حەز لە چارەی ناکاتو نایەوێت بیبینێت

— چاوی پێدا خشـاند :ـ
تەماشایەکی گورجی کرد •

— چاوی ترسـا :ـ
سڵی کردەوە ، تەمێ بوو ، کارەکەی نەکرد

— چاوی جـن دەردێنێت :ـ
( یە یەکێکی جرپنی جەربەزە (دەوترێت) • هەرزەیە

— چاو ی حیـز کردووە :ـ .
گوناهێك ، کەتنێك ، شتێکی خراپی کـردووەو
لەتەریقیدا ، شەرمەزاریدا سەری خۆی شۆڕ کردووە •

چـاو ـ چاوی داگیرساوە :ـ
١ ـ چاوی گل دەکات ٢ ـ رقی هەستاوە

— چاوی دەرپێت :ـ
بـۆ بێزاریو رق لێ بوون دەوترێت

— چاوی رەشی کاڵ کردەوە :ـ
چاوەڕێیەکی زۆری کرد بەڵام بەبێ ئەنجام • نائومێد بوو

— چاوی ڕووا :ـ

چاوەڕێیەکی زۆری کرد •

— چاوی ڕوون بووەوە :ـ

بینینی ئەو کەسە ، ئەو شتە ، ئەو شوێنە شـادی کردو دلـی کـردەوە •

— چاوی سپی بێـت :ـ

بۆ بێزاری دەوترێت ، واتا ، بمرێت

— چاوی سوور بووە :ـ

لە خۆی گۆڕاوەو بایی بووە ، یاخی بووە

— چاوی شەمشەمەکوێرەو هەتاویان نەوتووە :ـ

١ ـ بە یەکێك دەڵێن کە توخنی کۆڕو کۆمەڵ نەکەوێت‌و بێت ، بهێنرێتە کۆڕەوە • واتا کەڵکی ئەو شوێنانـەی پێوە نییە ٢ ـ کوڕی ئەو بارە نییە ٣ ـ مرۆڤێکـــی ناڕاستەو ڕووی کۆمەڵی نییە •

— چـاوی شۆڕە :ـ

١ ـ شەرمەزارە ٢ ـ ناپاکە ٣ ـ سووکە ٤ ـ خۆی بـە گوناهبار دەزانێت •

چـــاو ـ چاوی کەو ـ مار ـ دەردەهێنێت :ـ

دەست ڕاستە ، نیشانشکێنە ، تیر ئەندازە •

— چاوی گەرم بوو :ـ
خەوی لێ کەوت

— چاوی لە چاوی بهاتایە :ـ
حەز لە چارەی ، بینینی ناکات ، سا یا بە رۆیشتنی ئەو ، یان هی ئەم رزگاری ببوایە

— چاوی لێ پۆشی :ـ
لێی خۆش بوو ، لە کەم و کووڕیو هەڵەی بورد •

— چاوی لێ دەرپەراند ـ لێ سوور کردەوە :ـ
هەڕەشەی لێ کرد ، لێی تووڕە بوو •

— چاوی لێ دەکات :ـ
لاسایی دەکاتەوە • وەك ئەو دەکات

— چاوی لێ ناترووکێنێت :ـ
بەگەرم چاودێری دەکات ، یان لە خۆشەویستیدا یان بۆ ئامانجێك ٢ ـ بێ سڵ و ترس و شەرم ئەو کارە دەکات •

— چاوی لێ نووقاند ـ قووچاند :ـ
١ ـ بە دەربەسەوە نەهات ٢ ـ حەرام و خواردی و گوێی نەدایە ٣ ـ پشتی تێ کرد ٤ ـ چاوی پۆشی و لێی بورد •

چاو ـ چاوی نایە سەریەك ـ لێك نا :ـ
نوست ، خۆی بەنووستوو پیشان دا •

— چاوی مشتێك هەرزن دەگرێت :ـ
هێندە لاواز بووە چاوی بە قوولدا چووە

— چاوی ـ لووتی ـ هێنایەوە بەر خۆی ـ شکاند :ـ
١ ـ تەریقی کردەوەو هۆشی هێنایەوە سەر خۆی بایـی بوو بوو بەربەستی کرد ٢ ـ بەزاندی •

چـەپ ـ چەپو چیـڕ :ـ
دەڵێن چەپو چیڕ لەیەك وەستان واتا : لەیەك چیـڕ بوونەوەو هەریەکە خۆی چەپو لار کردەوە بۆ ئەوی تر تا پێدا بپلۆسێت • خۆیان لەیەك گیف کردەوە ٢ ـ خوارو خێـــچ •

چەپەر ـ چەپەرە شڕە چ پێوە بیت چ لێوە بیت :ـ
( بە یەکێك ـ شتێك ـ دەوترێت کە بوونو نەبوونی وەك یەك وابێت ) واتا بێکەڵکە • بۆ سووکی ئەو شتە یـان ئەو کەسە دەوترێـت •

چەتە ـ چەتەیەکە بۆ خۆی :ـ
١ ـ بە یەکێك دەوترێت کە لە ژێر رکێفدا نەیێتو بەتەنگ هیچەوە نەیەت ٢ ـ بە یەکێك دەوترێت بێشەرمانە

ماڵی ئەمو ئەو بخواتو بە تەنگەوە نەیەت •
چەتەوڵ ـ چەتەوڵ :ـ
زەلامی زەبەلاح •

چـەرخ ـ چەرخی لە چەمەر دەکێشم :ـ

چەرخ = پێچکە • چەمەر = ئەو ئاسنە خڕەیە ( تەوقەیە ) کەپێچکەکەی تێدا قایم دەکرێت • پێچکەکە لە دارە •
واتا : خراپی بەسەر دەهێنم ، تۆڵەی لێ دەستێنم •

ـــ چەرخی چەواشە :ـ
ڕۆژگاری ناهەمواری چەپکەرد •

چەقەڵ ـ چەقەڵ لە چەم‌و گورگ لە کێو •
هەر جنسە بەپێی سروشتی خۆی‌و لە جێی خۆی •

چەقـۆ ـ چەقۆ دروست دەکات‌و دەسەی لێ ناخات ـ تێ ناخات :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە شتێکت بـۆ بکـات بەنیـوەو نیوەچڵ ) •

ـــ چەقۆ کول :ـ
بە مرۆڤێك دەڵێن هیچی لە باردا نەبێت دەڵێـن : فیسارەکەس لە بەرەی چەقۆ کولانە • لە بێدەسەڵاتانـە

چەقـۆ ـ چەقۆ لەیەك دەسوون :ـ
بەزمان ، بەکردەوە ، دوژمنایەتی لەگەڵ یەکـــدا دەکـەن •

چـەك ـ چەك ـ چك ـو چڕی دا :ـ
دەڵێن : کارەکە ، بزنەکەی چەك‌و چڕ دا • واتا : گوانی چەك خستووەو شلی‌کردووە بەوەی شیری لە گوانـــدا نەهێشتووە •

چلـه ـ چلـه ـ چەلە ـ ی چاوی دێـت :ـ
نانوێتو چاوی لێك نانێت • دەڵێن هەتا بەیانی چەلـەی چاوی هاتووە •

چەڵتـە ـ چەڵتەوەشێنو رەهەندەی عامە :ـ
( چەنەباز هەموو کەس لێی بێزارە ) دەڵێن : فیسارکەس چەڵتەوەشێنە واتا : چەنەبازەو لە شـامو شیـرازەوە دەیهێنێتەوەو بێزارکەرە •

چەڵتووك ـ چەڵتووکێکی تێ چەقاند ـ چقڵی تێ چەقاند :ـ
تەگەرەی لە کارەکە دا • قسەیەکی وای کرد کارەکە سەر نەگرێت •

چـەل ـ چەڵو ملە بە سەریەوە :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە لەپیاو نەبێتەوەو هەتا مردن بەخێوی بکات • یان تا ئەو ئیشەی هەیەتیو بۆی دەکات ) •

چەنـە ـ چەنە بە چەنەی وەستایەوە :ـ
شەڕە قسەی لەگەڵدا کردو بەرپەرچی قسەکانی دایەوە •

چەوەندەر ـ چەوەندەرێك لەو زەویە دەربهێنە :ـ
لە هەڵوێستێکدا دەوترێت کە شتێك لە باسدا بێتو شتەکە نەبێت ، دەست نەکەوێت ، دەست نەیگاتێ ، لەبـەر هەژاری لەبەر نەبوونی ئەوشتە یالەبەر هەر هۆیەکی تـر بێت • واتا شتەکە نییەو دەست ناکەوێت •

چەوری ـ چەوری بەری چاوی گرتووە :ـ
لە خۆی گۆڕاوە ، بایی بە ، روو لە خەڵك لا دەدات ،
چاوی خەڵك نابینێت •

چـــرا ـ چرا وەكوژێنە :ـ
( بەمەردمی ناپاكی داوێن پیس دەوترێت دەبێژرێت
فیسارکەس لە بەرەی چرا وەکوژێنە )

ـــ چرای کەس تا رۆژ ناگرێت :ـ
( هیچ کەس تا سەر بەختیار نابێت )

ـــ چرای نابووتی هەڵ کردووە :ـ
بانگی نابووتی خۆی داوە ٢ ـ خۆی وا پیشان دەدات کە
هیچی نیە • بە تەوسیشەوە دەوترێت •

چـــڕ ـ چڕو چـاو :ـ
روو • دەموچاو •

چـــزە ـ چزەی لێ هەستاند :ـ
پێوەی دا ، پێوەی کـرد ، گرفتاری کرد ، زیانی
پێ گەیاند ئازاری پێ گەیاند ، لێی دا •

چقـە ـ چقەی دەر کردووە :ـ
گەورە بووە ، پیر بووە • بەزۆری بۆ سووکـــی
بە یەکێك دەوترێت ، چونکە باڵندە چقە دەردەکات •

چقـڵ ـ چقڵـی چاوە :ـ

واتا وەك چقـل دەچەقێتە چاوی ناحەزەکانی ، کوێریان دەکات •

چلکـاو ـ چلکاوخۆرە :ـ
١ ـ بە کرێگیراوی ئەم‌و ئەوە ، هی بێگانەیـە
٢ ـ دەروون نزمـە •

چـــل ـ چل‌و چـۆ :ـ
دەڵێن زۆر بە چل‌و چۆیە : واتا : زۆر هەڵمەتەکاسەو خۆ هەڵقورتێنە ٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە قسەی ئەم بـــۆ ئەوو ئەو بۆئەم بهێنێت •

چنـــك ـ چنگ لەسەرشان :ـ
١ ـ بە پەلەو هەڵەداوان ٢ ـ بەزۆرو تەکـــــان دەڵێن : چنگ لەسەرشان ڕایان فڕاند •

چنـــك ـ چنگی بە سەردا ـ دەستی بەسەردا گرت :ـ
داگیـــری کرد •

ـــ چنگی لێ گیــر کرد :ـ
پێی گەیشت ، دەستی کەوت‌و دەستی لێ قایم کرد • .

چـــوار ـ چوار پەلی شکاوە :ـ
١ ـ زۆر ماندووە ٢ ـ زۆر نەخۆشەو خەریکـــە دەمرێت ٣ ـ ورەی بەرداوە •

ـــ چوار پەلی بەستراوەتەوە :ـ

دەسەلاتی بڕاوە . هیچی پێ ناکرێت .

ــــ چوار پێ‌یــە :ــ
واتا : وەك ئاژاڵ بێ‌مێشکە

ــــ چوار پینەی کەیت ناگاتە بەهار :ــ
زۆر پیرە ، یان زۆر نەخۆشەو پەکی کەوتووە .

ــــ چوار چاوە :ــ
واتا : دوو ژنــی هەیە .

ــــ چوار چاویان کرد :ــ
سەریان لێ شێواندو شپرزەیان کرد

ــــ چوار گورچکە ــ گورچکی قایمە :ــ
بە هێزو پتــەوە .

ــــ چوار مێخەی ــ کرد ــ کێشایەوە :ــ
چوار پەلی بەستەوە ، دەسەلاتی بڕی
٢ ــ شپرزەی کرد ، پێوەندی کــرد

چــــوو ــ چوو بۆ ــ خورما ــ چوکلێت ــ خواردن :ــ
( لەڕووی سووکییەوە بە یەکێك دەلێن کە بمرێت ) .

چــووە ــ چووە پالــی :ــ
پشتی گرت ، لەسەری کردەوە

ـــ چووه ژێـرێ :ـ
١ ـ پێی لێ نا ، دانی پێدا نا ٢ ـ ئەرکەکـــە ، کارەکەی گرتە ئەستۆی خۆیو خۆی لێ بەرپرسیار کرد
٣ ـ دالغەی لێــدا •

ـــ چووە سالەوە :ـ
پیر بــووه •

چۆتــە ـ چۆتە سەر دارێ نایەتە خوارێ :ـ
لەسەر قسەی خۆی سوورەو پاشگەز نایێتەوە ، کـەللە رەقی دەنوێنێــت •

ـــ چۆتە بـن کلێشەیەوە :ـ
بـن کلێشە = بن باخەڵ •
١ ـ فریوی داوە ٢ ـ خەریکە لاسی بداتو لەخشتەی بەرێـت •

چــۆك ـ چۆکی دادا :ـ
١ ـ بەزی ، ملی شۆر کرد ٢ ـ وازی هێـــنا ، تابوشتی نەمــا •

چوکلـە ـ چوکلەشکێن خۆی دەشکێنێت :ـ
( یەکێك خزمی خۆی بشکێنێت خۆی دەشکێنێـــت ، یەکێك بە کاری منداڵانەوە خەریك بێت خۆی دەشکێنێت)

چۆلەکە ـ چۆلەکە خۆت چیتو گۆشتاوت چییە :ـ

١ ـ ( بە یەکێکی بێ نموود دەوترێــــت کە بەڵێنـــــی
یارمەتییەکت پێ بدات ) ٢ ـ کە هەڕەشەیەکت لێ بکات

چیـکنـدان ـ چیکلدانی تەسکە ـ کەم چیکلدانە :ـ
زوو هەڵدەچێت ، کەم ئارامە ، زوو تووڕە دەبێت •

چێــو ـ چێو لە تاریکی دەکوتێت :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە لە نەشارەزاییەوە قسە بکات )

ـــ چێو دارە :ـ
واتا : ڕەنجبەرە یان شوانە

# ح

حـــازر ـ حازر خۆری بەر سێبەرە :ـ
بە یەکێکی تەمەڵ دەڵێن کە خۆی لە کار بدزێتــــەوە .
بەڵام لە کاتی بەرهەمو خواردندا ئامادەبێت •

حـــازر ـ حازرو بــزر :
ئامادە • حـــازر = ( حاضر )ی عەرەبی‌یە

حـــال ـ حالم بە حالی نەبێت :ـ
واتا : زۆر پەرێشانە • شپرزەیە

ـــ حالی قنگی خۆشە !! :ـ
واتا زۆر پەرێشانەو لەگەڵ ئەوەشدا واز ناهێنێت •
بە تەوسەوە دەوترێــت•

حەپۆل ـ حەپۆل مێش‌خۆرە ـ دەڵێی حەپۆل مێش‌خۆرە :ـ

به یەکێك دەڵێن کە گێژ بێتو ئاگای لە دنیا نەبێت •
( لەبەر گێژو کاسی مێش لە خۆی دەر ناکات )

حەچولوور ــ حەچولوورێکە مەپرسە :ــ
سەگوەڕە •
بە بێزاریی‌و تەوسەوە ، بە ڕقەوە ، بە دەنگ‌و
ژاوەژاوێك ، قاوو قیژو هەرایەکی زۆری منداڵ ،
دەوترێت کە ناساز بێت‌و دەوروپشتی بێزار بکات •

حەز ــ حەزی لە خۆی کردووە :ــ
بە یەکێك دەڵێن زۆر بەخۆیدا بێت‌و خەریکی خۆی
بێت ، هەمیشە لەبەر ئاوێنە بێت •

حەسیر ــ حەسیر مەیدانی ئەو ناوەی پێ‌کرد :ــ
تێرو پڕی کوتا • وەك چۆن حەسیر دادەخرێت‌و
لەشی‌زەلام رووت دەکرێتەوەو پەڕۆیەکی تەڕ بە لەشیدا
دەدەن‌و دارکاری دەکەن •

حەلوا ـ حەلوا گەزۆیە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر نەرم بێت • بێ درك بێت‌و
هەموو کەس پێی بوێرێت •

حەمە ــ حەمە قەدۆی مووسلە ــ دەڵێی حەمە قەدۆی‌مووسلە
حەمە قەدۆ = دەوڵەمەندێکی گەورەی مووسل بووە •
واتا زۆر دەوڵەمەندە ، وەك حەمە قەدۆ • بە تەوسیشەوە
دەوترێت •

حەمـام ــ حەمامی ژنانە ــ دەڵێی حەمامی ژنانە :ــ
به شوێنێك دەڵێن ژاوەی بێتو هەر كەسە لە ئاشێك
بكـات •

حەوالـە ــ حەواڵە بە گەواڵەیە :ــ
پێچو پەناو هەڵخەڵەتاندنە ، هێنانو بردێكی ماندووكەرە
گەواڵە = پەڵە هەورێكی باوەندەیە كە بێتو بـــڕوات
واتا ڕاسپاردەكەت بە هەوردا بۆ دەنێرم كە ئەوەش بـە
یەكێكی ساویلكە وتراوەو هەڵخەڵەتێنراوە •

حـەوت ــ حەوت بـرا :ــ
واتا لە جێی حەوت برا ، بە یەكێكی خۆشەویـســت
دەوترێـت •

ـــ حەوت پەراسووی لە ئۆمەتی محەمەد زیاترە :ــ
بە یەكێك دەڵێن كە زۆر بەتوانا ، بەكێشو ئارام بێت •
دەڵێن : حەوت پەراسووت لە ئۆمەتی محەمەد زیاترە كـە
لەگەڵ ئەو ناڵەبارەدا هەڵدەكەیت •

حەوشـە ــ حەوشەكەی خوارە :ــ
بە تەوسەوە دەوترێت، واتا بیانووەكەی نابەجێیە •

حەیـا ــ حەیا باری كردووە :ــ
واتا بەرەڵایی‌و بێ شەرمییەكە ئەوسەری دیار نەبێت ،
لەكاتێكدا ئەمە دەوترێت كە شتێكی نابەجێو شەرمنبـدە
بكرێـت •

— حەیا بە چاوەوەیە کە چاو نەبوو حەیا کوا ؟
بە تەوس و گەمەوە بە یەکێك دەڵێن کە چاوی کز بێت و شتێکی نابەجێ بکات •

— حەیـا قەترەیەکە کە تکا تکا :ــ
لە هەڵوێستێکدا بە یەکێك دەوترێت کە ناوی بە خراپــە زڕابێت • واتا : ئەو پەردەی شکۆی دڕاندووە ، سووك و ڕسوا بووە ئیتر چی لێ دەگیرێت •

حوشتــر ــ حوشترو کەپوولەیان نەوتوە :
واتا : ئەو زەلامە زلە بەو خواردنە کەمە داناکەوێــت • بۆسووکی و تەوس دەوترێــت •

حیــزەڵە ــ حیزەڵەیە :ــ
بە تەشەرو گاڵتەوە بە یەکێکی کار لێ نەهاتووی بێ دەسەڵات دەوترێــت •

خاتـر ــ خاترو خۆتر :ــ

دەبێژرێت : لە کڕینو فرۆشتندا خاترو خۆتر هەر بووە • واتا : لەبەر شوناسی ، خزمایەتی ، قازانجی زۆری لێ ناسەنرێت ، ئەو پەیوەندییەی هەیە لەبەر چاو دەبێت •

خــاك ــ خاکــی بە توورەکە بێژراوە :ــ

١ ــ ولاتەکەی داگیرو پەرێشان کراوە ٢ ــ هەرچی خراپە بەو کەسە کراوە • جا خاکێك بە توورەکە ببێژرێتــەوە دەبێت چی لێ کرابێت ••

— خاکی بەسەر :ـ

ڕستەیەکە بۆ داخ و خەفەت ، بەزەیی ، هەڕەشـــە لێ کردن دەوترێت • یەکێك خاکی بەسەردا دەبێت کـە کەسێکی خۆشەویستی بمرێت ، یان خۆی بمرێت و خاکی بەسەردا بکەن • واتا لەگۆڕدا • بینێژن دەڵێن : خاکـی بەسەر بۆ کوێ دەچێت • یان خاکی بەسەر هەمیشـــە داماوە •

خـــاڵ ـ خاڵ و بۆر بـــووە :ـ

خەریکە بگات • هەندێك میوە کە بگات خـــۆی دەنەخشێنێت ، خاڵ پەیدا دەکات و ڕەنگی جوان دەبێت •

خـــاڵ ـ خاڵ و ملی رشتووە ـ خەت و خاڵی رشتووە :ـ

واتا : ئەو کچە خۆی داڕشتووە و جوان بووە ، خـــۆی نەخشاندووە و پێگەییوە ، وەك چۆن بەچکەی هەندێـــك باڵندە کە گەورە بوو وەك جنسەکەی خاڵ و میلی لـــێ پەیدا دەبێـــت •

خامـە ـ خامـە هێشتـــا :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە لە ژیان شــــــارەزا نەبێـــت و چەرمەسەرێی ژیانی نەدیبێت ، ساویلکە بێـــت •

خانـە ـ خانە بەکۆڵـــە :ـ

١ ـ ئاوارەیە ٢ ـ بێ لانەیە ٣ ـ بە تەوسیشەوە بە یەکێك دەڵێن کە جێ بە خۆی نەگرێت و هەر ساتە لـــە شوێنێك بێـــت •

ـــ خانه بێـزاره :ـ

١ ـ به یه‌کێك ده‌ڵێن که نه‌که‌وێته ماله‌وه‌و هه‌میشه له‌ملاو لا بێت • سا یا له‌به‌ر ناخۆشیی ماله‌وه ، یان له‌به‌ر رابواردنی ئه‌ملاولای •

خانـوو ـ خانوو به‌ره :ـ

( خانوو نشینگه له‌گه‌ڵ باخ‌و زه‌وی ده‌ورو پشتـی ده‌ڵێن خانوو به‌ره‌ی خۆیه‌تـی•

خـــان ـ خان‌و مانـه :ـ

ده‌ڵێن ئه‌و کچه ، ئه‌و ئافره‌ته خان‌و مانه • واتا : ئافره‌تێکی سه‌لارو ته‌واوه •

خـــاو ـ خاو بووه‌وه :ـ

ساردو هێمن بووه‌وه • تووڕه‌یه‌که‌ی نیشته‌وه •

ـــ خاوو خلیچك :ـ

سسته‌پـه‌له ، سست‌و ده‌سته‌پاچه

ـــ خاوو خێزان :ـ

خێزانه‌که هه‌مووی • ده‌ڵێن : به خاوو خێزانـه‌وه چووینه سه‌یـران •

خایـــه ـ خایه‌و مایه :ـ

مایه‌و هه‌رچی که هه‌یه‌تی • ده‌ڵێن : خایه‌و مایـه‌ی له‌ده‌ست چوو •

حـمت ـ خەتە سووریٚ لە خوٚم دووریٚ :ـ

یەکێك دەیلێت کە خوٚی لە کارەساتێـــك ، قەوماوێـــك دوورەپەرێز بگرێتو گویٚ نەداتە کەس هەر خوٚی خوٚش بێـــتو بـەس •

ـــ خەتی بوٚ کێشـــا :ـ

رەنگی بوٚ ڕشت ، راوێژی بوٚ کرد کە بەو جوٚرە بکـــات •

ـــ خەتـــی لیٚ کێشـــا :ـ

نوقلاٚنەی دوارۆژی بوٚ لێدا کە چی بوٚ دەبێت ، بەســـەر دێـــت •

خـەر ـ خەر میـــزە :ـ

خەر = بە فارسی بە کەر دەلێن •

واتا : چاو لێکەریەکی ، خوویەکی ناشیرینە ، بوٚ سووکی دەوترێت • وەك چوٚن لە کارواندا کەرێك کە میزی کرد کەرەکانی تریش لەو شوێنەدا میـــز دەکەن •

خـەر تـ خەرتو پەرت :ـ

کەرتو لەت ، پارچـە •

خەرِەك ـ خەرِەك دەرِێسێـت :ـ

خەرِەك = ئامێری رِستنو بادانەوەی رِێسراوەکەیە بـــە رِ قەوە بە یەکێك دەوترێت کە زوٚر بلێت ، درێژە بە قسە بـــدات •

خەرمان ــ خەرمان کوتان کاری بزن نییــە •
( فرمانی گران بە هەموو کەسێك ناکرێت )

خەریــك ــ خەریكو خەرکاوم مەکە :ــ
سەرم لێ مەستێنەو شپرزەم مەکە •

خەسانــد ــ خەساندوویانە :ــ
١ ــ لە هەرەو گیفو گوزەیان خستووە ٢ ــ لە پیاوەتییان خستووە ٣ ــ دەسەلاتیان بڕیوە ناوێری قسە بکــات ، ترساندوویانە ••

خەســوو ــ خەسوو بە لنگێ گا دەچێت :ــ
واتا خەسوو بۆ زاوا خێری زۆرە لەبەر خاتری کچەکەی خزمەت باش دەکات •

خەلات ــ خەلاتەکەی خالە بەگە ــ کەرەمی پیر تۆرکە ــ کەرەمی تۆ تۆرکە : خالە بەگ = پیاوێکی گەورەی بابان بووە ، سەرپەرشتکەری سوپا بووە • بە یەکێك ئەمە دەلێــــن خەلاتێك بکاتو خەلاتەکە بسێنێتەوە •

خەلــك ــ خەلك کاغەزی سپی دەخوێنێتەو ە:ــ
واتا : خەلك لە هەموو شتێك دەکولێتەوە ئاگاتان لە قسەو کردەوەتان بێــت •

خەلــك ــ خەلكو خواه :ــ
خەلكو ویستەرەکان ، خوازەکان •

حـــەم ـ خەمت نەبێـت :ـ
پشتی لێ بکەرەوە . دلنیابــە .

ـــ خەمخۆرە :ـ
١ ـ دلسۆزە ٢ ـ بارهەلگرە ٣ ـ بەتەنگەوە دێت .

خەمشە ـ خەمشەسەرێ :ـ
دەلێن : کارەکە خەمشەسەرێ دەکەیت . واتا : گوێــی نادەیتێو بەتەنگەوە نایەیت ، چەواشەی دەکەیت .

خەمــی ـ خەمی لێ هاتــووە : ـ
١ ـ سڵ دەکاتەوەو دەترسێت ٢ ـ سەری دنیای لێ هاتۆتەوە یەك ٣ ـ کارەکە بۆتە گرێ لە دلیدا .

خەنجەر ـ خەنجەر لە کا دەدات :ـ
بە تەنگەوە نایەت ، پشتی بە سامانو مالەکەوە نایەشێت بێ پارێز خەرج دەکات . تەخشانو پەخشان دەکات .

ـــ خەنجەری تریان لە برینی داوە :ـ
سەربارەی خەفەتی پێشووی ، تووشی داخی تریان کردووە

ـــ خەنجەری دەبانە خۆی لە کێلاندا ناگرێت :ـ
١ ـ بە کوڕی ئازا دەلێن کە لە تەنگانەدا فریا کەوێت .
٢ ـ ( بە یەکێك دەوترێت کە هونەرێکی هەبێتو لەپڕ دەری بخات ) ٣ ـ بە تەوسەوە بە یەکێك دەلێن کە لــە هەموو هەلوێــستێکدا خۆی قوت بکاتەوە .

ـــ خەنجەری لێ بدەیت ـ خوێنی لێ نایەت ـ بە خـــۆی نازانێت : ١ ـ رقی زۆر هەستاوە ٢ ـ پەستو خەفەتبارە. ئاگای لە خۆی براوە •

خـەو ـ خەوی پێوە دەبینێت :ـ
تامەزرۆیەتی ، ئاواتەخوازی ئەو شتەیە ، کوژراویەتـی •

خەیـاڵ ـ خەیاڵ پلاوە :
ئاوات خواستنی شتی باشە کە دەست نەکەوێـتو نەیگاتێ • بە یەکێك دەڵێن کە بەتەمای شتێکی ئەوتـۆ بێت بۆی نەلوێتو دەستی نەیگاتێ وەك پلاوێك کـــە هەژارێکی رەزەلخوا خەیالی بۆ لێ بدات •

خـــرت ـ خرتو پـرت :ـ
دلـە خورتـێ لە کارێکدا • دەلێن : دلــــم مەخەرە خرتو پـرت •

ـــ خرتو خۆل :ـ
قەلەوو خرو مرو جوان

ـــ خرتو مرت :ـ
( مەردومـیشلو مـل )

ـــ خرتو هوور :ـ
دەنگی برینەوە یا کرتاندنی شتێکی رەق بەلام بـە دەنگێکی بـەرز •

 

خـرم ـ خرمو هوورِ :ـ

دەنگی شکاندنی شتی ناسك وەك قامیش ، نانـی رەق ، شووشە • دەنگی باران • بەلاّم دەنگێکی بەرزی دیـار •

خرنـك ـ خرنكو هوورِ :ـ

دەنگی لەرینەوەو هارِەی خشلّو رازێنەری ئافرەت ، وەك بازن متو مووروو ، شتی تر بەلاّم دەنگێکی بەرزی دیـــار •

خـــرِ ـ خرِو خەپان :ـ

خرِو نەرمو شلو گۆشتـــن •

ــــ خـــرِو مرِ بووە :ـ

هاتووە بە خۆیداو جوان بووە • گۆشتی گرتووەو پێ گەیشتووە •

ــــ خـــرِو هوورِ :ـ

دەنگێکی بەرزی خولاندنەوەی شتێك •

خزمـــەت ـ خزمەتی داری پەلّك ـ بێبەر ـ دەكات :ـ

بە یەكێك دەلێن كە خزمەتی كەسێك ـ لایەك ـ بكات كەلّكبەخش نەبێتو رەنجەكەی بەفیرِۆ برِوات •

خـــزم ـ خزمی خەزووری سەپانی ـ مالّی شیخە ـ شێخیِیە :ـ

بە تەوسەوە بە خزمێك دەوترێت كە خزمایەتییەكەی زۆر دوور بێـــت •

خستی ـ ختیه پارسه‌نگی ئه‌وه‌وه :ـ
١ ـ وه‌ك ئه‌و ته‌ماشای كردو له ریزی ئه‌و دای‌نا •
پارسه‌نگی ئه‌وی به‌سه‌ر ئه‌م داداو ئه‌وی له پێشتر گرت

خستی ـ خستیه سه‌ر رێ :ـ
١ ـ فێری كرد ٢ ـ گومڕا بوو بوو ، هه‌له‌كانی
خسته به‌ر چاوی‌و ڕانومای كرد ، راستی كرده‌وه ، له
خراپه دووری خسته‌وه •

خشپ ـ خشپ‌و هووڕ :ـ
ده‌نگی پێ ، لێكه‌وتنی دوو شت به ده‌نگێكی
به‌رزی ئاشكرا • ده‌ڵێن : ئه‌و خشپ‌و هووڕه چی‌یه ؟
دز نه‌بێت !!؟

خلێنه ـ خلێنه‌و بلێنه ده‌كه‌ن ـ كه‌وتوونه‌ته خلێنه‌و بلێنه :ـ
بۆ پێكهێنانی كارێك به نهێنی كه‌وتوونه‌ته ته‌گبیرو را
سه‌ریان به‌یه‌كه‌وه ناوه •

خنج ـ خنج‌و خۆڵ :
قنج‌و قۆڵ = راست‌و ته‌واوو ڕێك •

خۆ ـ خۆ باشه‌واله نیم :ـ
یه‌كێك وا ده‌ڵێت كه فره كار بێت‌و ماندوو بێت‌و
یه‌كێكی تر كارێكی تری به‌سه‌ردا بدات ، داوای كردنی
كارێكی تری لێ بكات • واتا : له وزه‌مدا نییه‌و ماندووم•

ـــ خۆ بن مه‌مكی نه‌ڕزیوه :ـ

( کچەکە هێشتا منداڵەو پەلەی شووکردنی نییە )

خـــۆ ـ خـــۆ زەمانی عیساو مووسا نییە :ـ
به یەکێکی درۆزن دەوترێت • واتا راست ناکەیتو ئەو
زەمانە نییە کە درۆزن تێیدا رووی رەش دەبــــوو ،
درۆکەی دەر دەکەوت •

ـــ خۆ ماست نییە بە لیۆتەوە دیاربێت :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە نکوولی لە چاکەی ئەمو ئــەو
بکات یان لە قسەیەکی خۆی بکات •

ـــ خۆ نانی بەسەر ساجەوە نەسووتاوە :ـ
( پەلەی نییە ) •

خــوا ـ خوا پێ بەمار نەدات :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە زۆر خراپ بێت • واتا : خــــوا
دەستی نەدات ، ئەگینا بەدکاریی لە ئەندازە بەدەر دەبێت

ـــ خوا رۆژ نیشانی ماری ســـڕ نەدات :ـ
خوا رۆژ لە زۆرداری بارکەوتوو نەکاتەوەو دەسەڵاتی
نەبێت ئەگینا دەورو پشتی پەرێشان دەکات •

ـــ خــوا شوکور ئاغا رۆیەتی :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە بەسەرزاری شین بۆ یەکێك بکاتو لە
دلیشەوە پێی خۆش بێت یا بە سەرزاری بۆ یەکێك دڵتەنگی
پیشان بداتو لە دڵیشەوە پێی خۆش بێت •

خــــوا ــ خوا غەزەب لە مێروولە بگرێت بالی لێ پەیدا دەکات :ــ
چونکە هەر لەگەڵ فڕی بالندەیەك دەیقۆزێتەوەو دەیخوات
بە یەکێك دەوترێت کە بە دەستی خۆی خۆی بهاوێتــە
تووش‌و مەترسییەوە •

ــــ خوا کلاوی بۆ بەرۆو کردووە :ــ
واتا : پەك ناکەوێت‌و کار هەر ساز دەبێت • یان بـــە
یەکێك دەوترێت کە داوای یاریـــدەی لێ بکەیـــت‌و
بەدەنگتەوە نەیەت : دەڵێن : ئەگەر تۆیش نەبیت بەیارم ،
خوا دەسازێنێ کارم •

ــــ خـــواو راستان :ــ
١ ــ لە ناکاودا ٢ ــ خوا ڕەخساندی واتا : هیمەتی
خواو پیاوچاکان بوو لە ناکاودا ••
یان خوا ڕەخساندی •

خــــوار ــ خوارو خێچ :ــ
لارو ناراست ، بە پێــچ‌و پەنـــا • دەڵێـــن :
فیسارەکەس پیاوێکی خوارو خێچە • واتا : ناڕاستە

خــۆت ــ خۆت مەکوژە جەفتە :ــ
( بە یەکێك دەوترێت هەڵپەی شتــێك بکـــات‌و
لەراستیشدا نەیکاتێ ) •

ــــ خوت‌و خۆرایـــی :ــ
بە بێ هۆو هەر لەخۆوە •

خونـه ــ خوتەو بۆلە :ــ

خونەخون کردنو بێزاری دەربڕیــن

خــوڕ ــ خوڕو هووڕ :ــ

خوڕەیەکی زۆری ئــاو •

خورما ــ خورما لە بەغداش زۆرە :ــ

ئەو شتەی دەوترێت لێرە دەست ناکەوێت ، لە شوێنێکی تر گەر هەبێتیش بە ئێمە چــی •

ــــ خورمای بابی‌ی خواردووە :ــ

( بە یەکێك دەڵێن کە دەست لە بیرو بڕوایەکی هیــــچو پووچ هەڵنەگرێت )

خووساند ــ خووساندوویانە : ــ

نەرمیان کردووەو هێناویانەتە سەر ڕا • قایل بووە •

خــۆم ــ خۆمو دارێك وام لە شارێك :ــ

( ئەرکی کەسم بەسەرەوە نییەو لە هەر لایــەك دانیشــم دادەنیشم )

خومخانە ــ خومخانە نییە ــ بۆچ خومخانەیە ؟

بە یەکێك دەوترێت کە لە کارێکدا پەلەت لێ بکات • واتا: وا زوو تەواو نابێت • کار لە خومخانەدا ئاسانە ، بەنەکە لە خومەکە هەڵدەکێشیتو ڕەنگ دەبێت •

خـــوم  خوم ــ شێواوە :ــ

١ ــ ئاژاوه کەوتۆتـەوەو هـــەرا قەومـــاوە
٢ ــ ( بریتی‌یە لە بڵاوبوونەوەو بیستنی درۆیەکی زلـی دوور لەژیری‌و بیر ، لە کاتێکدا درۆیەکی زل بڵاوبێتەوە دەڵێن خوم شێواوە ) •

ــ خومی دنیا بەسەری :ــ
واتا لە بارێکی ناتەواودایەو خراپی لێ قەوماوە ، تووش بووە چی بکات • جارانی زۆر زوو یەکێك کوســـتی بکەوتایە خومی شینی لەسەر دەدا • ئێستەش هەندێك دایك بە منداڵە لاسارەکەی دەڵێت : سەرت شین کەیت یـــا سەرشین بۆ وا دەکەیـت •

خــۆی ــ خۆی بردە ئەوپەڕی دنیا :ــ
واتا : خۆی وا پیشان دا کە هیچ ئاگای لە کارو بار نییەو هیچی لێ نازانێت •

خــۆی ــ خۆی بردە پێشــەوە :ــ
خۆی خۆشەویست کرد ، دۆستایەتی‌ی خۆی نیشان دا ، بە کردەوە ، بە قسە لەلای یەکێك کاربەدەست بێت ، کە هیوایەکی پێ بێت •

ــ خۆی بە تڕاندن دا :ــ
هەر کارێکی کرد ئەنجامەکەی بۆی خراپ بـــوو •
شەڕی کرد لێیان دا ، کاسبی کرد بەر زیان کەوت ••هتد

ــ خۆی بەزەویـدادا :ــ ،

١ ــ نوست ٢ ــ مانی گرت

ــ خۆی بە قەلبەیەکدا دەدات :ــ
خۆی تووشی دەردیسەرییەك ، گاشەیەك دەکات •

ــ خۆی بە کەس نادات ــ ناگۆڕێتەوە :ــ
خۆی لە گشت کەس بەتواناتر ، جوانتر ، تەواوتـــــر
دەزانێت •

ــ خۆی بە گورگانخواردوو دا :
بە یەکێك دەوترێت کە بەدەستی خۆی خۆی تووشـــــی
بەلایەکی گەورە بکـــات •

حـــۆی ــ خۆی بەوەوە بەست :ــ
چارەنووسی خۆی بە هی ئەوەوە ،ئەو شتەوە بەند کرد

ــ خۆی بە هۆشەنگ شا نادات :ــ
هۆشەنگ شا = یەکێکە لە شا کۆنەکانی ئێران • واتا :
خۆی لە هەموو کەس بە باشترو گەورەتر دەزانێـــتو
بڕوایەکی زۆری بە خۆی هەیە •

ــ خۆی بۆ ناوەتەوە ــ بۆ هەڵخستووە ــ بۆی لە بنەدایە :
واتا : چاوەڕێی هەلە ١ ــ شتێکی دەســـگیر بێـــت
٢ ــ کەوتۆتە چاودێری ٣ ــ یەکێك لایەك تووش بکات

خۆی پێدا هەڵواسیوە :ــ
خۆی وا پیشان دەدا کە سەر بە یەکێکە ، بە لایەکـــەو

خۆی لەو کەسە ، لەو لایە نزیك کردۆتەوە •

— خۆی تاڵ ـ گۆشتی خۆی تاڵ ـ کردووە :ـ
چارەی خۆی ڕەش کردووە ، خەڵك خۆشی ناوێت •

— خۆی تەکانـد :ـ
داوای پارەیان لێ کرد ، بۆ باربوو ، بەرتیل هەر شتێکی تـر ، دای •

خـۆی ـ خۆی تێ وەشاند :ـ
بەرتیلی دا ، پارەی بۆ رزگاربوونی لە گرفتاریەك دا • یان جێبەجێ کردنی کارێك بە ڕێگەیەکی نهێنـی ، ناتاسایی •

— خۆی تێ هەڵسـوو :ـ
لێی نزیك بووەوەو خۆی کرد بە دۆستیو مەرایی بـۆ کـرد •

— خۆی خـڕ هەڵداوە :ـ
خۆی گورجو ئامادە کردووە •

— خۆی خستە ساجی عەلی :ـ
بە یەکێك دەوترێت هەرچی بوویێت لە بەردی دایێـتو نابووت بوویێت • ئایا دەبێت ئەو کەسە خۆی وا نابووت کردبێتو کەوتبێتە سواڵ بە ناوی حەزرەتی عەلییەوە ؟؟

— خۆی خواردەوە :ـ

داخەکەی پەچنییە دلیەوەو پیشی خـــواردەوەو قـەی نەکرد •

— خـۆی داکوتـا :
خۆی دامەزراند ، جێی بۆ خۆی کردەوە لە نـــان خواردندا ، لە شایدا •• هتـــد

حـۆی ـ خۆی دانـا :ـ
خۆی فەوتاند ، خۆی بەکوشت دا •

— خۆی رادەوەشێنێت ـ بادەدات ـ بەسەر ئەم و ئەودا •
١ ـ گەنجەفە دەکات ، شانازی دەکات ٢ ـ هەڕەشـــە دەکـــات •

— خۆی رێژگاو دەکـــات :ـ
خۆی سووك و ڕسوا دەکات • خۆی دەکاتە گالتەجـاڕی ئـەم و ئـەو

— خۆی ریشی نییەو بە کۆستە پێدەکەنێت •
( خۆی عەیبدارەو لە خەڵك دەدوێت و عەیب لە خەڵـك دەردەهێنێــت ) •
— خـۆی سوور کردەوە :ـ
تووڕە بوو ، خۆی گیف کردەوە •

— خۆی شیرین کـــرد :ـ
بە هەڵس و کـــەوت و قـــــەی جـوانی خـۆی خۆشەویســت کـــرد •

— خۆی ـ کەر ـ گێـل کـرد :ـ
بە یەکێك دەڵێن بانگی بکەن ، پرسیاری لێ بکەن وەڵام نەداتەوە ۲ ـ کردەوەیەکی نابەجێ ، ناشیرین بکـات

خـۆی ـ خۆی کێشایەوە :ـ
۱ ـ وازی لە کارەکە هێنا ۲ ـ بۆ سووکی دەوترێت واتـا مـرد

— خۆی گەیاندە حالی جاو :ـ
( خۆی خستە حاڵی گیانەڵاوە ) • حالی جاو = حالی بڕینی جاو بۆ کفنـی •

— خۆی لە تەل داوە :ـ
خۆی رازاندۆتەوە ، بە جل ، بە ئارایشت ، بـە خشل • خۆی رێکخستووە •

— خـۆی لە مەکۆ داوە :ـ
مەکـۆ = حەشارگە • واتا : خـۆی خـستۆتە حەشارگەوەو خۆی بۆ شتـێك ناوەتەوە •

— خۆی لەوەوە ـ لێوە ـ ئاڵاند ـ پێچاوە ـ
۱ ـ خۆی تووشی ئەو کرد ۲ ـ خۆی بەودا هەڵواسی

— خۆی لێـدا :ـ
۱ ـ زیانی پێ گەیاند : ۲ ـ شتەکەی دەست خۆی خست ، چنگی پێدا گرت ، داگیری کرد •

— خۆی لێ دەخواتەوە :ـ
رقی لێ هەستاوەو دانی بە خۆیدا گرتووە چاوەڕێی
هەلە داخی دڵی خۆی پێ بڕێژێت •

— خۆی لێرەو کلکی لە بەغــدا تۆزە دەکات :ـ
( بە یەکێکی بزێوی نارەحەت دەوترێت کە هەمیشە هەر
ئاژاوە بنێتەوە ) • لە هەموو شوێنێك رەشیی دەستــی
دیار بێــت •

خــۆی ـ خۆی لێ کرد بە تووڵبر :ـ
واتا : ( بە دیمەن بە شتێکەوە خەریك بوو ، بە دڵیــش
لە لای ئەوان بوو ، گوێــی بۆ هەڵخستبوون بزانێت چی
دەڵێن )

— خۆی لێ کردووین بە هەناری شیرین ـ هەنگوینی شەمە
تلێنکە :ـ
واتا : زۆر خۆی خۆشەویست کردووە •
— خۆی لێ کردووین بە بوخچەی پەڕۆ ـ بە شەخســـە
پەڕۆ :
واتا : ( لە سەرماندا بەرگی چڵکن و دڕاوی زۆری لەبەر
کـــردووە ) •

— خۆی نەیکات و خــودا بیدات :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لەلاوە کارەکەی بۆ سازبێت ، قازانج
بکات ، خێرێکی دەستگیر بێت ، بە بێ ئەوەی کۆششی
بــۆ بکــات •

ـــ خـۆی هەڵخراند :ـ
بۆ کارێك خۆی ئامادە کردو چووە پێشەوە خۆی نواندو
لەوزەیشیدا نەبوو •

خـۆی ـ خۆی هەڵتراند :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە هاشەو هووشە بکاتو کەچی
ئەنجامی کارەکەی هیچ دەرچێت ، بۆ خۆی خراپ بێت •
پەلاماری کارێك بدات لەوزەیدا نەبێت •

خۆیـان ـ خۆیان دیوە بە ئەسپەوەو بە جانتای پڕ لە قەسپـەوە :
بە یەکێك دەڵێن کە کرداری یەکێك بکات کە لە خـۆی
گۆڕابێت ، بە سامان ، بە پایەیەك ، بێت کە لە پڕ بـۆی
بووبێت ، بە هەر شتێکی تر بێتو لەوەپێش ئـــەوەی
نەبووبێـت •

خوێـن ـ خوێن پڕ چاوی بووە :ـ
دەماری وا هەستاوەو رق گرتوویەتی لەوانەیە خوێنێـك
بکات • چاوی سوور بووە •

ـــ خوێـن تـالـە :ـ
ناخۆشەویستەو دەبێزرێت • رەزا تاڵە

ـه خوێنخۆرە ـ خوێنمژە :ـ
خوێنرێژە ، زۆردارە ، ئـەمو ئـــەوو هـــەژاران
دەچەوسێنێتەوە •

— خوێن ڕژاوەتە دەم‌و چاوی :ـ

تەریق بۆتەوە ، شەرمەزار بووە

— خوێن ســاردە :ـ

١ـ هێمنەو زوو هەڵناچێت ٢ ـ سستەپەلەیە .

خوێن ـ داوێتیە کەللەی :ـ

واتا دەماری هەستی ( اعصاب ) هەستاوەو خەریکە

کەللەیی ، شێت دەبێت ، لە داخا ، لە تاو شتێك

— خوێن شیرینە :ـ

خۆشەویستە ، دەچێتە دڵەوە ، جوانە

— خوێن کوژاندنەوە :ـ

نەهێشتنی ئاژاوەو فیتنەیەکی گەورە کۆتایی هێنان

بە قەوماوێکی پڕ لە مەترسی‌ی خوێن ڕژاندن

— خوێن گەرمــە :ـ

١ ـ ڕەزای سووکە ، خوێن شیرینە ، دەچێتـــە

دڵەوە ٢ ـ گەنجێکی بە هەڵمەتە ، مـــەردە ٣ ـ زوو

هەڵدەچێت .

— خوێـن گرتـی :ـ

چاوی بە خوێنەکە کەوت حەپەسا ، سام گرتی‌و قەڵەمـێ

ئەژنۆی شکا ، نەیتوانی بڕوات ، ورەی بەردا .

— خوێنگریەتی :ـ

کەسی زۆر نزیکیەتی ، وەك ، باوك ، براو خوشك‌و

ئامۆزا کە بتوانێت تۆڵەی کوژراوەکە بکاتەوە

— خوێن لە بەدەنیا نەماوە :ـ
١ ـ لاوازو بێهێنـر بووە ٢ ـ ترساوە

خوێـن ـ خوێن لە دڵی دەتکێت ـ خوێن داوێتیە کەللەی :ـ
داخێکی زۆری هەیە ، لەسەر قەوماوێك ، قسەیەك کـە
ڕووی دابێت • مەراق کوشتوویەتـــی • وەك دڵـــی
بریندارێت •

— خوێنی ـ بابردی ـ ون بوو :ـ
خوێنی بە هەدەر چوو ، لە خۆڕایی کوژرا ، کەس نەبوو
تۆڵەی بسێنێت •

— خوێنی بخواتەوە ئۆخەی ناکات :ـ
هێندە ڕقی لێیەتی بە خوێنی سەری تینووە • •

— خوێنی بۆ گەڕێ دەشێت :ـ
( بە یەکێکی چەتلەمەزی پیسی بۆگەنی نالەبار دەوترێت )
واتا : خوێنی زۆر پیسەو پیسیش بە پیسییەوە دەڕوات

— خوێنی تۆ لە خوێنی من ڕەنگینتر نییە :ـ
هەردوکمان چون یەکین ، لەیەك زیاترو جوانتر نین •

— خوێنی قولپ دەدات :ـ
زۆر جوانو ئێسك سووکە ، خوێن گەرمە •

ـــ خوێنی کردە کاسە :ـ

تاوانێکی خستە پاڵیو لایەکی لێ هاندا • (ڕەشکردنـی یەکێك لە لایەکی یەکێکی تر بەجۆرێکی خراپ )

خوێـن ـ خوێنی هەستاوە :ـ

زۆر تـووڕە بووە ، دەمار گرتوویەتی غیـرەتـی جووڵاوە •

خیـز ـ خیزو هوورِ :ـ

خیـزە = دەنگی سنگی گیراو

واتا خیـزە خیزێکی زۆر •

خێـل ـ خێلو خـوار :ـ

خێلەو خوار دەبینێـت •

# د

دا ـ دا بـوو :ـ

بەزی ، ملیدا ، سەری شۆڕ کرد ٠ بۆ سووکیی ئەو کەسە وای پێدەوترێـت ٠

ـــ داکەوتووە :ـ

١ ـ پیربووە ٢ ـ گۆشتەکەی شل بووەو لەوەپێش قەڵەو بـووە ٠

— دای دەدۆشـــن :—

شتی لێ دەپچڕنو دەماشنەوە لاسیان داوە ، کردەی ئەوەو بردەی ئەوانە بۆ سووکی وای پێ دەڵێن

داران — داران لە دوورەوە سەریان زەتێرە × نازانن ژێرەکەی هەر گاوو گوێـــرە :—

واتا : کێ چووزانێت دلی ئەو چی تێدایە ، چی لێ قەوماوە با بەسەرزاریش پێ بکەنێت ، رۆوی خــــۆش بنوێنێت .

دار — دار بە پوازی خۆی — دەشکێت — دەقلیشێت :—

( واتا : بە هۆی خزمی خۆیەوە دوژمن دەستی گەیشتێو زیـانی پـێ گەیانـد )

— دار بە کونی زەردەواڵەدا دەکات :—

( ئاژاوە دەنێتەوە ، فیتنە بەرپا دەکات )

— دار ترەکیو بەرد ترەکی ئەو نەترەکی :—

١ — بە ژنێك دەڵێن کە لەسەر دەستان بێتو منداڵەکەی لێ نەبێتەوە ٢ — بە یەکێك دەڵێن کە دەمی خۆی دابدروێت نقە لەخۆی ببڕێت لە کاتێکدا رووی دەمی تێ بکرێت ، بۆ ئەوەی ، لە مەبەستێکدا وەڵام بداتەوە ، دەبێژرێت : دار ترەکیو بەرد ترەکی کەچی ئەم نەترەکیو نەهاتـــە گوفتار .

دار — داری — دەسکەلای — مەقاشی — کوتەکی — داردەستی ئەمو ئەوە :—

پیاوی ئەمو ئەوەو خراپەی پێ دەکەنو دەیچەوسێننەوە

ـــ دار له جێی کول دەژێت :ـ
( به یەکێك دەڵێن که یەکێك هان بداتو دڵی بکولێنێتەوه)

ـــ دار لەگەڵ تۆمه دیوار تۆ گوێت لێ بێت ـ بووکــێ لەگەڵ تۆمەو خەسوو گوێت لێ بێت :ـ
قسه بۆ یەکێك دەکەن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ، سا یا ناوێرن راستەوخۆ پێی بڵێن ، یان پارێز دەکەن ، یان لەبەر هەر هۆیەکی تــر ٠

ـــ دارو باری وەهای نیه ـ بێ دارو باره :
یەك بایه ، ئێسکی باریکەو بەهێز نیەو لەڕە ٠

ـــ دارو پەردوو :ـ
پەردوو = چیلکەو چەوێلی ســـەر خانــوو
واتا : دارو چیلکەو چەوێلی سەر خانوو ٠

دار ـ دارو دیوار گوێی هەیه :ـ
له کاتی مەترسیدا ئەوه دەوترێت به یەکێك بــێ پەرواو پارێز قسه بکات ٠ واتا : ئاگات له دەمت بێت بــا تووش نەبیــت ٠

ـــ داری بەرۆحیدا داوه :ـ
تووشی سزاو گاشەیەکی سەختی کردووه ، تووشی زیــانی کردووه ٠

ـــ داری بەسەر بەردیەوه نەماوه ـ هەردی بەسەر بەردیەوه

نەمـاوە :ـ
١ ـ کاول بووە ٢ ـ تێك و پێك دراوەو هیچـــی
بەسەر هیچەوە نەماوە ٣ ـ پەرش و بڵاو بۆتەوە

ــــ داریبـۆ کـرد :ـ
١ ـ تۆڵەی لێ سەند ٢ ـ تووشی چورتومێکـــی
کـرد ٠

ــــ داری دەستیەتی :ـ
هەموو کارێکی بەو دەکرێت و بەبێ ئەو پەکیەتی ٠

ــــ داری سواڵی دایە دەســت :ـ
١ ـ نابووتی کرد ٢ ـ هەژاری خست ٠

ــــ داری نەرمە ـ دارو باری نەرمە :ـ
١ ـ ( مەردوم کە زەبوون بوو هەموو کەس چاوی تــێ
دەبڕێــت )
٢ ـ بە هێز نییەو کەم توانایە

دار ـ دارێکی بەدەستەوەیە هەردوو سەری پیسە :ـ
کەوتۆتە هەڵویستێکەوە دەری بەهیچ لایەکدا نەبێــت و
کارەکەی بۆ چار نەکرێت ٠

ــــ دارێکی تــێ دەبڕێــت :ـ
تووشی چورتومێك و سزایەلی ئەوتۆی دەکـــات
پێوەی بتلێتەوە ٠

ـــ دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە تاوانێك ، گوناهێك ، خراپەیەکـــی کردبێت ، تۆیش باسی شتێك بکەیت کەچی ئەو لەوێوە بیباتە سەر خۆی ، یان قسەیەك بکات نیشانەی ئەوەبێت •

داخ ـ داخـی کـرد :ـ
تووشی سزا ، خەفەت زیانێکی گەورەی کرد ، تەمێی کرد

داماڵرا ـ داماڵـرا :ـ
١ ـ هەژارکەوت‌و نابووت بوو ٢ ـ گۆشتی پێوە نەمـا ، لـەڕ بـوو •

دامێـن ـ دامێنی ـ چاکی ـ بەلادا کرد :ـ
خۆی گورج کردەوەو خۆی بۆ کارەکە ئامادە کرد •

دانـە ـ دانە ریچەی پێ کەوتووە :ـ
١ ـ زۆر لاواز بووە ٢ ـ لە گیانەڵادایە •

دان ـ دان لە سنگی هاتووە :ـ
( بە یەکێکی فێڵبازی زۆرزان دەوترێت )

دانـو ـ دانوویان پێکەوە ناکوڵێت :ـ
( بە دوو کەس دەوترێت کە هەمیشە دژی یەکتر بـن‌و پێکەوە هەڵ نەکەن ) ناتەبا بن ( لە سروشتدا لەیەکەوە دووربـن )

دانیان ـ دانیان لەیەك سپی بۆتەوە :ـ

سیوایان له یەك هاتۆتەوەو قسه له یەك ناخۆنەوەو سامیان
له یەك شکاوەو شەرم لەیەك ناکەن •

دانــی ــ دانی به خۆیدا گــرت :ــ
١ ــ ئارامی گرت ٢ ــ بەرگەی گرت ٣ ــ چاوەڕێی کرد •
ــــ دانی پێــدا نــا :ــ
١ ــ سەلماندی‌و بەراستی زانی ٢ ــ بڕیاری لەســەر دا
٣ ــ پێی لێ نا ، چووە ژێــری •

ــــ دانی لێ تیژ کردووە ــ مرخی لێ خۆش کردووە ــ چاوی
تێ بڕیــوە :ــ
١ ــ نیــازی خواردنی هەیــە ٢ ــ نیــازی داگیرکردن‌و
دەست بەسەردا گرتنی هەیــە •

داو ــ داوم له داوی ــ له داویەوە ــ ئالأوە :ــ
تووشــم به تووشیەوە بووە ، گرفتاری بووم

ــــ داوم له داوی نابێتەوە :
دەستی له یەخەم نابێتەوە ، بەرۆکم بەر نادات ، رزگارم
لێی نابێت • وازم پێ لێ ناهێنرێت •

ــــ داوی بۆ ناوەتەوە :ــ
تەڵەی بۆ ناوەتەوە ، پیلانی بۆ ڕێك خستووە تووشــی
بکــات •

داوی دامەزراوە :ــ

١ ــ شووی کردووه ٢ ــ لەسەر کارێك جێگیر بــووەو دامەزراوە •

داوێــن ــ داوێــن پاکــە :ــ
توخنی زینا ناکەوێــت ــ مرۆڤێکی ساغە

ــــ داوێــن پیسە ــ شەرواڵ پیسە :ــ
بە دوای زینادا دەگەڕێــت •

ــــ داوێــن داتەکاوە :ــ
ژنەکە وەجاخ کوێرە ، بێ منداڵە •

دایــە ــ دایە پــاڵ خۆی :ــ
١ ــ پاراستی ٢ ــ کردی بە هی خۆی ٣ ــ پێی لێ ناو خۆی تاوانبار کــرد •

ــــ دایە کێو :ــ
١ ــ یاخی بوو ٢ ــ شۆڕشی بەرپا کرد ٢ ــ شێت بــوو •

دایــەوە ــ دایەوە بە چاویــدا :ــ
منەتی ئەو چاکەیەی بەسەردا کرد کە لەگەڵی کردبــوو ، بەو چاکەیە خۆی بەسەردا بادا •

دەبێت ــ دەبێت هەر بڵێت ساباڵاخیمو بیر باخم وار :ــ
واتا هەزار هاوارو کۆششی بە پوولێك ، دادی نادات •

دەچێت ــ دەچێتە دڵەوە :ــ

دەرد ــ دەردە گایــه :ــ
یەکێك وا دەڵێت که ببینێت ۱ ــ له ماڵێکدا زۆریــــان
نەخۆش کەوتوون ، بۆ گاڵتـــــــه ، داخ ، بۆ تــەوس
دەوترێــت ۲ ــ چەند کەسێك گرفتاری نالەباریەك ببن •

ــــ دەردی دڵ بۆ ژێــر گــڵ :ــ
واتــا : ئەوەی له دلدایه ، ئاوات ، خەفەتو ناســـۆر ،
بەکەس ناڵێم ، باهەر خۆم بیزانم ، تا مردن ، نایدرکێنم

دەرزی ــ دەرزی هەڵدەیت زەوی ناکەوێت :ــ
چڕو جەنجاڵێکی زۆرە ، قەلەبالغێکی بێشوومارە •

دەرك ــ دەرکی ــ دەرگای ــ بە قوڕ گیرا ــ هەڵپێچرا : ــ
۱ ــ ماڵی وێران بوو ۲ ــ کەسی نەماو قڕیان تێ کەوت
۳ ــ جاران یەکێك بمردایه چەند پێخوێیەك قوڕ لەبــەر
دەرگا دادەنرا بۆ ئەوەی کەسوکار ، یا سەر بە مردووەکە
بەسەر خۆیدا بدات سەری بۆ له قوڕ بنێت •

ــــ دەرکی ــ دەرگای ــ مۆر کرا :ــ
خاوەن ماڵ که مرد میری ، تا بەشی میراتگرەکان یان هی
خاوەن قەرزەکان ــ ئەگەر ئەو مردووە قەرزار بێــت ــ
نەزانێت ناهێڵێت دەست بۆ ماڵی مردووەکه ببرێت دەستی
بەسەردا دەگرێت • دەڵێن : دەرگای مۆر کرێت واتــــا
بمرێــتو میری دەست بەسەر ماڵەکەیدا بگرێتو بەش

بەشــی بکات •

دەرگــا ــ دەرگا کوتــە :ــ
خوێڕی‌یە ، مالآنگەڕە •

ـــ دەرگاو دوو تــرە :ــ
مالآنگەڕە ، واتا : لە هەر دەرگایەکدا دوو تر بکەتێــــت
چەندە ئەوەندە دەمێنێتەوە •

دەروون ــ دەروونی ڕەشــە :ــ
ناپاکە ، بەدە ، مرۆڤێکی دەروون پیسە •

ـــ دەروونی هاتە جۆش : کوڵ :ــ
١ ــ سۆزی جوولآ ، دەروونی هەستا ٢ ــ بەزەیی بزوا
٣ ــ پیاوەتی‌ی جوولآ •

دەرهاتوو ــ دەرهاتووە :ــ
لە ژیاندا ، لەو کارەدا تەواو قاڵو شارەزا بووە •

دەریــا ــ دەریا بە دەمی سەگ ــ چەپەڵ ــ پیس ــ نایێت :ــ
( ئەگەر یەکێکی دەم پیس ، بێ ئابڕووی نارەسەن بــە
بێ گوناح قسەی ناشیرین بە یەکێك بڵێت ، بۆ ئەوەی
ئەم یەکە دلگیر نەبێتو وەلآمی ئەو نەداتەوە ، بـــۆ
دلخۆشی دانەوەی پێی دەڵێن دەریا بە دەمی سەگ پیس
نایێــت ) •

.مزانێت ــ دەزانێت چەند موو بە قنگیەوە هەیە :ــ

واتا : دەزانێت چی لە باردایە ، هەموو هەستو نەستێکی ، دەزانێـــت •

دەزانێت ــ دەزانێت خۆر بەری بە کوێوەیە :ــ
قالی رۆژەو هەبستو نەستی هەموو شتێك دەزانێت

ــــ دەزانێت شان لە کوێوە دەخورێت :ــ
واتا : مرۆڤێکی بەرخۆرە •

دەزوو ــ دەزووی وشك دانیەتی :ــ
( واتا هەرچی لەبەردایە تەڕە )

دەست ــ دەست بلاوە :ــ
پاشەکەوت نازانێت ، هەرچی دێتە دەستی خەرجـی دەکـــات •

ــــ دەستە ئەژنـۆ دانیشتووە ــ دەستە ئەژنۆیە :ــ
١ ــ نائومێدە ، ژیانی لەبەر چاو تاریك بووە ٢ ــ بێکارەو دەست بەتاڵە ٣ ــ پەکی کەوتووە سا یا لەبەر نەخۆشـی یا لە هەژاریدا ، یا لەبەر هەر هۆیەکی تـر •

ــــ دەستە چەورەکەی خۆی بەسەر مەردمدا دەسوێت گوناهو تاوانەکەی خۆی پاڵ یەکێکی تر دەدات •

ــــ دەستە شکێنـم مەکـە :ــ
(بەڵێنەکەت بەرە سەر) پەکم مەخەو مەمخاێنە

دەستە ـ دەستەو سانە :ـ

بێ دەسەڵاتە ، بێ توانایە ، دەستە پاچەیە

ـــ دەستەو کەمەر وەستاوە :ـ

بێ دەربەسە ، دوورەپەرێزە توخنی کارەکە ناکەوێت وەك هی ئەویش نەبێت وایە

ـــ دەستەو یەخە ـ دەستەو بەرۆك ـ بوون :ـ

دوژمنانە روو بە رووی یەك بوون ، بە گـژ یەکـــدا چوون

دەستبان ـ دەست بانی دەبێت فرەس ـ دەست باڵای دەستە :

لە زوور هەموو خاوەن پیشە ـ پایە ـ یەکەوە یەکێکی وا هەیە کە گەلێك لەو شارەزاتر ـ بەرزتر بێت لە پیشە ، لە پایەدا •

دەست بە ـ دەست بە تالـە :ـ

١ ـ کاری نییە ٢ ـ بوارەی هەیە

ـــ دەست بە دەمی شێردا دەکات :ـ

دلێرە ، چاو نەترسە

ـــ دەست بە دەمی سەگدا دەگات :ـ •

( زۆر جەربەزەو بێ حەیایە )

ـــ دەست بە سەرە :ـ

١ ـ دیلە ، لە ژێر چاودێریدایە •

داگیر کراوه ( بۆولات )

— دەست بە قلپە :—
هەرچی ئازۆخە ، شتێك ، یان هەیە دەیەوێت بەجارێـك بە رۆژێك ، کاری بکات ، بیر لە دوارۆژ ناکاتـەوە • شت بە ئەندازە ناکات •

دەست — دەست بخەرە دەمیەوە بزانە دەیگەزێت ؟
بە تەوسەوە دەوترێت • واتا : وا بەستەزمان نییە وەك تۆ تێی گەیشتویت ، بەڵکو زۆرزانە •

— دەست پاکە :—
جێی بڕواو متمانەیە ، ناپاکی ناکات دز نییە •

— دەسـت پیسـە :—
دزە ، ناپاکەو متمانەی پێ ناکرێـت •

— دەست پێشخەرە :—
گورجە ، زووتر کارەکە دەکات ، فریا دەکەوێت •

— دەست درێژە :—
ناپاکە ، زۆردارە ٢ — تەماعکـارە ٣ — بووەیـە ٤ — بەدەسـەڵاتە •

دەست — دەستت هەتا بە هەنگوینە دەیمژێت کە نەما دەیگەزێت :
واتا : مرۆڤێکی سپلەی پێنەزانە •

ــــ دەستت بە کەوگیرەو چاوت لە فەقیرە :ــ
واتا : کارت بە دەستەو ئاگات لێمان بێت ، مشوورمان بخــۆ •

دەستخەت ــ دەست خەتی نائومێدیی دایە دەست :ــ
پێی ڕاگەیاند کە کارەکە ناکرێتو چاوەڕێ نەبێت •

دەست دەست ــ دەست دەست دەناسێت :ــ
واتا ( شتێکت کە لە یەکێك خواست دەبێت بیدەیتــەوە دەست خۆی ) •

دەست راست ــ دەست ڕاستە :ــ
نیشانشیکێنە • تفەنگچییە •پێچەوانەکەی دەســــت خوارە ، یان دەست چەوتە واتا نیشانە ناپێکێت •

دەست رەنگین ــ دەست رەنگینە :ــ
خاوەن بەهرەیە ، بەهرەوەرانە گەلێك پیشەی بەکەڵك دەزانێت •

دەست ڕۆییو ــ دەست ڕۆیوە : ــ
١ ــ دارایە ٢ ــ بە دەسەڵاتو توانایە

دەست سپی ــ دەست سپییە :ــ
هیچ پیشەیەك نازانێت کە پێی بژی

دەست ــ دەست کار دەکاتو چاو دەترسێــت :ــ
واتا : مەترسەو کار بکە ، هەر سەردەکەویت • بــــۆ

هانـدانـه ٠

دەست کورت ــ دەست کورتە ــ دەست تەنگە ــ کەم دەستە :ــ
هەژارە ، نەدارایــە ٠

دەست لە ــ دەست لە گونان درێژتر گەڕایەوە :ــ
بە نائومێدی گەڕایەوە ، هیچی دەست نەکەوت ٠ پیـاو
کە هێچی بە دەستەوە نەبێت دەستی بەرەڵا ، لەملاو لەو
لای لە شیەوە دەبێت ٠

دەست ــ دەست نادات :ــ
١ ــ ناگونجێت ٢ ــ بەو نرخە کەمە نافرۆشرێت ٠

دەستو ــ دەستو پێوەند :ــ
نۆکەرو کەنیزەکو کارەکەر واتا : ئەوانەی دەستی
ئەون ، پێوەندی ئەویان لە پێدایە پێوەندەکەش ئـــەو
پەیوەندییەیە کە لە نێوانیاندایە ٠

ـــ دەستو دەمی پێوە دەخورێت :ــ
خواردنەکە زۆر خۆشو بە چەشە ٠

ـــ دەستو بـرد :ــ
گوزرج ٠ واتا دەست هێنانو بردنی شتەکە ، جێبەجێ
کردنی کارەکە یەك بـوو ٠

دەستیان ــ دەستیان بڕیوە :ــ
١ ــ دەسەڵاتیان نەهێشتووە ٢ ــ هەڵیان فریواندووە،

به هەڵەیاندا بردووە ، فێڵیان لێ کردووە •

دەستیان ــ دەستیان چۆتە خوێنی یەکترەوە :ــ
لە یەکتریان کوشتووە ، خوێن کەوتۆتە بەینیانـــــەوەو بوونەتە دوژمنی یەك ، خوێنەخوێی یەکتر

دەستی ــ دەستی ئەسپت درێژبێت :ــ
( بە تەوسەوە ، سوپاسی یەکێکی پێ دەکەیت کە نـاوی چاکەی خۆی بیات بەسەرتەوە )

ــــ دەستی ئەوی پێوە دێـنـت :ــ
١ ــ بەهۆی ئەوەوە چاکەو خێرىی تووش دێت ٢ ــ سەر دەکەوێت ٣ ــ چاك دەبێتەوە •

دەستی بـڕی ــ دەستی بەزاخدا کـرد :ــ
١ ــ لە خشتەی برد ، دەستخەڕۆی کرد ٢ ــ هەڵـــــی فریواند ٣ ــ تەفرەی دا •

ــــ دەستی بە فیـسار کەسەوەیە :ــ
واتا هەمیشە یاریدەی دەدات و باربووی دەکات •

ــــ دەستی بە ئاو گەیانـد :ــ
چووە سەر ئاودەست • چووە سەر پێشاو •

ــــ دەستی بە پەلەکەی هەور بگات ــ دەست بە پەلەکـەی هەورەوە بگرێـت :ــ
واتا هەرچی کردەو کۆششێك بکات بێ ســـــوودە

دەڵێن : دەستی بگاتە پەلەکەی هەور تۆڵەی خۆمی لێ دەکەمەوە ، یان ئەو شتەی نادەمێ •

دەستی ــ دەستی بە دەستدا دا :ــ
پەشیمان بۆوە ٢ ــ داخی خوارد ، ژان چووە دڵیەوە •

ــــ دەستی بەڕووەوە نا ــ رووی شکاند :ــ
١ ــ شتەکەی نەدایە ٢ ــ کارەکەی بۆ جێبەجێ نەکرد
٣ ــ دەری کرد •

ــــ دەستی بەستەوە ــ دەستو پێی بەستەوە :ــ
١ ــ دەرفەتی بڕی ٢ ــ لەکاری خست ، دەسەڵاتی بڕی
٣ ــ دەستخەڕۆی کرد •

ــــ دەستی بە سەردا گرت :ــ
داگیری کرد ، بۆ خۆی برد • لە خۆی بەولاوە ناهێڵێت کەس کەڵك لەو شتە ببینێت •

ــــ دەستی بە کڵاوەکەی خۆیەوە گرتووە با نەیبات :ــ
١ ــ تەریك‌و بێ لایەنە ٢ ــ بە پارێزەو دوور ئەندیشی دەکات •

دەستی ــ دەستی بە ماڵی خۆیەوە نا :ــ
١ ــ ( دەستی کرد بە خەرجکردن بە زۆری ) ٢ ــ بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە پارەیەکی کەم خەرج بکات ،

شتێکی کەم یا بێ‌نرخ بە یەکێك بداتو وای پیشان بدات کە شتێکی گەورەی کردووە •

— دەستی پاراست :ـ

١ ـ سڵی کردەوە ٢ ـ بە پارێزەوە جوولاّیـەوە ، کارەکـەی کـرد •

— دەستی پان دەکاتەوە :ـ

دەرۆزە دەکات ، خوازلۆکە •

— دەستی پێوە دەلەرزێت :ـ

دڵی نایەت ئەو شتە کار بکات نەك زوو ببڕێتەوە ، سا یا لەبەر کەمی شتەکە یا لەبەر چروکیی خۆی •

— دەستی پێوە نا ـ پاڵی پێوە نـا :ـ

١ ـ شتەکەی فرۆشت ٢ ـ زەلامەکەی دەرکرد ٣ ـ هانیدا ٤ ـ رای گرت ، گرتییەوە •

— دەستی پێـدا چـزا :ـ

١ ـ تێکەوتو تووش بوو ٢ ـ پەندی لی وەرگرت

— دەستی پێ گەرم کردەوە :ـ

بە پیاوێك دەڵێن کە ئافرەتێك بۆ ماوەیەك هەڵ بخەڵەتێنێت، واتا : هەڵی خەڵەتاند •

دەستی ـ دەستی خۆی نییەو ماری پێ دەگرێـت:ـ

(بە یەکێك دەوترێت کە کارێکی گران بە یەکێکی تر بکات)

— دەستی خۆی تا ئێستە بە دەمدا نەبردووە :ـ

کار بە بێ لێکدانەوە ناکاتو کارێك ناکات لێی پەشیمان بێتەوە •

— دەستی خێری نایە سەر :ـ
( بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێت کە لە جیاتی ئـــەوەی
قازانج بە یەکێك بگەیەنێت زیانی پێ بگەیەنێت)

— دەستی داری گرتووە :ـ
خەریکە لە نەخۆشییەکەی هەڵدەستێتەوە ، بەرەوچـــاك
بوون دەڕوات •

— دەستی دەستی پێ دەکات :ـ
١ ـ دەیخلافێنێت ٢ ـ دەیخاینێت

— دەستی راستو گیرفانی چەپ :ـ
واتا : پیاو پشت بە گیرفانی خۆی ببەستێتو منەتی کەس
هەڵنەگرێت •

دەستی ـ دەستی رەشە :ـ
بۆ کڕینو فرۆختە :ـ واتا هەرشتێك بفرۆشێت خێر
بۆ کڕیارەکە ناداتەوە • شەڕ بەدەستیەوە دێت • یـــان
ئەو شتەی کە داوێتی بە هەر کەسێك زیانی لەگەڵ خۆی
بۆ ئەوکەسە بردووە •

— دەستی سەوز دەبێـــت :ـ
وا دەوترێت : کە موسولمانێك کافرێکی دوژمن بکوژێت
دەستی سەوز دەبێت • واتا : لەلای خودا پایەیەکی بەرزی
دەبێت جاری واش هەیە لە نائومێدیدا یەکێکیش دەڵێت :
هەرچی بمکوژێت دەستی سەوز دەبێت واتا خێرێکـــی

گەورەی تووش دەبێت •

— دەستی سووکـە :ـ
١ ـ زوو کارەکەی بەدەستەوە دێت ٢ ـ بـــۆ نەخۆشی ، زوو نەخۆشەکە چاك دەکاتەوەو سزای نادات • بە تایبەتی بۆ دەست بە سکدا هێنانی جاران کە یەکێـك گرفتی بکردایە ، بە تایبەتی منداڵ ، سێ رۆژ دەیانبردە لای یەکێك ، کە بە زۆری پیرێژنێك دەبوو ، دەیان گوت ئەو ژنـە وومیەتیو لە باوو باپیریەوە ئەو بەهرەیـەی بـۆ ماوەتەوە • دەبوو لە خورێنی دەستی بە سکیدا بهێنایەو ژنەکەش هیچی نەخواردایە • ئەم چەند وتەیەشی لەگەڵ دەست پێدا هێنانەکەدا دەوت : دەستم دەرمانی سـەر سکان دیم سەگێك سەگێکی خوارد لە سەرە لوێنکان • جگە لەوەش دۆعاو بیسمیلای زۆری بەسەر سکەکـەدا دەخوێندو کفی دەکرد •

دەســتی ـ دەستی شەیتان شکێت ـ ملی شەیتان شکێت :ـ
واتـا : خۆزگە ئەو هەلەم لە دەست نەدایە ، ئەو کارەم بکردایە ئەو قسەیەم بوتایەو لە بیرم نەچوایە •

— دەستی شـکاوە :ـ
پەکی کەوتووەو بێ دەسەڵات بووە •

— دەستی کەوتە روو :ـ
دەغەلیی کارەکـەی ئاشکرا بـــوو ، فێـــڵو تەڵەکەبازیەکەی ، درۆکەی دەرکەوت • ناوی زڕا

— دەستی گرت :
١ ــ بە پارە ، سامان یارمەتی دا ٢ ــ لە کارەکەیدا
کۆمەکی کرد ، پشتی گرت بۆ ئەوەی سەرکەوێت

— دەستی گرتەوە :ــ
شتەکەی ، پارەکەی ، زۆر کار ، بەخت نەکرد •

دەستی ــ دەستی لە بنی هەمانەکەوە دەرچووە ــ دەستی لە هەموو
بنچکان براوە :ــ
١ ــ نابووت بووە ٢ ــ کارەکەی بێ ئەنجام بووە ،
هیچی پێ ناکرێت‌و هیچی لە دەستدا نەماوە •

— دەستی لە دلی نایێتەوە :ــ
چرووکەو دلی نایەت پارەکە خەرج بکات • شتەکە
ببەخشێت • واتا دەستی کە شتەکەی پارەکەی تێدایە
بەسەر دلیەوەیەو لێی ناکاتەوە •

— دەستی لە دنیا شتووە :ــ
رەشبین دەروانێتە ژیان‌و نائومێدی سواری بووە •

— دەستی لە ژێر دەستی ئەودا نییە :ــ
سەر بەستە پیاوی ئەو نییە •

— دەستی لەسەر دلیەتی ــ دەستی لەسەر دلی دانا :ــ
دلخوردە ، لە روودانی شتێك ، کارەساتێك ، دەترسێت •

— دەستی لەگەل تێکەل کرد :ــ

لەژێرەوە بە حەرامی لەگەڵیدا رێکەوت ، جووت بوو

ـــ دەستی لە گووەوە چـووە :ـ
بەداخەوە دەوترێت • واتا: ١ ـ تووشی کارێکی ئاڵۆزو پیس بووە ٢ ـ تووشی بە تووشی یەکێکەوە ، تاقمێکەوە بووە کە ئازارو زووخاویان بەدەستەوە دەچێژێت •

دەستی ـ دەستی لێ بشـۆ :ـ
چاوەڕێی مەبە ١ ـ بێتەوە ٢ ـ ئەنجامێکی باشـی بێـت •

ـــ دەستی لێ بەردا :ـ
١ ـ پشتی تێ کرد ٢ ـ وازی لێ هێناو بەرەڵای کرد

ـــ دەستی لێ سارد بۆوە :ـ
لێی نائومێد بوو ٢ ـ تابوشتی کارەکەی نەما •

ـــ دەستی لێ کێشایەوە :ـ
وازی لێ هێنـا

ـــ دەستی لێ وەشـاند :ـ
دوژمنکارانە ، زیانی، ئازاری پێ گەیاند ٢ ـ یەکێك شێت دەبێت دەڵێن : گوایا ئەوان واتا جنۆکە دەستیـان لێ وەشاندووە •

ـــ دەستی لە هەموو لایەکەوە بڕاوە :ـ
نائومێدەو کەسی بە دەستەوە نەماوە ، یارمەتی بـدات

پشتگیری بکات .

— دەستی وا لە کیسەی خەلیفەدا :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە هەرچی خەرج بکات لە ماڵی یەکێکی تر بێت )و چاکیش خەرج بکات .

— دەستی وشکە :ـ
دیاری پێ نییە ، هیچی لەگەڵ خۆی نەهێناوە .

— دەستی هەڵگرت :ـ
ـ پشوویدا ٢ ـ وازی لە کارەکە هێنا .

— دەستی هەمیشە قووچاوە :ـ
رژدە ، چرووکە

دەستێکی ـ دەستێکی پێدا هێنا :ـ
جوانی کردو رازاندیەوە . دەڵێن دەستێکی بە خۆیدا هێنا ٢ ـ رووتی کردەوە . دەڵێن : دەستێکیان بە کاروانەکەدا هێنا ٣ ـ ماڵەکەی هەڵپەرداوتو کۆی کردەوە .

— دەستێکی کەوتە ئەملاو یەکێکی کەوتە ئەولا :ـ
پەکی کەوتو کارەکەی وەستاو بۆی ساز نەبوو ، دۆش داما ، نائومێد بوو .

— دەستێکی گەیاندێ :ـ
١ ـ ئازاری دا . لێی دا ٢ ـ زیانی پێ گەیاند
٣ ـ یارمەتی دا . دەستی بۆ برد بۆ چاکە یا خراپە

دەستێش ــ دەستێش دەوەشێنێت‌و هاواریش دەکات :ــ
به یەکێکی فێڵبازی چەرداوەروو دەڵێن کە کارێکی خراپ بکات‌و خۆیشی بە زۆرلێکراو بداتە قەڵەم ٠

دەشت ــ دەشتی کوڵکە !! ؟ :ــ
بە منداڵێك دەوترێت لە شوێنێکی تەسکدا یـاری بکات ٠ دەڵێن خۆ دەشتی کوڵك نییـە ٠ بـڕۆ دەرەوە یـاری بکــە ٠

دەفژەن ــ دەفژەنە ــ دەهۆڵ لێدەرە :ــ
١ ــ پڕوپاگانتەچی‌یە ٢ ــ درۆزنە ، فیشاڵکەرە

دەف ــ دەفی دەنگ نـادات :ــ
قسەی رەوا نیە ، قسەی وەر ناگیرێت ، چونکـە یان کەسێکە بێ سامانە ، بێکەسە ، بە هۆی ئەوەوە پایەی نزمە ، یان کەسێکە لای خەڵك سەنگی نییــە ٠

دەقــان ــ دەقان دووقان :ــ
دەڵێن وەك ئەو دەقان دووقان بەرامبەری بوەستەرەوە٠ واتا پێ بە پێی ئەو ، بە ئەندازەی ئــەو ٠

دەقــاو ــ دەقاو دەق :ــ
بە تەواوی ٠ وەکو ئەو ٠

دەقــی ــ دەفی دایەوە :ــ
تیرو پڕ کوتای‌و لێی دا ٠ برنج کە بۆ جاری دووەم

بکوترێتەوە دەڵێـــن : دەقی برنجەکەی دایەوە

دەڵــە ــ دەڵــە دێوێکە بۆ خۆی :ــ
بۆ تەوس‌و سووککردن بەکار دێـــت ( بە ئافرەتێکـــــی
زەبەلاح دەوترێت ) کە حەز لە چارەی نەکرێت •
دەڵێـــتـــ دەڵێت من ئەزم هەڵدەبەزم :ــ
بە گاڵتە پێ‌کردن‌و تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە لە جرت‌و
فرتدا بێت‌و خۆی با بدات‌و خۆی بە شتێکی گـــەورە ،
بە توانا ، نیشان بدات لە خۆی بایی بوویێت •
ــــ دەڵێت من بۆ تۆمە تۆ بۆ کێتە :ــ

بە یەکێك دەوترێت کە تۆ بە تەنگیەوە بێیت‌و ئەو پـــێ
نەزانێت‌و بەرپەرچی ئامۆژگارییەکەی تۆ ، یاریدەکەی تۆ
بداتـــەوە •

دەڵێـــی‌ـــ دەڵێی ئاشەوانە ــ کەری ئاشەوانە :ــ
بە یەکێك دەڵێن شانی ئارداوی بێت • پیس بێـــت •

ــــ دەڵێی ئاشی بێ ئاوە ــ ئاشی ئاو کەوتووە :ــ
واتا : کپ‌و بێدەنگە • دەڵێن ماڵەکە دەڵێی ئاشــــــی
ئاو کەوتـــەیـــە •

دەڵێـــی ــ دەڵێی ئاشـــی کرێوەیـــە :ــ
(ئاشـــی کرێـــوە ئاشـــێکە بەرداشـــەکانی زۆر خێـــرا
بسوورێتەوەو ئارد زۆر بهارن ، ئاشی کرێوە ئاشێـــــکی
گەورەی چاك بووە لە دێی سەردەرایات ، نزیك مەهاباد ،

خێرا ئاردی هاڕیوەو کردوویەتی بە تۆز ، وەك بەفـــر بارێ‌و کڕێوە بکات ٠ ئەمە بە یەکێك دەڵێن خێرا خێرا قسە بکات‌و تۆرەی کەس نەدات ٢ ــ خێرا خێرا دەروات )

ــــ دەڵێــی ئاگــری قوورەتە :ــ

( بە یەکێکی زۆر هارو هاج دەوترێت کە ئازار بـــــە دەوروپشتی بگەیەنێت ، ئەوانیش لێی وەڕس بن‌و هیچــی کەیان لە دەست نەیەت‌و دەرەقەتی نەیــــەن ) ٢ ــ زۆر بەتواناو لێهاتووە ٠

ــــ دەڵێی ئالەت کراوەتــە قنگی :ــ

بە یەکێك دەڵێن کە بزێو بێت‌و لە هیچ شوێنێك سرەوتی نەبێــت ٠

ــــ دەڵێی ئــاو لای داوە :ــ

بە یەکێك دەڵێن کە لە قسەو ڕەفتاردا لەگەڵ خەڵکــــدا ساردو سڕ بێت ٠ واتا : وەك مردووی بێ گیان وایە کــە خنکابێت‌و ئاو لای دابێت ٠ ( لەبەر نەزانـــــی یـــان خەفەتباری خۆی کڕ کردبێت ) ٠

دەڵێــی ــ دەڵێی ئەرزی موقەدەسە ــ دنیای لێ بۆتــــە ئــەرزی موقەدەس :

واتا شوێنی دەست ناکەوێت لێی دانیشێت ، بـــــــە تەوسەوە ئەمە دەوترێــت ٠

ــــ دەڵێی ئەرژەنگی دێــوە :ــ

بە یەکێکی پتتیی قژ بژ دەڵێن

— دەڵێی ئەستێرەی سیوەیلە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە گۆشەگیرو دوورەپەرێز بێـــتو کەم خۆی دەربخات ) •

— دەڵێی ئەسپی بۆ زین کراوە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە بە پەلە بێت لەسەر ڕۆیشتنـــی بۆ شوێنێك ) •

— دەڵێی ئەسپێی چنگی گولە :ـ

(. دەڵێن هەرچی کەوتە دەست ئەحە دەبێتە ئەسپێی چنگی گول واتا دەرنایەت • وا باوە کە گول ئەسپـێ هــەڵ ناهێنێت ، جا ئەگەر کابرایەکی گول ئەسپێیەکی لە خۆیدا دێت بۆ ئەوەی پیشانی بدات کەگول نییە ، یا چـــاك بۆتەوە رای دەگرێو لە چنگی نایەتەدەر ) • واتا کابرایەکی پیسکەی ڕژدە ، هیچی لەدەست نایێتەوە •

دەڵێـــی ـ ئەسپێی کراس کۆنە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە هەر لە پیاو نەبێتەوە ، چونکە کراسی کۆنی جاران هێندە پینە دەکرا گەلێ چرچی تێ دەکەوتو لەو چرچانەدا خۆی دەشاردەوە •

— دەڵێی ئەلخەنناسی برای شەیتانە : ـ

بە یەکێکی ناپاکی زمانو کردەوە بەد دەوترێت کە هەمیشە خەریکی تەڵەکەبازیو بەدی بێت •

— دەڵێی ئێستری چەموشە :ـ

ئێستری چموٚش = ئێستریٚکی شێتۆکەیە • واتا : هەرزە‌ گۆیەو هەرزە کردارە ، جووتە وەشێنە •

— دەڵێی بازاڕی هەمزاغایە : ـ بازاڕی شیخ هەمزەیە :
بازاڕی هەمزاغا بازاڕێکی چڕی پڕی بێ سەروبەر بووە واتا شتەکان پەرش‌و بڵاوە ، هیچی لە جێی خۆیـــدا نیـــە

دەڵێـــی ـ دەڵێی بایەو بە لای گوێیدا دەڕوات :ـ
( قسەکە ناچێتە دڵیەوە ) • ســا یــا لەبەر بێ مێشکی ، یا لەبەر لاساری •

— دەڵێی بەدەم داینباوە :ـ
بە دایکێك یان باوکێك دەوترێت کە منداڵەکەی زۆر لە خۆی بچێـــت •

— دەڵێی بە دوو نق‌و نیـــو دیویەتی :ـ
( بە ژنێك دەوترێت کە منداڵێك لەخۆی نەبێت کەچـــی زۆر خۆشی بوێت‌و بیلاوێنێت ) •

— دەڵێی بەرازە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر دڵ رەق‌و بێ بەزەیی بێت •

— دەڵێی بەرازی غەزریوە :ـ
( بەرازی غەزریو = بەرازێکە رقی هەڵستابێت‌و هەرچی بێتە پێشی پەلاماری بدات • بە ئادەمیزادی رق ئەستوور دەڵێن کە هەر پێش بخواتەوە ) •

— دەڵێی بەردێ بن گۆمە :ـ
هیچ نادرکێنێتو هیچ ناڵێت • ( بێدەنگ دانیشتووە )
دەڵێـی ـ دەڵێی بەڕووی لە دەمدا تەقیوە :ـ
دەم گورجە • بێ وەستان دەدوێ • دەم هەراشە

— دەڵێی بەسەر بانی جەهەنەمەوە لەوەڕاوە :ـ
( بە یەکێکی رەقی تەقی لاواز دەوترێت )

— دەڵێـی بەفر هەبر لەوێ چۆتەوە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە بچێتە جێگەیەکی واوە جێ بە خەڵك لێژ بکات ، یان کاریان لێ تێك بداتو تەنگیـــان پــێ هەڵچنێــت •

— دەڵێـی بەکر مەرگەوەڕە :ـ
( بە یەکێکی فیتنەبازو سەر بەگۆبەندو ئاشووبگێـــــڕ دەوترێت • لە داستانی مەمو زیندا ، سەرچاوەی هەموو گۆبەندو کارەساتێکە ، مرۆڤێکی بەدو درۆزنو دووڕوو فیتنەبازبووە )

— دەڵێی بتەو دانیشتووە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە نقەی لەخۆی بڕیبێتو وەڵامی پرسیار نەداتەوە •

— دەڵێی برە تۆکــە :ـ
واتا : باڵای زۆر کورتە •

— دەڵێی بزبزۆکە :ـ

بزبزۆك = زیندەوەرێکە لە قاڵۆنچە بچووکتـــرەو زۆر دەجووڵێت • واتا لە کاردا وریاو گورجو ئازایە

— دەڵێی بزنی دێلێژەیە :ـ

دەڵێن : ئەوەی بۆ تۆ لوواوە بۆ بزنــــی دێلێــژەش نەلوواوە • دێلێژە = دێیەکی ئـــاوادارە لە ناوچــــەی قەرەداخ • واتا : لەوەڕەکەی پاکژە ، ژیان بۆت لەبارە ، چاکت بۆ رێکەوتووە •

— دەڵێی بلبلە قسە دەکات :ـ

واتا : قســـە زانـــە •

— دەڵێی بنەمۆمــە :ـ

بە یەکێك دەڵێین زۆر کورتەبنە بێت •

— دەڵێی بۆ ئاگر هاتووە :ـ

زۆر پەلەیەتیو دەیەوێت زوو بڕوات یان بگەڕێتەوە، لەو شوێنە دانانیشێت یان هێندە دانانیشێت •

— دەڵێی بووکە بەبارانێیە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە هەموو لەشی تەڕ بووبێت )

— دەڵێی بووکی بۆ دابەزیوە ـ دەڵێی کچە جافی بـــۆ دابەزیوە :ـ

بە یەکێك دەوترێت کە لە شوێنێکدا بێــت ، پەلـــەی ڕۆیشتنەوەیماڵەوەی بێت •

— دەڵێی پاپۆڕەکەی نوقوم بووە :ـ
به یەکێك دەڵێن دۆش دامابێت‌و مەلوول دانیشتبێت

دەڵێـی ـ دەڵێی پارووی لە دەمدایە :ـ
به یەکێك دەڵێن کە لە قسەی نەگەن هەر پلتە پلتی بێت
لە قسـه کردنـدا •

— دەڵێی پەشتەمالی حەمامە :ـ
به یەکێکی بێبار دەوترێت کە هەردەمە رووی لە لایەك‌و
سەر بەیەکێك یان دەستەیەك بێـت •

— دەڵێی پەلـه هەورە :ـ
به یەکێکی قەبەی زلە دەڵێن کە حەز لە چارەی نەکرێت‌و
بەر چـاوی گرتبێـت •

— دەڵێی پەلکەبزانـه :ـ
( پەلکەبزان گیاندارێکی ئەفسانەی هارو هـاج‌و
خاوەن جمو جوولە ) • به منداڵێك دەوترێت کە زیـت‌و
هارو هاج بێـت •

— دەڵێی پۆڕی خوراوە ـ کردویانە بە پۆڕی خوراو :
١ ـ نابووتیان کردووە ٢ ـ هەژار کەوتووە •

— دەڵێـی پەتیووکەیە :ـ
( پەتیوولە = باڵندەیەکی بچووکی زرنگ‌و زیتە •
واتا وەك پەتیووکە وریاو زیتە بە تایبەتی بە منداڵی زرنگ
دەوترێـت ) •

— دەڵێی پێ بە هێلکەدا دەنێت :ـ
لەسەر خۆ دەڕوات‌و هێواش پێ دەبزوێنێت

— دەڵێی پیرێژنی دۆ رژاوە :ـ
واتا : دۆش داماوەو خەفەتبار دەنوێنێت

— دەڵێی پشیلەی کەللەخانەیە :ـ
( بە یەکێکی سەر زلی قەڵەو دەڵێن ) پشیلەی پاچەخانـە گۆشت زۆر دەخوات‌و زۆر قەڵەو دەبێت • پشیلـــەی گوربەیش ڕادەگـرن •

— دەڵێی پێکوڕەی جەوالدڕە ـ دەڵێی شێرەکوللەیە بـــە یەکێکی لەڕی باریك دەوترێــت •

— دەڵێی تانجییەکەی ئەحمەدی عەزیز اغایە ، لە کاتی ڕاودا گووی دێـــت :ـ
بە یەکێکی بێکار دەوترێت کە لە کاتـــی کـــارو پێویستیدا خۆی بخلافێنێت‌و بیانوو بدۆزێتەوە •

— دەڵێی تەرسەقولێکن‌و کراون بە دوو کەرتەوە ـ دەڵێی جاشی ماکەرێکـن :ـ
( بە دوو کەسی خراپی هیچ‌و پووچ دەوترێـت کە لەیەك بچن ) یا بە دوو شت دەوترێــت کە ناتەواو بن‌و لەیەك بچن • یان بە ڕقەوە وایان پێ بوترێـت •

— دەڵێی تفاندوویە دەمیەوە :ـ

وا باوه دەڵێن : هەر کەسێك تفاندییە دەمـــی هـــەر منداڵێکەوە ئەو منداڵە لە هەڵس و کەوتدا لەو کەســـە دەچێت و وەك ئەویش بیر دەکاتەوە • واتا : دەرســـی داداوە •

— دەڵێی تفاندوویانەتە دەم یەك :ـ

( دەڵێی خەبەریان لەیەك گێڕاوەتەوە ) • بە دوو یان چەند کەسێك دەڵێن کە لەسەر شتێك ، کارێك ، قسەیان یـەك بێت ، وەك لەوەپێش تەگبیریان کردبێت و یەکیان گرتبێت •

— دەڵێی تووتی یە :ـ

بە تەوس و گاڵتە پێکردنەوە بە یەکێك دەوترێت کە قسەی یەکێکی تر بکاتەوەو پشتگیری بکات • واتا • بێ مێشکە بێ کەسیتی یە ( شخصیة ) ، بوودەڵەیە ، کلکە ، بیـــر ناکاتەوە ٢ ــ بە منداڵێکی بچووك دەڵێن کە قسەی دەورو پشتەکەی بڵێتەوەو لاساییان بکاتەوە •

دەڵێـــی ــ دەڵێی توونی بابایە :ـ

( توونی بابا دۆڵ و دەرەیەکی زۆر دوورو درێژو بە پێچ و پلووچە لەولا دەربەندی خانەوەیە ، پیاو تێیدا ون دەبێت ) • بە شوێنێك ، خانوویەك دەوترێت کە پێـــچ و پەنای زۆر بێت ، پیاو سەری لێ دەرنەکات •

— دەڵێی جن ــ پێدا ــ تێی تسیوە :ـ

بە شتێك دەڵێن کە زوو تەواو بووبێت • یان کەمـــی کردبێـــت •

— دەڵێی جـن گوڕیویەتی :ـ
( بە منداڵێکی زۆر ناشیرین دەوترێت )

— دەڵێی جنۆکەیە :ـ
منداڵێکی لاوازی ناشیرین دەوترێت

— دەڵێی جیوەی تێ کراوە :ـ
بە یەکێکی زۆر بزێو دەڵێن •

— دەڵێی چاوی قرژاڵـە :ـ
بە ئاوێك دەڵێن کە زۆر ساف‌و پاك‌و روون بێت

— دەڵێی چەقەڵە ـ چەقەڵە دێمی‌یە ـ رێوی‌یە :ـ
بە یەکێکی سیسی لەڕ دەڵێن •

— دەڵێی چواڵـووە :ـ
بە یەکێکی قەڵەوی گۆشت پتەو دەڵێن •

دەڵێـی ـ دەڵێی چێشتی مجەورە :ـ
بە شتێك دەڵێن کە لەگەڵێك شت پێك هاتبێت ، تێکەڵ کرابێت مجەور = کارگوزاری مزگەوتـە ، خزمەتـی مزگەوت دەکات • جاران ئاوایی دەیانژیاندو چێشتیان دەدایەو چێشتەکە هی چەند ماڵێك دەبوو ، ئەویش دەفری زۆری نەدەبوو یان نەیدەبرد • چێشتەکان بەسەریەکـدا دەکراو تێکەڵ دەبوو •

— دەڵێی حووچی بنی حەلەقە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر درێژ بێت ( ئەم ناوە لە عوج علق )ی عەرەبییەوە کە ناوێکی ئەفسانەیە هاتۆتە زمانی کوردییەوە .

— دەڵێی حۆلی بیابانە دەسوورێتەوە :ـ
واتا : گێژ گێژ دەسوورێتەوە . ( حۆلی بیابان = ئەمە جنسێکی شەیتانییە ، بانگ دەکات دەڵێت وەرە لەبەر چاوی ئەو کەسە زل دەبێت تا سەری دەگاتە ئاسمان ، تا لە ناو لنگیەوە ئاسمان دیار دەبێت ، سزای ئینسان دەدات ، دەیترسێنێت ، شێتی دەکات تا کوشتن بەبەریەوە هەیە ، چارەی بە دۆعا خوێندنو دەست بۆ بەندەخوێن بردن دەبێت بەمە پیاو رزگاری دەبێت ) ئاشکرایشە کە ئەمە هەمووی شتێکی ئەفسانەیەو کۆن ئەم بڕوایە لەکوردەواریدا باوبووە .

دەڵێی ـ دەڵێی حەمامی ڕەواحیلە :ـ
واتا : هێندە ژاوەژاوو چڕو جەنجاڵە کەس ئاگای لە کەس نییە .

— دەڵێی حوشترە :ـ
لە بەرزیو مل درێژیو بەکێشیدا . واتا : بە یەکێك دەڵێن کە سیفەتێك لەوانەی تێدا بێت .

— دەڵێی حوشتری ناو پەمووە :ـ
( بە یەکێکی درێژو قووچ دەوترێت کە لەگەڵ چەند

منداڵێکدا به ڕێدا بڕوات ) •

— دەڵێی خەرامانی چینـە :ـ
خەرامان ئافرەتی شەنگو شۆخ • واتا دەڵێی ئافرەتـە
شەنگو شۆخەکەی چینە کە لە چیرۆکدا ناودارە •

— دەڵێی خلێنـە گووە :ـ
بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کەخڕو بچووکو قەڵەو
بێـت •

دەڵێـی ـ دەڵێی خوریی خواردووەو پەتك دەڕێ :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە زۆر لەسەر پێشاو بمێنێتەوە )

— دەڵێی خۆڵی مردووی بەسەردا ـ بێژراوەتەوە ـ کراوە :
( بە یەکێك دەڵێن کە ماتو خەفەتبار دانیشتبێت ) •

— دەڵێی خێـوە :ـ
واتا تازۆر ناشیرینـەو پیـاو لێـــی دەترسێت
خێو = خاوەن = گوایا مردوو کە مرد جاری وا هەیـــە
روحیانەتەکەی دێتە ئەو شوێنەی خۆیو لەویدا دەگەڕێتو
بەرچـاو دەکەوێـت •

— دەڵێی داری گەندەڵـە :ـ
واتا داویەتیە دواوەو تا بێت کەم دەکاتو کز دەبێت

— دەڵێی داری واوەیلایـە :ـ
( داری واوەیلا دارێکی بێ لقو پۆپی وشکە )

به یەکێك دەڵێن وشك‌و ڕەق‌و درێژ هەڵچوویێت .

— دەڵێی دانی مــارە :ـ
واتا زۆر زیرەکە . زوو دەگاتە ئەنجام

— دەڵێی دەمــی مردووە :ـ
دەڵێــی ـ دەڵێــی دەمی مردووە :ـ
واتا : ساردو سڕە . بە خواردنێکی ساردەوەبــوو دەوترێــت .

— دەڵێــی دڕکی مەم‌و زینــە :ـ
واتا کە لە یەکێك ئاڵا لێی نابێتەوە ، هێندە بەدو نالەبارە ( دڕکی مەم‌و زین = لە داستانی مەم‌و زیندا کاکە مــەم‌و خاتوو زین دوو دڵداری گیانی بەگیــانی بــوون ، بەڵام بەکر مەرگەوەر بە بوختان‌و دوو زمانی کەوتە نێوانیان‌و نەیهێشت ببنە چارەنووسی یەك ، تا کاکە مەم گیراو لە زینداندا بە داخەوە مرد دوای ئەو لە داخدا خاتوو زینیش خۆی کوشت‌و لە تەنیشت کاکەمەمەوە نــێــژرا . دوای مردنیشیان بەکر مەرگەوەڕ وازی لێ نەدەهێنان‌و هەمیشە لەسەر گۆڕەکەیان‌و لە ناوەندی هەردووکیاندا دادەنیشت، تا ڕۆژێك براکەی خاتو زین هەر لەوێدا دەیکوژێت . لە جێی خوێنەکەی کۆمەڵە دڕکێك شین دەبێت ، لە ناوەندی هەردوو گۆڕەکەدا هەر چەند هەڵی دەکەنن هەر شیــن دەبێتەوە . ئەمەیە دڕکی مەم‌و زین )

— دەڵێی دۆمی خەڵاتکراوە :ـ

( بەیەکێك دەوترێت کە یەك پارچە کالآی تازەی
لەبەردابێتو بەرگەکانی تری هەموو کۆن بێت ) •

دەڵێی ـ دەڵێی دیزەی ڕەشە ـ فیسارکەس دیزەی رەشە :ـ
( بە موسولمانێکی بێ‌وەی دەوترێت کە گوایا ناو بردنی
بە خراپە ـ یان خراپە دەربارە کردنی ـ مەردوم تووشی
زیان دەکات ) •

ـــ دەڵێی دیوەخانی ئەلیاسە فڕەیە :ـ
ئەلیاسە فڕە = یەکێکە لە پیرانو پیاوچاکانی کورد •
گۆڕەکەی لە پێنجوینە • واتا هەمیشە جمەی دێتو پڕە
لە میوان •

ـــ دەڵێی رمووزنە :ـ
رمووزن = دێوێکی کینە لە دڵی ناشیرینە بە یەکێکی
ناشیرینی سامناك دەوترێت •

ـــ دەڵێی رۆژی ـ حەشرە ـ مەحشەرە :ـ
واتا : شوێنەکە زۆر جەنجاڵە ، ڕێ بەر رێدار ناکەوێت •

ـــ دەڵێی رۆنی سەگ ـ ورچ ـ لە قەلبی ـ لە لەشی
دەدەن :
( بە یەکێك دەڵێن کە بە زیانی مەردووم دڵخۆش بێت )

ـــ دەڵێی رێوی گەزیزان خواردووە :ـ
( گەزیزە = گوڵێکی حەوت رەنگی جوانە ، هەردەمێك
رێوی بیخوات توولەك ( گەڕ) دەبێت بۆ گەمە بە یەکێك

دەڵێن کە لاواز بێت ٠

دەڵێی ـ دەڵێی زەرووە :ـ

واتا خوێنی خەڵك دەمژێت ، ڕەنجی ئەم و ئەو بۆ خۆی دەبات ٠ جاران لە کوردەواریدا زەروویان بەکار دەهێنا بۆ خوێن گرتن لەیەکێك کە جۆرە نەخۆشییەکی ببوایە گوایە ئەو کەسە خوێنی پیسی لە لەشدایە ٠ زەرووەکەیان دەنا بە خوێن هێنەری ئەو کەسەوە بە تایبەتی لەسەرو چاوو قورگدا ٠

دەڵێی زەعفەرانی زەردە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە زەرد هەڵگەڕابێت ، لاواز بێت ٠
زعفەران = گوڵێکی زەردی بۆن خۆشە ٠

دەڵێی ژنە باخەوانە :ـ

واتا : هەمیشە شاتەی دێت ، دەشیرینێت و دەنگی دێت ٠

دەڵێی سایمە لێی داوە :ـ

سایمە دەردێکە هەر کەس بیگرێت گێژو وڕی دەکات بە یەکێك دەوترێت کە ورو کاس و حەپەساو بێت یان وا بنوێنێت ٠

دەڵێی ـ دەڵێی سەختیانە :ـ

سەختیان پێستێکی خۆشکراوە ٠ دەڵێن جلەکەی بەری دەڵێی سەختیانە ٠ واتا : زۆر چڵکنە وەك پێستێکی خۆشکراو لەچڵکدا ڕەق بوو ٠

— دەڵێــی سەگە ـ سەگی گەڕە :ـ

١ ـ لە ناشیرینیدا ٢ ـ لە پیسیدا • بە ڕقەوە یەکێکــی پێ ، لێ دەچوێنرێت کە ناشیرین یا پیس بێتو حــەز لە چارەیشی نەکــەن •

— دەڵێی سەگی برسییە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە چاو بە هەر چوار لادا بگێڕێت،هەڵپەی شتێکی بێت کە هەواڵی بیستبێت •

— دەڵێی سەگســارە :ـ

( سەگسار = سەکێکی ناشیرینی ئەفسانەیە ) بە یەکێکی زۆر ناشیرین دەڵێن ) •

— دەڵێی سەگی ـ گورگی ـ پێ سووتاوە :ـ

واتا جێ نایگرێتە خۆی ، سرەوتی نییە ، هەر لە خوێڕیەتیو هاتوو چۆدایــە •

دەڵێی ـ دەڵێی سەگی سەر ملەیە :ـ

بە یەکێکی زمان پیسی بێ شەرم دەوترێت کە پەلامــاری هەموو کەسێك بدات • وەك چۆن سەگی سەر ملە بــە همور لایەکی کێوەکە دەگەڤێت •

— دەڵێی سەگی هەڵەپاسە ـ هەڵەپاچە :ـ

( بە یەکێکی دڕی بێحەیا دەوترێت )

— دەڵێی سەگی هەوشارە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە زۆر دڕو شەرەنگێز بێت •

هەوشار = شارێکە لە ئێران • نادرشاه خەڵکی ئـەو شارەیەو شارەکە بە سەگی درِ بەناوبانگ بووە •

— دەڵێی سەگەو بە مانگەشەو دەوەرِێت :ـ
دەڵێن : وا بزانە سەگەو بە مانگەشەو دەوەرِێت واتا : گوێ مەدەرە ئەو بێ شەرمو شکۆیە کە ئـەو قسـه ناشیرینانە دەکات • ( بە یەکێك دەوترێت کە بە خراپـه ناوی پیاوێکی باش بەرێت ) •

— دەڵێی سەلکە ترخێنە دەچنێتەوە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە ماڵانگەرِ بێـت •

دەڵێی ـ دەڵێی سەیفندەی بەرۆژەیەو گووی بە دوو پەلی دارەوە کردووە :
( سەیفندە = ناوی کابرایەك بووە لە دێی بەرۆژە • لـه تەنشت بانەوە لە کوردستانی ئێران • ئەم کابرایە لەبـەر دەعیە ، هەر لەسەر داری دوو پەل رِیاوە بۆیە ئەمـه بە یەکێك دەوترێت کە زۆر بەدەعیەو دەمار بێت ) بـه تەوسو گاڵتە پێ کردنەوە بەو جۆرە کەسانە دەوترێت •

— دەڵێی سندەڵقۆی برای شەیتانە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لە شوێنێکدا قوت بێتەوەو بەرچـاو بگرێت • یان حەز نەکرێت کەس لەو شوێنەدا بێـت • کارێکی نهێنی هەبێتو ئەو لە ناکاودا پەیدا بێت •

— دەڵێی سیرو گژنیژن :ـ
واتا : وردن • بە کۆمەڵە منداڵێك دەوترێت کە ورد بـن

گژنیژ = بەری درەختێکی گەرمیانی‌یە وەك زیرەیە ٠

— دەڵێی سێوێکن‌و کراون بە دوو کەرتەوە :ـ
( بە دوو کەسـی جوان دەڵێن کە لە شـێـوەدا زۆر لەیـەك بچـن ) ٠

— دەڵێی شەخسە پەڕۆیە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە بەرگەکـەی بـەری وەك پەڕۆی سەر شەخس شڕو وڕ بێت )

دەڵێی ـ دەڵێی شەروال بەکۆلی خواردووە :ـ
( شەروال بەکۆل گیایەکی ڕەوانە ، هەرکەسێك بیخوات دەبێت شەروالەکەی بە کۆلیدا بدات ـ واتا هەمیشـە بۆ سەرئاو بەڕێوە دەبێت ـ ئەمە بە یەکێکی زۆر ڕەوان دەووترێت

— دەڵێی شەکی شوانان گاوە :ـ
( بە یەکێکی پۆخلی دڕو داوێن قوڕاوی دەوترێت )

— دەڵێی شەلاقەی باڵ شکاوە :ـ
شەلاقە = جۆرە باڵندەیەکی گۆشتخۆرە ٠ بە یەکێـك دەڵێن کە خوارو خێچ وەك شەل‌و گێڕ بڕوات ٠ ( بـە مەردومی شلەپەتە دەوترێت ) ٠

— دەڵێی شەیتان دەرسی داداوە ـ تفی کردۆتە دەمی :ـ
واتا : فێڵبازو زۆرزان‌و زیرەکە ، وەك شەیتان ٠ بە تایبەتی بە منداڵێك دەڵێن کە زۆرزان بێت ٠

— دەڵێی شەیتان راوی دەبێت :ـ

( به كه‌سێك ده‌ڵێن كه‌ زۆر به‌گوڕ هه‌ڵبێت ، بـڕوات •
چونكـه‌ شه‌یتان له‌ لا ی‌موسوڵمان شتێكی ترسناكو ره‌زا
تاڵه‌ ، ئه‌و كه‌سه‌ به‌ جۆرێك را ده‌كات هه‌رگیـز شه‌یتان
نه‌یگرێته‌وه‌ ) •

ده‌ڵێـی ـ ده‌ڵێی شـڕه‌ی به‌ر تۆپه‌كه‌یه‌ :
به‌ یه‌كێك رووتو ڕه‌جاڵ ده‌وترێـت •

ـــ ده‌ڵێی شێته‌و بۆ به‌رد ده‌گه‌ڕێـت :ـ
به‌ یه‌كێك ده‌وترێـت كه‌ هه‌ر به‌ده‌وری خۆیدا بگه‌ڕێـت ،
به‌ مه‌به‌س یا بێ مه‌به‌س • به‌ته‌وسه‌وه‌ پێی ده‌ڵێن •

ـــ ده‌ڵێـی شـێره‌ :ـ
واتا زۆر ئازاو به‌جه‌رگه‌ •

ـــ ده‌ڵێی عیسا گرتوویه‌و مووسا تێی ئاخنیوه‌ :ـ
( به‌ یه‌كێك ده‌وترێت كه‌ له‌قه‌ڵه‌ویدا ره‌وابێته‌وه‌ ) •

ـــ ده‌ڵێی فاته‌ی سووره‌بانه‌ :ـ
( فاته‌ی سووره‌بان ، ئافره‌تێك بووه‌ ، شه‌ڕی ناوه‌ته‌وه‌و ،
خۆیشی سه‌یری كردووه‌ ، كه‌ لێشیان پرسیوه‌ ئه‌وه‌ چییه‌
وتوویه‌ : ده‌ڵێن شه‌ڕو هه‌رایه‌ خه‌تای فاته‌یشی تیایـه‌ •
ئێسته‌ به‌ یه‌كێك ده‌وترێت كه‌ شه‌ر بنێته‌وه‌و خۆی سه‌یری
بكات ) ـ به‌تایبه‌تی به‌ ئافره‌ت ده‌ڵێن •

ده‌ڵێی ـ ده‌ڵێی فیڕنه‌گوله‌یه‌ :ـ
واتا : زۆر بچووكو ڕیوه‌ڵه‌یه‌ •

فیرنەگولە : باڵندەیەکی بچووکە لە چۆلەکە بچووکترە .

— دەڵێی فیشەکەشیتەیە بە ئاسماندا ـ بە حەوادا دەچێت :
( بە یەکێك دەڵێن کە زۆر توورە بێتو هەر لەخۆیـەوە
هەڵچێت ) .

— دەڵێـی فیـلە ـ فیلەگێژەیە :ـ
بە یەکێکی قەبەی زلە دەڵێن .

— دەڵێی غازی کوێرە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە بەتەنیا بێت ، مایێتەوە .

— دەڵێی قاژوو یرەشە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە پێستی رەشباو بێتو لەریش بێت .

— دەڵێی قەڵو بەچکە قەلەکەن تفاندوویانەتە دەم یـەك :
( بە دوو کەس دەڵێن کە لە قسەیەکدا هەردووکیان وەك
یەك قسە بکەن )

— دەڵێی قەلەموونـە :ـ
١ ـ لە خۆ گیف کردنەوەدا ٢ ـ لە نازیرەکیدا .

— دەڵێی قەندەی دەم بەرەو ژوورە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە بۆ هەر لایەك بچێت خواردنی
بە تووشەوە بێـت ) .

دەڵێـی ـ دەڵێی قورِ بەدەمیدا دراوە :ـ

به یەکێك دەڵێن کە زۆر کڕو بێ دەنگ بێت ، هەر وەك دەمی بە قوڕ سواغ درابێت ) •

— دەڵێی کاسەی چەورە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە هێچ نەگرێتە خۆی ) واتـــا : چەرداوەڕوو بێعـارە •

— دەڵێی کەرە دەتڕێت :ـ
واتا : نەزاندووە ، قسەی ناشیرین بەرووی پیاودا دەدات

— دەڵێی کەڕەواڵەیـە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بێ دەنگو نەدوو بێت ، وەك زمانی لە دەمدا نەبێت وابێت • کەڕەواڵە = باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە •

— دەڵێی کەری دێزە :ـ
وا باوە کەری دێز لە کارواندا کوێ سەختو هەڵەتو پڕ مەترسی بێت بەوێدا دەڕوات •
دەڵێن : وەك کەری دێزە تۆپینی خۆیو زیانی خاوەنـی دەوێـت ئەمە بە یەکێك دەڵێن کە بیر نەکاتەوەو بـە دەربەسەوە نەبەت ، خۆیو ئەوانەی پەیوەندیان پێوەی هەیە ، پێوەی بەستراون بەر زیان بکەون بەکردارەکانی •

دەڵێی ــ دەڵێی کەشکی ئاوەسووە :
شتێك کە زۆر لەژێر ئاودا بمێنێتەوەو ئاوی بەسەردا بڕوات لیكو لووس دەبێت • دەڵێن ئاوەسوو بووە واتا : ئـــاو سوویەتیەوە • واتا : ١ ــ ئەو کەسە بێ چاوورووبـــێ

شەرمە ، چەقاوەسووە ٢ ــ چاو نەترس‌و چاو قایمە •

ــ دەڵێی کەلەشێری بلقاسمە :ــ
بلقاسم : ( ابو القاسم ) ناوێك بـــووە کەلەشێرێـــکی دڕی‌بووە ، بەم‌و بەودا هەڵپژاوەو شەڕانی بوۆە •
بە یەکێك دەڵێن کە هەر لە خۆیەوە لە هەموو هەڵوێستێکدا خۆی قوت بکاتەوە ، بێ ئەوەی کەس پرسی پێ بکـــات یان راوێژی پێ بکات • ( بە یەکێك دەڵێن کە لە قســەی ئەم‌و ئەودا تێ هەڵکات ) •

ــ دەڵێی کەڵەشێری سەر بارەدارە :ــ
بە یەکێکی بچووك دەوترێـــت کە هەمیشە خـــۆی دەرخـــات •

دەڵێی ــ دەڵێی کەلەشێری کلك هەڵکێشراوە :ــ
( بە یەکێکی بچووکی بێ نموود دەوترێـــت )

ــ دەڵێی کەللەی شەکرە ــ زمانی دەڵێی شەکرە ــ زمانـــی شیرینـــە :
قسەی خۆشەو مرۆڤێکی ناسکە ، لەگەڵ خەڵکدا جوان‌و بەڕێزانە دەدوێـــت •

ــ دەڵێی کەندووی بەتـــاڵە :ــ
( بە یەکێکی نەزانی بێ‌زانین‌و زانیاری‌ی‌و بیر دەوترێت )

ــ دەڵێی کەندووی نەزانکـــردە :ــ

( به یەکێکی زلی قەبەی ناشیرین ـ خـوارو خێـچ ـ
دەوترێـت )

ـــ دەڵێی کەوی بنێشتەتاڵ خواردووە :ـ
( به یەکێك دەوترێت کە دەنگی زوڵاڵ بێت • چونکە وا
باوە بنێشتەتاڵ دەنگ خۆش دەکات )

ـــ دەڵێی کتکە نەوتینەیـە :ـ
( به مەردمی رەش‌و رووتی چڵکن‌و پیس دەوترێـت )

ـــ دەڵێی کرمی‌کۆمـە :ـ
واتا باریك‌و ڕیوەڵەو سیـبە به تەوس‌و گاڵتـــەوە
دەوترێـت •

دەڵێی ـ دەڵێی کووپەی بێ سەرو بنـە :ـ
( به یەکێك دەوترێت کە زۆر قەڵەوو خرو فوزتێکراوبێت
له قەڵەویدا وەك کووپە ، سەروبنی وەك یەك وابێت )

ـــ دەڵێی کڵاوی سەخری جنی لەسەردایە :ـ
واتا : زوو لەچاو ون دەبێت • جێ به خۆی ناگرێـتو
نادۆزرێتەوە کـــڵاوی ســەخری جـن = له چیـرۆکە
ئەفسانەیەکانی کورددا جۆرە کڵاوێك بووە کە کراوەتـە
سەر هەر کەسێ ئەو کەسە نەبینراوە بەڵام ئەو هەمـوو
کەسێکی دیـوە •

— دەڵێی کوردی بە دۆ مردە :ـ
( بە یەکێك دەوترێــت کە بۆ شتێك تامەزرۆ بێت )

— دەڵێی کوزە کەمتیاری پێ‌یــە :ـ
بە یەکێك دەڵێن لای هەموو کەسێك خۆشەویست‌و قسە ڕەوا بێت • وا باوبووە گوایا ئەوەی کوزە کەمتیاری پێ بووبێت لای هەموان خۆشەویست بووە •

— دەڵێی گا زلی ئەحمەد عەربەتی‌یە :ـ
بە یەکێکی زلی قەبەی تەمەڵ دەڵێن •

— دەڵێی گاکەی حســن تمــزە :ـ
بە یەکێکی قەبەی پۆرخزی سست‌و تەمەڵ دەوترێــت •

دەڵێی ـ دەڵێی گای بنەیــە :ـ
واتە نابزوێت‌و جێ ناگۆڕێت

— دەڵێی گەنەی گونی گایــە :ـ
بۆ گاڵتە پێ‌کردن‌و بە یەکێك دەوترێــت کە زۆر وردو بچووك بێــت •

— دەڵێی گزگلــە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بچووك‌و خرێت بە تایبەتی بــە منــداڵ دەوترێــت •

— دەڵێــی گزیــرە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لە خۆیەوە هەڵ بداتێ‌و دەست

بخاته کاری خەلکەوە .

— دەلێی گۆچانی سەفەرە ترەیە :ـ
سەفەرەترە کابرایەك بووە جورمی نەبووە . ئەمە بە یەکێك
دەلێن کە چەمابێتەوە خۆی چەمانبێتەوە .

— دەلێی گورەوشار دراوە :ـ
بە یەکێك دەلێن تێقوپابێت‌و زەرد هەلگەرابێت ، چاوی
بە قوولدا چووبێت .

— دەلێی گورچیلەی گان بە یەکەوە نانووسێن :ـ
( بە چەند کەسێك دەوترێت کە پێکەوە هەلکردنیــــان
نەبێت‌و هیچیان بە هیچیانەوە نەنووسین ) .

دەلێی ـ دەلێی گورگـە :ـ
واتا وەك گورگ ١ـچابوکە ٢ ـ ناپاکە.

— دەلێی گۆشتی قازی خواردووە :ـ
بە یەکێك دەلێن کە قێرە قیر زۆر بکات . واتا : گوایـا
ئەوەی گۆشتی قاز بخوات مێشکی.وا بە هێنر دەبێـت
کە قیرە قیری زۆر هەلبگرێت‌و بە تەنگ ژاوەژاوەوە
نەیەت .

بۆ تەوس‌و سووك كردن ئەوە ( بە یەكێك دەڵێن كـــە گێژو وێژ بێت ) سەرەخولێی پێ كەوتبێت‌و بسووڕێتەوە خۆیشی نەزانێت بۆچی دەسووڕێتەوە •

— دەڵێی گولی بەخیلـە :ــ
( بە یەكێكی دڵ پیسی بە خیل دەڵێن ) كە زۆر بەرچاو تەنگ بێت‌و هیچ شتێك بە هێچ كەسێك نەدات‌و بۆ هیچ یارمەتی كەس نەدات •

— دەڵێی گولی دوور ئاوایی‌یە :ــ
بە یەكێك دەڵێن كە تەریك ، دوور لە كۆمەڵێك دانیشتبێت• ئاشكرایــە كە گول دوور دەخرێتەوە تا كەسی لێوە تووش نەبێــت •

دەڵێی ــ دەڵێی گوێزە باری بۆ نییــە :ــ
( بە یەكێكی چەوتی نالەبار دەوترێــت )

— دەڵێی گوێــز دەكاتە هەمانەوە :ــ
واتا : لای ئەو وایە كەس ئاگای لە كارو باری نییە وەكو تریش كارەكەی ئاشكراو نەشارراوەیــە •

— دەڵێی گوێزی بۆ دەژمێرن :ــ
١ ــ ( بە یەكێك دەڵێن كە باسی شتێكی بۆ بكەیت تــێ نەگات‌و سەری لێ دەرنەچێت ) ٢ ــ چەند ئامۆژگاری بكەیت وەری نەگرێت یان لە سەری نەڕوات ٣ ــ بــە دەربەس قسەكانەوە نەیەت •

— دەڵێی گوێزی ناو بێژنگــە :ــ
( بە یەکێك دەوترێــت کە سەری لێ شێواییێت‌و هــەر دەمە لە شوێنێك بێــت )

— دەڵێی گوێزی ناو دەخیلەیە :ــ
( بە یەکێکی زۆر بچکۆلانە دەوترێــت ) ( بە یەکێکی زۆر بچوك‌و زرنگ‌و زیت دەوترێــت )

دەڵێی ــ دەڵێی گیپەی جۆیە :ــ
( بە یەکێکی قەڵەوی گرد دەوترێت )

— دەڵێی گیای بە کێوەوە خواردووە :ــ
واتا : وەك ئاژەڵەو تێگەیشتنی نییە •

— دەڵێی گیسگە دێیە :ــ
( بە یەکێك دەوترێــت کە بۆ مڵ‌و مووش سەر بە هەموو شوێنێکدا بکات )•

— دەڵێی گیــسکی ئاوەکی‌یە :ــ
گیــسکی ئاوەکی ئەوەیە لە ڕان دوورەو کەوتووەو تەرە بووە بە یەکێك دەڵێن کە سەر بە هەموو لایەکەوە بنێت‌و بەم لاو لادا زۆر بڕوات •

— دەڵێی گیسکی سەلەمە ــ گیــسکی قەرزار گرتووە :ــ
( بە یەکێکی نابووتی بچکۆلانە دەڵێن ) بێ دەق‌و سیس‌و کەنــەفتــە ) •

ـــ دەڵێی لە ترش و خوێندا سوور کراوەتەوە :ـ
بە یەکێکی تەندروستی قەڵەو دەڵێن کە سوورە سووری
ڕوومەتـی بێـت •

ـــ دەڵێی لە جووت هاتۆتەوە :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە زۆر برسی بێت و بە پەرۆشـەوە
بێتە سەر خواردن و بە پەلە نانەکەی بخوات ) •

دەڵێـی ـ دەڵێی لە چۆڵی قوڵفە جێ ماوە ـ گیری خواردوە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە ١ ـ دلخوردی گەڕانەوەی شوێنەکەی
بێت ، هەر جێگەیەك بێت ٢ ـ دلخوردی ئەوە بێـت
جێگەیەکی دەست نەکەوێت تێدا بحەوێتەوەو ستـارەی
تێدا بگرێت ٣ ـ بە یەکێك دەڵێن زۆر تینووی بێـت و
بگاتە ئاو شپرزانە ئاوەکە بخواتەوە • (قوڵف = لە قفری
عەرەبییەوە هاتووە • واتا بیاباتێکی نائاوەدان و بێ ئاوو
ژیـان ) •

ـــ دەڵێی لە دەمی گورگ بەربووە ـ لە دەم ڕەش بەربووە :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە زۆر برسی بێت و بە هەڵپە نانەکەی
بخـوات •

ـــ دەڵێی لەسەر ئاگر دانیشتووە ـ لەسەر دڕکە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لە شوێنێك بێـت و زۆر پەلـەی
ڕۆیشتنی بێـت •

دەڵێـــی ـ دەڵێی لەسەر بانی جەهەنەم لەوەڕاوە :
بە یەکێکی لاوازی چرووساو دەوترێت •

ـــ دەڵێی لە کلاّ گەراوە :ـ
واتا : خوارو خێچە وەك گۆزەو دیزەیەك کە لـە کلدا بگەڕێتو خوار بێـت •

ـــ دەڵێی لە گەرووی مار دەرهاتووە :ـ
واتا ( زۆر راستە ) ، زۆر پاکـە •

ـــ دەڵێی لە گوێی گادا نوستووە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت لە دەنگو باسێك بێ ئاگا بێت ) •

ـــ دەڵێی مارە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە بێ خشپەو دەنگ بـــڕوات بەڕێـــوە •

ـــ دەڵێی ماری حەوتسەرە :ـ
بە یەکێك دەڵێن ١ ـ وەزندی زۆر بێت • هارو هـاج بێـــت ٢ ـ بە توانا بێـــت •

ـــ دەڵێی ماستمان خواردووەو دۆمان بەو داوە :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە لە هیچە لە خۆیەوە زویر بێت )

ـــ دەڵێی ماکەری ئابلاّخە :ـ

دەڵێــی ـ دەڵێی لەسەر بانی جەهەنەم لەوەڕاوە :
به یەکێکی لاوازی چرووساو دەوترێت ٠

ـــ دەڵێی لە کلاَ گەراوە :ـ
واتا : خوارو خێچە وەك گۆزەو دیزەیەك کە لــە
کلدا بگەڕێتو خوار بێــت ٠

ـــ دەڵێی لە گەرووی مار دەرهاتووە :ـ
واتا ( زۆر راستە ) ، زۆر پاکــە ٠

ـــ دەڵێی لە گوێی گادا نوستووە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت لە دەنگو باسێك بێ ئاگا بێت ) ٠

ـــ دەڵێی مارە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە بێ خشپەو دەنگ بــــڕوات
بەڕێـــوە ٠

ـــ دەڵێی ماری حەوتسەرە :ـ
بە یەکێك دەڵێن ١ ـ وەزندی زۆر بێت ٠ هارو هــاج
بێــت ٢ ـ بە توانا بێــت ٠

ـــ دەڵێی ماستمان خواردووەو دۆمان بەو داوە :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە لە هیچە لە خۆیەوە زویر بێت )

ـــ دەڵێی ماکەری ئابلاَخە :ـ

ئابلاخ دێیەك بوو لە رۆژ ئاوای سلێمانیدا ئێستە گەڕەکێکە لەسلێمانی • ( بە یەکێك دەوترێت کە هیچی لە دەست نەیەت ، بوودەلە بێت )

دەڵێی ــ دەڵێی مانگای مالوانە :ــ
مالوان دێیەکە لە شارەزوور لەوەڕی چاکی بۆ ئاژاڵ هەیە • واتا وەك مانگای مالوان قەلەوو قــــورس‌و زۆر خۆرە •

ــــ دەڵێی مەڕە ــ مەڕی گێژە :ــ
واتا : بێ دەسەلاّت‌و بێ دڕك‌و مردەلۆخەیە •

ــــ دەڵێی مەڕی پێغەمبەرە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بەستەزمان بێت •

ــــ دەڵێی مەشکە تاڵ دەدات :ــ
مەشکە تاڵ دان = جەوتی تێ هەڵدەسوون تا خۆشی بکات بۆنی مەشکەکە ببڕێت ، ئەگەر بۆتێکی هەبێت ، بەوە دۆکەی خۆش دەبێت • ئەمە بە یەکێك دەڵێن چــا زۆر بخواتەوەو چاکەش خەست بێت •

ــــ دەڵێی مەکۆی جۆلاّیە :ــ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بێت‌و بچێت‌و ماخۆلانی پێ کەوتبێــت •

دەڵێــی ــ دەڵێی مەیموونە :ــ

به یەکێك دەڵێن کە ناشیرین بێت •

— دەڵێی مریشکە بەکــرە :ــ
به یەکێك دەڵێن هەر لەماڵەوە خزابێت‌و نە چێتــە دەرەوە •

— دەڵێی مریشکی ئاشــەوانە :ــ
( بە یەکێك دەڵێن بەسەر ئەم‌و ئەوەوە بلەوەڕێت )

— دەڵێی مریشکی ئاوەرووتکراوە :ــ
بە یەکێکی رووت‌و رەجاڵ دەوترێــت •

— دەڵێی مریشکی رەبیــە :ــ
( دەڵێن : بۆچی من مریشکی رەبیم ؟ واتا بــێ دەسەڵات‌و بێ خــاوەن‌و بەستــەزمــان ؟ مریشـــکی رەبی = مریشکی خوایی ، بێ خاوەن هەر کەسە هەستێت داگیری بکات )

— دەڵێی مشتەی ناو هەمانەیە :ــ
( بە یەکێك دەڵێن کە بە نهێنی زمان‌و دەستی لە کــــاردا وەزند بــدات ) • ئــەم وتــە جێگــرە لەو چیرۆکــە فولکلۆرییەوە هاتووە کە باوەژنەکە مشتویەك دەخاتــە هەمانەیەکەوەو لە هەنەزاکەی پێ دەدات‌و یەکی هەنەزاکەی پێ دەخات •

دەڵێی ــ دەڵێی مشکــە :ــ

له بچووکــیو ڕیۆلەیــدا •

— دەڵێی مشــکی جەوالدڕە :ـ
( بە یەکێکی ـ بچووکی ـ بزێوی دڕ دەڵێن )

— دەڵێی مشکی سەر تەختەیە :ـ
( بە یەکێکی بچووکی جرپنی جەربەزە دەوترێت )

— دەڵێی مشــکی ناو جەواڵە :ـ
( بە یەکێکی بچووك دەوترێت کە بەرگی یەکێکی لــــە خۆی گەورەتری لەبەر کردبێت ) •

— دەڵێی مقەبایــە :ـ
١ ـ بە یەکێك دەڵێی نقەی لە خۆی بڕیبێتو وەك بێ زمان قسە نەکات ٢ ـ ( بــە مرۆڤــی ڕەقو تەقیش دەوترێــت )

— دەڵێی من کرە دەکەمو ئەو دەیخوات :ـ
یەکێك ئەمە دەڵێت کە ڕقی لە یەکێکی تر بێتو حەز لــە چارەی نەکات • واتا : رقم زۆر لێیەتی •

— دەڵێی منارەی چۆڵیــە :ـ
١ ـ واتا : پەرپووتو پەرێشانو تەریکە ٢ ـ بێکەلکەو سوودی بۆ کەس نییە •

دەڵێــی ــ دەڵێی مۆتەکەیــە :ــ

( مۆتەکە ژنێکی ئەفسانەیە حەز لە کوڕی باڵق دەکات لە خەوتندا بە خۆیەوە دەیگوشێت ، لەبەر ئەوە ئەو کوڕە دەماری سست دەبێت دەنگی دەگیرێت ، تا دەست بــۆ بەندەخوێنەکەی نەبات یا خەبەری نەبێتەوە مۆتەکەکە لێی نابێتەوە ، ئەوسا مۆتەکەکە لە ترسا بەری دەدات ) ئەمــە بە یەکێکی قەبەی قورس دەڵێن کە بچێتە کۆڵی یەکێک •

ــ دەڵێی موویان بۆ هەڵکڕوزاندوە :ــ

بە یەکێك دەوترێت کە لە ناکاو پەیدابێت سا تۆ بتەوێت یان نەتەوێت ئەو لەوێ ئامادەبێت • ئەو مووەش هــــی چیرۆکە ئەفسانەکانی کــوردە •

ــ دەڵێی مووی لووتــە :ــ

بە یەکێك دەوترێت کە پیاو لێی وەڕس بێتو لــە پیاو نەبێتەوە ، لێی دوور نەکەوێتەوە •

ــ دەڵێی مۆرانەیە :ــ

بە یەکێك دەڵێن کە ڕووی کردە شتێك کارێك ، تا تەواوی نەکات واز نەهێنێتو بچێتە بنجو بناوانی ئــەو شتە ، ئەو کارە ٢ ــ یەکێك بەداخەوە بە یەکێك دەڵێت : بووی بەمۆرانە بۆم • واتا : دات رزاندم پەکت خستم ، هێندە ناسۆرو دەردت دامێ • هێندە زیانت پێ گەیاندم •

دەڵێی ــ دەڵێی‌میرخوناوکەیە :ــ

به یەکێك دەڵێن کە خوتەو بۆڵەی زۆر بێت •

— دەڵێی مێردەزمەیە :ـ
( به یەکێك دەڵێن کە زۆر قیرسیچمە بێت لەیەکێك ئاڵا لێی نەبێتەوەو تەنگی پێ هەڵچنێت • مێردەزمە = گیانلەبەرێکی تێرینەی ئەفسانەیە گوایا شەو ئەگەر یەکێك بە تەنیا بە چۆڵێکدا بڕوات ، بۆی دێتە دەرەوەو باز دەداتە سەر شانی ، سواری قەلاندۆشکانی دەبێت لنگی لە ملیەوە دەئاڵێنێتو لێی توند دەکات بە قاچیش هەموو قەبرغەی تێك دەشکێنێتو ئازاری دەداتو لە هۆش خۆی دەچێت ، بە زۆر جۆریش خۆی دەنوێنێت )

— دەڵێی مێرووڵەیە :ـ
لە سستیدا ، لە ڕۆیشتندا ، لە وردیدا

دەڵێی ـ دەڵێی میزە پشیلەیان لە بەری پێی داوە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە زۆر هاتوچۆو جرتو فرت بکات )

— دەڵێی میزی حوشترە :ـ
بە یەکێك دەڵێن بەرەو دوا بڕوات •• وەك چۆن میزی حوشتر بۆ دوواوەیە ، واتا : پێش ناکەوێت هەر دەداتە دواوە •

— دەڵێی میزی گایە :ـ
لە چەوتیو ناراستیدا

— دەڵێی مێشی مردووە :ـ
واتا : بوودەڵەیەو بەستەزمانو ستە •

— دەڵێی نازداری قازی بەنێیە :ـ
( قازی بەنێ = زیارەتگایەکە لە شێوی قازی ، لە ناوچەی قەرەداخ ، ژنان بۆ منداڵ دەچنە سەری هەیە منداڵی دەبێت هەیشە نابێت • ئەوەی کە بووی لای دایکو باوکی زۆر خۆشەویست دەبێت پێی دەڵێن نازداری قازی بەنێیە• جا هەرکەسێکی تر منداڵەکەی زۆر خۆش ویست دەڵێن منداڵەکەی نازداری قازی بەنێیە ) جاری واش هەیە بە تەوسەوە دەوترێت • واتا نابێت کەس پیا هەڵبشاخێت •

— دەڵێی نانی بەسەر ساجەوەیە ـ نانی لەسەر ساج سووتاوە :
بە یەکێك دەڵێن کە لە کارێکدا پەلەی بێت • دەڵێن : خۆ نانی بەسەر ساجەوە نەسووتاوە • واتا پەلەی نییە یان پەلەی چییە ؟

دەڵێی ـ دەڵێی نەبای دیوەو نە بۆران ـ نەباران :ـ
واتا : بە تەنگەوە نایەتو چەقاوەسووە ، لایەنی بێعاری گرتووە • ( بە یەکێك دەڵێن کە لەسەر کارێك ، سزایەکی سەخت درابێت ، کەچی دوای سزاکە ، دەست بەکارەکە ـ بە خراپەکە ـ بکاتەوە ) •

— دەڵێی نەنان دەخواو نەئاو :ـ
بە یەکێك دەڵێن زۆر لاوازو چرووساو بێت

— دەڵێی ئێرە ورچە ـ ورچەکەی دەبۆیە :ـ
واتا : قەبەو زلەو ناشیرینە .

— دەڵێی ئیسکینەیە :ـ
واتا لە خۆیەوە هەڵدەچێتو تووڕە دەبێت .

— دەڵێی وەستا مەحمودی بێ قنگە :ـ
بە یەکێك دەڵێن خۆی بە قنگەوە نەگرێت ، هەر حەز لە ڕاکشـــان بکــات .

— دەڵێی هەر مێشیشی میوان نییە :ـ
١ ـ بە یەکێك دەڵێن چەند بلنگی بکەیت ، قسەی پـــێ بلێیت ، تیرو توانجی تێ بگریت ، یان ئامۆژگاری بکەیت بە دەربەسەوە نەیەتو گوێ نەداتێ ، خۆی لێ کەڕ بکات.
دەڵێی ـ دەڵێی هەنگی لە داردا دۆزیوەتەوە :ـ
بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە شتێکی دەستگیر بوویێتو زۆر دڵی پێ خۆش بێت ، گەرچی شتەکە ئەو بایەخەشی نەبێت .

— دەڵێی هەوری بەهارە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە زۆر تووڕەو دەنگقەبەو گرمەگرمکەر بێـــت .

دەمــاخ ـ دەماخ بەرزە :ـ
( بە فیزو[illegible]یە )

— دەماخ ناسووتێنێت :ـ

خۆی نارەنجێنێتو دلسۆزانە کارەکە ناکاتو بە تەنگەوە نایەت ٠

دەماخی ـ دەماخی خۆی بەسەردا تەخت کرد :ـ

بە گەنجەفەوە داخی دلی خۆی پێ ڕشت ، واتا : تیر قسەی پێ وت ، سزای دا ، زیانی پێ گەیاند ٠

— دەماخی سازە :ـ

١ ـ دلی خۆشەو لەسەر هەوەسە ٢ ـ کارەکەی بۆ ساز بووە ٠

— دەماخی شکاند ـ لە دەماخی دا :ـ

لە خۆشی کرد ، لە گەنجەفەی کردو لووتی هێنایەوە بەر خۆی بەوەی کە قسەی پێ وت ، جوو بەگژیدا ٠

دەمار ـ دەمار کرژە :ـ

( بە مەردومی چابوکی توندو تۆلی لێهاتوو دەلێن )

— دەماری بزووت :ـ

ڕەگی پیاوەتیی‌و ئازایی بزووت ، بۆ کار ، بۆ شەڕ بۆ هەرشتێك بێت ٠

— دەماری دەرهێنا :ـ

١ ـ تۆلەی خۆی لێ کردەوە ٢ ـ بەسەریدا زاڵ بوو
٣ ـ کارەکەی جێبەجێ کـرد ٠

دەم ـ دەمەتەقێ دەکەن :ـ
پێکەوە بە قسە ڕادەبوێرن ٠

ـــ دەمە چیت لێ کەمـە :ـ
١ ـ ( بە یەکێك دەوترێت کە لە وتنی قسەی باشدا بەخێل بێت ) ٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە گفتێکی دابێت یان قسەیەکی کردبێت بەڵام بۆ هەڵخەڵەتاندن بوو بێت ، یـان داوای لێ دەکرێت کە ئەو گفتە بدات ، ئەو قسەیە بکات با هەر بۆ خەڵەتاندنیش بێـت ٠

ـــ دەمە داچەقێیەتـی :ـ
واتا خەریکـە بمرێـت

ـــ دەمە لاسکەیەتـی :ـ
بە گاڵتە پێ کردن و سوککردنەوە لاسایی ئـەم و ئـــەو دەکاتەوە

دەم بە ـ دەم بە هاوارە :ـ
بێ ورەو ترسنۆکە ، لە هەموو شتێکدا هـــاواری لێ هەڵدەستـێ ٠

دەم بـڵ ـ دەم بڵـە :ـ

١ ـ لە قسەکردندا بلمە بلمی دێت وەك دانـی لە دەمدا نەبێت وایە ٢ ـ دەم خـاوە ٠

دەم پاراو ــ دەم پــاراوە :
قسـەزانو زمــان لووســه •

دەم تەڕ ــ دەم تەڕی کاسە وشــك :ــ
( بە یەکێك دەوترێت کە بە قسە هیچی نەهێشتبێتەوە
وەکی تریش هیچی لە باردا نەبێت ) •

دەم چەوت ــ دەم چەوتە :ــ
قسە نەزانو بێ دەسەڵاتە ، بڕوا بە قسـەی ناکرێتو
کەسی پێ لاس نادرێت ، کەس بەقسـەی داناکەوێت •

دەم دڕاو ــ دەم دڕاوە ــ دەم شـــڕە :ــ
قسە لە دەمیدا ناوەستێت زوو بڵاوی دەکاتــەوە •
نهێنیی قایــم نییە •

دەم درێژ ــ دەم درێژە ــ زمان درێژە :ــ

دەم ڕاست ــ دەم ڕاستە :ــ

١ ــ پیاوماقوولە ٢ ــ قسە ڕەوایــە ، بەزمانـــــەو
قسەزانە ، قسەی لێ وەردەگیرێت •
دەم ڕەش ــ دەم ڕەشە :ــ

نوقڵانەی خراپ لێ دەداتو قسەکانــی چـــــاك
ناهێنێــت •

سیرمه ــ سیرمه ڕەقــه :ــ
به یەکێك دەڵێن که لەگەڵ ئەوەدا لاواز بێت قایم‌و
جیــڕو بەکێش بێــت •

ســیروان ــ سیروان لێیشت نەدەم هەر دەم‌بەیت :ــ
( یەکێك ئەمه دەڵێیت که خۆیشی نەخاته ناو گێژاوەوه
کەچی نارەحەتی‌و چەرمەسەرێی هەر تووش بێت )

ســیرو ــ سیرو پیاز پێکەوه نایانکرێت :ــ
به دوو کەسی ، یا دوو شتی دژ بەیەك دەوترێت کـــــه
هەرگیز کۆ نەبنــەوه •

ــــ ســیرو پیازیانه ــ ئەم دەڵێت سیرو ئەو دەڵێت پیاز :
واتا ناتەباو ناڕێکن • شەڕه قسەیانەو بەرپەرچی یەکتــر
دەدەنەوه •

سیســه ــ ســیسه‌مــاره :ــ
لاوازەو ســت وەك ماری سیس وایه •

سیکەنــه ــ سیکەنەو سەرخانــه :ــ
( سیکەنەو سەرخان دوو دێــن لەپشت قەڵادزێـــــوه
سۆفییەکی لێ بووه که لەوێ سۆفی جێی شێخ‌و پیـــری
شوێنانی تر دەگرێتەوه ، ئەو سۆفییه زۆر نانبدەو خاوەن
دیوەخان بووه ، لای هەمیشه قەڵەبالغ بــووه •
واتا : بۆچی دیوەخانەکەی سیکەنەو سەرخانه ، هەرچــی
بێت جارو دوو جاری بۆ نەیێــت ؟ )

سیٖودوو ـ سیٖو دوو مالـەیٖ کرد :ـ
سەری بە گەلێك ماڵەوە نا زۆر گەڕا •

سیٖودوو ـ سیٖو دووی دڵی خۆی دەکات :ـ
کەوتۆتە لێکدانەوەو هەلگێڕو داگێڕی کارەکە

سیٖو دوو ـ سیٖو دووی لیٖ ناکات :ـ
( بۆ کردنی ئەو کارە زۆر سوورەو بیری لیٖ ناکاتـەوەو دەیکات ) • لە کردنی کارەکە رارا نییەو گورج لێی دێتە دەسـت •

سـسی ـ سییە وشکەی گەیشـتیٖ :ـ
واتا زۆر تینوویەتی • ( سییە وشکە نەخۆشییەکە بـە هێندێـك گیاندار دەگات ، هەمیشە دەمو قوڕگی وشك دەبێـت •

شـــا ـ شا به شالیاری ـ سەپانی ـ خۆی نازانێت :ـ

له کارەکەیدا سەربەستە ، سەربەرزە ، بێباکو ئەترسە ·

ـــ شا بێ شالیار نابێت :ـ

شـــالیـــار : وەزیر ·

( له کاتی دەعوەتێك یا شاییەك ، یا کۆبوونەوەیەکدا دەوترێت که دەپرسی ئەرێ فلانی تێدابوو · بۆ فلانێك لەم شتانەدا هەر هەبێت دەڵێت · چۆن ؟ شا بێ شالیار نابێت ) · جاری واش هەیە به تەوسەوە یا بۆ سوکێتی به یەکێك دەڵێن که هەمیشە دووی یەکێکی تر بکەوێت ·

شاباش ـ شا باشی خۆی داوەو قنج هەڵدەپەڕێت :ـ

( واتا پێویستی سەر شانی خۆی بەجێ هێناوەو هیچی بەسەرەوە نەماوەو له هیچ ناترسێت ) ·

شابەندەر ـ شابەندەرێکه بۆ خۆی :ـ

به ئافرەتیکی شاته شاتکەری دەم شڕ دەوترێت · واتا بێ ئابڕووەو چەرداوەڕووە ·

شـــات ـ شـاتو شـووت :ـ

دەڵێن ئەو ئافرەته شـاتو شـووتکەره

شووت ≑ دەنگێکی بەرزی ناسازە · واتا هەمیشە دەنگی دێت بە
هەق و ناهەق دەشیرینێت ·

شاخ ـ شاخی لێ رووا وە :ـ
واتا ≑ زۆر پەشیمانە ·

شار بەدەر ـ شاربەدەر کرا :ـ
دوور خرایەوەو سووك و ئەتك کرا · جاران ئافرەتێك پیاوێك ،
زینای بکردایە ، شتێکی بکردایە ، سزاکەی هی ئەوە بوایە ئەم
سزایە بدرایە ، سەری پاك دەتاشرا ، پشتاوپشت سواری
کەرێکیان دەکرد رووەو دەری شار دەبرا ، جاری وا هەبوو
پەردەپارانیشیان دەکرد یان خۆل و دۆییشیان بەسەردا دەکرد ·
دەیانگوت شاربەدەر کراوە ·

شاری ـ شاری بێ حاکمە :ـ
واتا کەس بە کەس نییەو هەر کەسە بۆ خۆیەتی یان دەڵێن : بۆ
شاری بێ حاکمە ؟ واتا کار بەرەڵا نییەو کەس ناتوانێت دەستدرێژی
بکات ·

ـ شاری خامۆشانە :ـ
دەڵێن دەڵێی شاری خامۆشانە شاری خامۆشان ≑ گۆڕستانە · واتا :
ئەو شوێنە کڕو کپە وەك کەسی تێدا نەبێت و هەموو مردبن وایە ·

شازادە ـ شازادەیە !؟ دەڵێن شازادەیە ! :
بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە بە فیزو دەعیە بێت ·

شاسوار ـ شاسواری ـ ئەم کارەیە ـ ئەم کۆڕو مەیدانەیە :ـ

( واتا لەو کارەدا زۆر بەڵە دەو شارەزایە ، لەو کۆڕەدا زۆر چابوكو ئازایە ، وشەی شاسواریش یەلکەی چابوکیی و ئازایی کوردە ، هەمیشە سوارچاك بووە ، سوارچاکیشی لا گەورە بووە بۆیە کردوویە بە نموونەی پیاوی بەکار ) ۰

شاف ـ شافێکی پێ هەڵگرت :ـ

بە قسەی لووس لاسی داو لە خشتەی برد ۰

شان بە ـ شان بە شانی یەك دەڕۆن :ـ

وەك یەکن ، چون یەك لە برەوو پێشکەوتندان ۰

شانی ـ شانی خاڵی کردگە خەوەر ناپرسێت :ـ

خۆی باری سووکە ، ئاگای لە کەسی تر نییەو گوێ ناداتە کەس ۰

شانی ـ شانی خۆی ناردداوی دەکات :ـ

لە کارێکدا ، قەوماوێکدا ، ئەوی تێدا نەبووە ، وای دەر دەخات کە بەشداری کردووە ، یان ئەو کردوویەتی لە هیچی نەبوو خۆی لە کەدار ، تاوانبار دەکات ۰

ــ شانی دادا :ـ

١ ـ ( لە ڕووی سووکییەوە بە یەکێك دەڵێن کە بمرێت ) ۰

٢ ـ بەزی ، ملی شۆڕ کردو بەسەریدا زاڵ بوون ۰

ــ شانی دایە بەر :ـ

١ ـ چووە ژێر کارە گرانەکەوە ۰

# ش

٢ ـ ئارامی گرت ، بەرگەی ئەرکەکە ، سەختییەکەی گرت .

شان کووڕی ـ شان کووڕییە بۆ ئەو :ـ

دەڵێن شان کووڕییە بۆ ئەو بچێتە ریزی ئەوانەوە واتا : تزمییەو بایە نەوینەو کەم کردنە •

شان لە ـ شان لە شانی ـ ئەو ـ وەزیر ـ فیسار دەدات :ـ

واتا : هاوتایەتی ، وەك ئەوە ، خۆی وا دەنوێنێت کە وەك ئەو بێتو لە ریزەی ئەودا بێت •

شانی ـ شانی لێ دەخوریت ـ لووتی لێ دەخورێت :ـ

حەزی لێ دەکاتو دڵی بۆی دەکورکێنێت •

شانو ـ شانو شەپکی جوانە !! :ـ

بۆ گاڵتە پێ کردنە بە یەکێك کە هەمیشـە شان داچـەکاو بێت گاڵتە پێ‌کردن بە یەکێك کە ناتەواو بێت ـا لـە هـەر روویەکەوە بێت • واتا : با بەدەردی خۆیەوە دانیشێتو جرتو فرتی ببڕێت کوری ئەو کارە نییە •

شایەر ـ شایەرە ـ شایەرێکە بۆ خۆی :ـ

باش دەخوێنێتو بە خـەڵکدا هـەڵ دەدات • زمان لوسـەو مەراییکەرە •

شاییەکەی ـ شاییەکەی بناوێڵەیە :ـ

بناوێڵە دێیەکی ناوچەی شارباژێرە • شاییەکی تێدا کـراوە ،

درێژەی زۆر کێشاوە ، چونکە هەرچەند یەکێك لە دێیەکی ترەوە بە میوانییان هاتبێت • دەست گیراوەتەوەو شاییەکە تازە کراوەتەوە ئەمە بە کۆڕو کۆمەڵێك دەڵێن کە زۆر قەڵەباڵغ بێت‌و خەڵکێکی زۆری ڕێوە بنیشێتەوەو درەنگیش کۆتایی بێت‌و بڵاوەی لێ بکەن •

شایی‌لۆغان ـ شایی‌لۆغانە :ـ

واتا : کار شپرزەیەو بە یەکدا چوونەو کەس لە کەسەوە دیار نییەو شیرازە تێك چووە •

شەپ‌و ـ شەپ‌و شۆڕ :ـ

شەپ دەنگی کەوتنی جلێك ، قوماشێك لە شتێك یان لە خۆی • واتا بەرگەکە شۆڕەو شەپەی دێت •

شەپێکی ـ شەپێکی بە قوونیدا دا ـ شافێکی پێ هەڵگرت :ـ

بە قسەی لووس هەڵی فریواند ، هەڵی دا ، لە خشتەی برد •

شەرە ـ شەرە بێرە کوڵم ئەمەیە :ـ

لە هەلوێستێکدا دەوترێت کە پیاو بە زۆر تووشی هەراو شەڕ ، دڵ ئازاری بێت‌و ئەو ئامادەی ئەو هەلوێستە نەبێت‌و نەیەوێت •

ـ شەرە دەنووك :ـ

واتا شەرە قسە • دەڵێن : شەرە دەنووکیانە •

شەرە ـ شەرە سەگ :ـ

دەڵێن ئەم شەرە سەگە بە مَن ناکرێت • واتا کارێکی بە ئەرك‌و

گرانه ، کارێکی پیس و نا شیرینه پیاو لێی بێزار دەبێت ، به رقو بێزارییەوه ئەمه دەوترێت ٠

ــ شەڕه شەق :ــ

١ ــ ململانێو زۆرانبازییەکی ماندووکەر ٠

٢ ــ کارێکی به ئەرکو گران ٠

شەڕ ــ شەڕ فرۆش :ــ

شەڕانی ، شەڕەنگێز ٠

شەڕواڵ ــ شەڕواڵ ــ کەفتگه ــ کەوتووەته ــ سەر قاپی :ــ

واتا : یا شلّی هەڵدراوه ، دەرکەوتووه ، کەمو کووڕی دەرکەوتووه ، لەکەو عاری ئاشکرا بووه ٠

شەڕو ــ شەڕو پەت :ــ

شتی لەتو پەت ٠

ــ شەڕو شۆڕ :ــ

هەراو پشێوی‌و ئاژاوەی ٠

ــ شەڕو گەڕ :ــ

دەڵێن کەوتۆته شەڕو گەڕ ٠

واتا : کەوتۆته بیانوو گرتن‌و دەست درێژی‌و خراپەکاری ٠

شەڕی ــ شەڕی خۆ تێنه :ــ

شەڕێکه ، زۆرانبازی‌و ململانێیەکه ، ئەو کەسەی تێ هەڵدەچێت

دەشکێت چونکە هێزو توانای هێندەی بەرامبەرەکەی نییە ٠

شـــەڕی ـ شەڕی ڕۆیشتووەو خێری ماوە :ـ

دەڵێن : فلانەکەس شەڕی ڕۆییشتووەو خێری ماوە ٠ بە یەکێك دەوترێت کە تابوشتی خراپەکردنی نەمابێتو لە بیری مردنو چاکە کردندابێت ٠

شەریك ـ شەریکی دزو ڕەفیقی ـ کاروانە ـ قافڵەیە :ـ

پیاو خراپە ، بە سەرزاری دۆستەو لە ژێرەوە کۆستە ٠ بە یەکێك دەوترێت بە سەرزاری خۆی بە پیاو باش لای یەکێك ، تاقمێك ، پیشان بداتو لە ژێریشەوە ناپاکی بکاتو بە دووی قازانجی خۆیدا وێڵ بێت ٠

شەفە لەتە ـ شەفە لەتە ـ شیفە لەتە :ـ

دەڵێن دەتکەم بە شەفە لەتە یان شیفە لەتە ٠

( شیفە لەتە = شەفە لەتە = بەری گیای مارگیرە کە سوورو شینو خۆشەو دەم دەکاتەوە) ٠ واتا دەتدەم بە زەویداو شەقت دەکەم وەك شیفە لەتە چۆن دەم دەکاتەوە ، ئاوات لێ دەکەم ٠

شـــەقەی ـ شەقەی ـ قەڵاسە ـ قەڵاسك ـ ی نەبیستووە :ـ

قەڵاسە : قۆچەقانی ٠ بۆ هەڕەشەیە ، بە یەکێك دەڵێن کـــە لاسار بێتو نەیەتە سەر ڕا ٠ واتا سزای لا ساری‌ی خۆت وا دیارە نەبیستووە ، دەیبیسیت ٠ ( دەگێڕنەوە کابرایەکی لەك لە کاتی شەن کردندا بای شەماڵی بۆ تایەت ، لەسەر ئەوە لە خوا توورە دەبێت ،

له رقاندا ئاسمان بەر قۆچەقانی دەدات بە رێکەوت دوای ئەوە بای شەماڵ هەڵدەکات و خەرمانەکەی شەن دەکات ئینجا ئـەم بەندە دەڵێت : هەتا شەقەی قەڵاسکی نەبیست گێـڵو گەنمی نەکرد • گێل : گێژ • واتا تا شەقەی قۆچەقانێت نەبیست بات بۆ شەنکردنی خەرمانەکە نەنارد) • (بە یەکێك دەڵێن کە ساردیو گەرمیی رۆژگاری نەچەشتبێت) •

شـەقڵ ـ شەقڵی شکاند :ـ

شەقڵ = دەق = جۆرە نەخشێکە بە شەقڵە کە خاکەنازێکی دارە لە خەرمانی سوورکراو دەکێشرێت بۆ ئەوەی دزیی لێ نەکرێت • جا ئەگەر ئەو نەخشە شکا ئەوە شەقڵی خەرمانەکە شکاوە • واتا : لەبەر چاوی خەڵك ئەو کەسەی شکاندو کەمو کووڕو سووکی کرد •

شـەقی ـ شەقی پێ برد :

واتا ئارامی لەبەر بڕیو دەمارگیری کرد ، خـەفەتی دایەو دیقە دیقەی دا •

شـەقو ـ شـەقو پەقی کـرد :ـ

واتا لەتو پەتی کرد •

ـــ شـەقو شڕی کرد :ـ

لێکی ترازاندو هەڵوەشاند وای لێ کرد شەقە شەقی بێت •

ـــ شەقو شوق بووە ـ لەقو لوق بووە :ـ

واتا شل بۆتەوەو لەیەك ترازاوەو شەقەی دێتو دەجــووڵێتو

شەقەی لێ کەوتووە ·

— شەق و هووڕ :ـ

شەق دەنگی بەیەکدادانە ، لە یەك کەوتنە · دەڵێن شەق و هووڕی دەرگاکان دێت واتا دەرگاکان بە یەکدا دەدرێت و دەنگێکی زۆرو بەرزی لێوە دێت ·

شەکر ـ شەکری شکاند :ـ

بۆ تەوس و گاڵتە پێ کردنە · واتا بۆ خۆی وت ، قسەیەکی نابەجێی کرد · ناماقووڵی کرد ·

شەل ـ شەلم کوێرم ناپارێزم :ـ

واتا بەبێ لێکدانەوەو هەواڵی هیچ زانین و بەتەنگ هیچ و کەسەوە هاتن دەست دەوەشێنێت و پەل دەکوتێت ·

شەل ـ شەل نییەو پای شکاوە :ـ

بۆ تەوسە ( بە شتێکی عەیبدار دەوترێت کە خاوەنەکەی بە ناوێکی تر ناوی بەرێت ) واتا : ئەویش هەر وەهایە و جیاوازییان نییە وەکو : دەڵێن فیسارە کەس دز نییە بەڵام لەکاتی دزییەکەدا لەگەڵ دزەکان بوو دەوترێت : شەل نییە پای شکاوە ·

شەل ـ شەل و پەت :ـ

شەل = گێڕو ناتەواو · واتا گێڕو ناتەواو و لەت ، کەم و کووڕ ·

شەل ـ شەل و شکستی کرد :ـ

شتەکەی شکاندو پەکی خست ، ناتەواوی کرد · عەیبداری کرد ·

شـــەمە ـ شەمە لە مانگ ببڕێت :ـ

دەڵێن : با شەمە لە مانگ ببڕێت ئەو کارەت بۆ دەکات . بە تەوس‌و
گاڵتەوە دەوترێت . واتا : هەرگیز ئەو کارە ناکرێت‌و چاوەڕێی مەبە
چونکە شەمە هەرگیز لە مانگ نابڕێت .

شـــەنە ـ شەنە لەمەنە کەمتر نییە :ـ

بۆ بەراوردی‌ی دوو کەسە ، دوو شتە . واتا : هەردووکیان وەک
یەکن‌و لە تای ترازوویەکدان‌و هیچیان لەوی تر کەمتر نییە .

شـــەن ـ شـــەن‌و کەوی دەکات :ـ

لایەنی باش‌و خراپی دەردەخات .

شـــەنگ ـ شەنگ‌و بەرەکەتە :ـ

هەلووژەو گوێز کە دوو دوو یان سێ سێ دەگرن دەڵێن : شەنگ‌و
بەرەکەتە هەرشتێکیش فەڕی وا زۆر بێت هەر وای پێ دەڵێن .

ـــ شەنگ‌و شوخ :ـ

پیاو یا ژنی سەلاری ڕێک‌و پێک‌و جوان .

شـــەو ـ شەو تەڵای مێردانە :ـ

مێرد = پیاو وکوڕی ئازا ( چونکە تاریکەو پیـــاوی ئازا جی بوێت
دەیکات ) .

شـــەوە ـ شەوە گوشیویەتی :ـ

بە گاڵتەوە بە یەکێک دەڵێن کە لەڕو لاواز بێت . ( شەوە ، لـە

ئەفسانەی کورددا ژنێکی جنیو شەیاتینی‌یە بێ دینە وەجاخ کوێرەو مندالی نابێت ، لەبەر ئەوە حەز ناکات ژنی دینداران مندالیان بێت • هەر ژنێك مندالی بوو ، ئەو شەوە ئەو حازر دەبێت ، کە هەلی دێ ، مندالەکە دەگرێو هەلی دەگوشێت شینی دەکاتەوە تا دەیکوژێت ، لەبەر ئەوە سووژن ، سیر ، پیاز ، تیرو کەوانی قامیش تیغ ، بەدەوری مندالەکەدا دادەنێن ، تا حەوت رۆژیش بەشەوو رۆژ ئێشکی دەگیرێت ) گەلێك مالی وا بووە تا بەیانی شەوارەیان دەگێڕاو ، گۆرانیو بەزم بوو تا بەیانی •

شەولەبان ـ شەولەبان :ـ

بۆ ترساندنی مندال بە باگردێنیان وتووە شەولەبان ، وتوویانە گەر نەنوویت شەولەبانت بۆ بانگ دەکەین •

شەو ـ شەوی بە کۆلەوە گرت •

واتا شەو هەر زوو کەوتەرێ •

ـ شەوی لێ کرد بە شەوی دەیجوور :ـ

واتا : ستارەو خۆشی لەبەر بڕیو شەوەکەی لێ کرد بە دوو شەو • دەیجوور : عەرەبی‌یە ، واتا : تاریکیەکی وا چاو چاو نەبینێت •

شەیتان ـ شەیتان بازارە :ـ

واتا : بازارێکە هەرکەسە بۆ خۆیەتیو شت بە نرخێکی جیا لەوی تر دەفروشێتو هەر رۆژەی بە نرخێکیش شت دەفرۆشێت •

— شەیتان پێی پێکەنیوە :ـ

یەکەم جار شەیتانی بووە ، بلۆوق بووە ٠

— شەیتان چۆتە بن کلێشەیەوە ـ بن کەلێشەیەوە :ـ

(واتا : دەروونی ئادەمیزاد ، تاو قەپێلکو قالبی ئینسانەوە هانی دەدات بۆ کردەوەی نالەبار ) بن‌کلێشە : بن‌دەست ٠ بە یەکێك دەلێن کە کارێکی نابەجێ بکات ، یان نیازی کردنی هەبێت ٠

شەیتان ـ شەیتان لە پشتیەوە هێشوو دەکات ـ شەیتان یەك پەلەیە ئەو دوو پەلەیە :ـ

هێشوو = گوڵەوەچنی ٠ بە یەکێك دەلێن کە زۆر فێڵبازو تەڵەکەباز بێت واتا : ئەو لە شەیتان بەدترو بە فێڵترە ٠

— شەیتان ناوبژیکەریان بێت :ـ

( بە دووکەس، دوو دەستەی خراپ دەوترێت کە بەگژ یەکدا بچن٠ واتا : یاخوا هەمیشە هەر لە شەڕدا بن‌و کۆك نەبن ) ٠ چونکە شەیتان هەرگیز ناویژی ناکات ، بەڵکو کاری ئەو هەر بەشەڕدانە ٠

شتێك ـ شتێك بەر دڵت بخە :ـ

شتێك بخۆ با هێزیکت تێدا بێت ، تێ بیت ٠

شت ـ شتی چاك خۆی هاوار دەکات :ـ

واتا پێویست بە پرۆپاگاندە ناکات ، خۆی خۆی دەنوێنێت ٠

— شتی لەبەر چاوە :ـ

بە چاکە دەزانێت ، پێی لێ دەنێت‌و سپڵە نییە ٠

شــتورگا ـ شتورگاو پڵنگن :ـ

شتورگا = زرافة • واتا پەیوەندیی نێوانیان وەك هی شتورگاو پلنگە ، چۆن ئەو دووانە پێکەوە ناگونجێنو پڵنگە کە شتورگا کە دەخوات پەیوەندیی بێ دەسەڵاتو دەسەڵاتدارە ، کردەی ئەمو بردەی ئەو •

شــت ـ شتو مەك :ـ

کەلو پەل •

شــرە ـ شڕەی بەر تۆپەکەیە :ـ

١ ـ هەژارەو رووتو ڕەجاڵە •

٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە جلێکی شڕە لە بەر بکات • دەڵێن : دەڵێی شڕەی بەر تۆپەکەی •

ـــ شڕەو پڕە : ـ شڕەو وڕە ـ شڕکەو پڕکە :ـ

پارچە جل یان شتی تر کە دڕاوو ناتەواو بێت ، لەت و کوتو دڕاو بێت •

شــرت ـ شرتو شۆی لێ بڕی ـ لەبەر بڕی :ـ

دەڵێن : هێندەی لێ دا شرتو شۆی ـ لێ بڕی ـ لەبەر بڕی واتا : هێندەی لێ دا بە هیلاکی برد ، دەقو ڕێکیی بە بەدەنەوە نەهێشت•

ج- شرتو شۆی لەبەر بڕی بەجنێو دایشـــتو شکاندیو بایەخی نەهێشت •

شــڕ ـ شڕو پڕ ـ شڕو وڕ :ـ

دەڵێن : منداڵەکە دەفتەرەکەی شڕو بڕ ، شڕو وڕ کـــرد واتا :

لەت‌و کوتی کرد ، لێکی هەڵوەشاند .

شـڕ ـ شڕو دڕ :ـ

دەڵێن ئافرەتێکی شڕو دڕە . واتا : ئافرەتێکی دڕی ناتەواوە ، بەگژ ئەم‌و ئەودا دەچێت‌و بەدەربەسی هیچەوە نایەت شڕ = ناتەواو .

ـــ شڕو شیتاڵ :ـ

دەڵێن شڕو شیتاڵیان فرێدایە دەرەوە . واتا : کەل‌و پەلە کۆنە تاڵ هەڵوەشاوەکانی کە بێ مایەو بێ نرخن فرێدران .

شـفتە ـ شفتە ژێ دەکات :ـ

دەڵێن ئەو ژنە شفتەژێ دەکات . واتا : زوو زوو منداڵی دەبێت .

شـکاند ـ شکاندی :ـ

دەڵێن فیسارە کەسی شکاند ، شتەکەی شکاند :ـ واتا سووکی کردو پایەو نرخی کەم کردەوەو لەبەر چاوی خەڵکی خست .

شـــل ـ شلە شارییە :ـ

واتا شارییەکە بەرگەنەگرو بێ توانایە .

ـــ شـــل بووە :ـ

١ ـ خەریکە قایل دەبێت‌و مل دەدات .

٢ ـ پەکی کەوتووە ، ماندوو بووە .

شـڵپ ـ شڵپ‌و هووڕ :ـ

دەنگی کەوتنە ناوەوەیە بەڵام بەرزو زۆر ، یان ماچ‌کردن بە دەنگێکی

بەرز · دەڵێن شڵپو هوورِ لە ئاوەکەدا مەلەی دەکرد · یان شلپو هوورِ یەکتریان ماچ دەکرد ·

شـڵق ـ شڵقو هوورِ :ـ
دەڵێن : سکی شڵقو هووڕیەتی ·
دەنگی شلەیەکە کە لە دەفرێکدا ، وەك مەشکە ، کوندە جەوەندە کە بشلەقێنرێت ، بجوو لێنرێت بەڵام دەنگێکی زۆرو بەرز کـە ببیسرێت ·

شـلو ـ شلو شێواوە :ـ
خاوو خلیچکەو شێواوی‌ی هی شلی و ناتەواوییەتی ·

ـــ شلو مله :
واتا : گۆشتنو نەرم ونۆڵە ·

ـــ شلوشۆڕە :
واتا خاوو خلیچێکی بەرگو کاڵا شۆڕێکە دامێنی شـــەپەی دێتو ناپێکە ·

شووتی ـ شووتی‌ی رزیوەو لە دوورەوە بۆنی دێت :ـ
کارەکە خراپو بەدەو خۆی هاوار دەکاتو ئەنجامەکەی لەبەر چاوە ·

شووڵ ـ شووڵی لێ ـ هەڵکێشاوە ـ هـــەڵبڕیوە ـ شووڵی بێعاری‌ی ـ بێحەیایی لێ هەڵکێشاوە :ـ
بۆ بێزاری دەربڕین بە یەکێك دەوترێت کە لە کارێکدا زۆر بڕواتو

لە سنوور دەرچێت ٠

٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە لە چەرداوەڕوویی‌و دەست درێژیدا لە هەموو ئەندازەیەك بەدەر بێت ٠

شوێن ـ شوێنەونی دەکات :ـ

پێچ‌و پەنا دەکات تا نەیناسنەوە ، نەزانن چی دەکات کارەکە چییەو لەکوێیەو چۆنە ٠

ـــ شوێن پێی ئەوی هەڵگرت :ـ

وەك ئەوی کرد ، لاسایی ئەوی کردەوە ، رەوشت‌و کرداری ئەوی هەبوو ٠

شیاکە ـ شیاکەی تێ هەڵسوو ـ لە قنگ هەڵسوو ـ بیکەرە گاگەل :

١ ـ ( زۆر کەڕەواڵەو بەستەزمانە ) ٠

٢ ـ هیچ نازانێت‌و وەك تەپڵی بۆشە ، نەشارەزایە ٠

شێت ـ شێت‌و وێت :ـ

بە یەکێکی دەلووکار دەڵێن یان بە یەکێك تەواو تێکچووبێت‌و هۆشی دنیایی نەبێت ٠

شێر ـ شێرە بە فرینەیە :ـ

واتا : زەلامێکی زلی بێ خونەرە سامی نییەو کەس لێی ناترسێت ٠

شێر ـ شێر بە گوێ دەگرێت :ـ

زۆر بە تواناو ئازاو لێهاتووە ٠

شیر ـ شیردا بۆ داپیردایه :ـ

واتا : ئەم کاره وا زوو نایەته ئەنجام ئەمه له چیرۆکی کلکه کوڵێی مام رێوییەوه هاتووه که داپیرەکه کلکەکـــەی دەقرتێنێتو رێویش داوای کلکەکەی لێ دەکاتەوه · چیرۆکێکی خۆشی منداڵانه ·

شیر ـ شیرو تیر لەیەك دەسوون :ـ

نالەبان ، دوژمنایەتی لەگەڵ یەکدا دەکەن ·

ـــ شیری پاکه :ـ

١ ـ مرۆڤێکی پاكو دڵسۆزو چاکه ·

٢ ـ داوێن پاکه ·

٣ ـ مەترسی لێ ناکرێتو پشتی پێ دەبەسترێت ·

ـــ شیری سەگی خواردووه :ـ

وەك سەگ هارو کەس نـەناسو دڕه ·· دەڵێن : شــــیری سەگیشی خواردبێت وا نابێت ، ئەو کاره ناکات · واتا : هەرچی چۆنێك بێت ئەو بەدخوایيه ناکات · ناپاکی لەگەڵ ناکات ·

شیر ـ شیری میسره خۆی له کالاندا ناگرێت :ـ

شیر = شمشێر · واتا : به غیرەته ، مەردەو شتی نابەجێ هەڵناگرێتو چاوپۆشی لێ ناکات ·

٢ ـ به تەوسەوه به یەکێك دەڵێن که لەهه موو کارێکدا تێ هەڵچێت ·

شیرینی ـ شیرینی خورانی رۆژی زەماوەنی ماگه ـ ماوه :ـ

واتا : خوازبێنی کراوەو هەر گوێزانەوەی ماوه · واتا : کارەکـه شتەکه ناو هێنراوەو هەر ئەوه ماوه تەواو بکرێتو بگیـرێته دەست·

شـــين ـ شين و شەپۆڕ :ـ

گریان و لە خۆدان سەرشین کردن یان گریانێکی گەرمی بەکــوڵ ،
دەڵێن : منداڵ ئەو شین و شەپۆڕەت لە چییە ٠

# ع غ

عـــال ـ عالو سال دانیشه :ـ منداڵێکی عالو ساله :ـ

واتا هێمنو لەسەرخۆبە · هێمنو لەسەرخۆیە ·

عـەلە ـ عەلەو جەلەی زۆرە :ـ

عەلە ≠ عەلی · جەلە ≠ جەلیل یان جەلال · واتا :

١ ـ خێزآنێکی گەورەی هەیە ·

٢ ـ خەڵکێکی زۆر دەورەی داوە ·

عـومر ـ عومری پیرە مەرێکی ماوە :ـ

( لـە دوا دوای تەمەنیدایە ) ·

ـــ عومری نووحی بۆ هاتووە :ـ

( واتا عومری درێژە ، وەك هی نووح پێغەمبـــەر کە لە قورئاندا دەڵێت زیاتر لە (٩٥٠) ساڵ تەمەنی بووە · ئەمەش بۆ حەسوودی ، یان بێزاری بە کەسێك دەوترێت کە تەمەنی درێژ بێت ) لە قرآن‌دا دەفەرموێت (فلبث فیهم الف سنة الا خمسین عاما ) ·

غـار ـ غار بە ئەسپی تۆڕ دەکات :ـ

بە دەستەڵاتو سەرچڵە ، کۆ لە هیچ ناکات ·

غـەز ـ غـەزو بەزە :ـ

واتا زۆر قەڵەوەو چەورەو گۆشتی زۆرە نەرمو شلە ·

# ڤ ف

فاتیحا ـ فاتیحای بۆ بخوێنە :ـ

واتا : ـ لەدەست چووەو تازە نابینرێتەوە ، مردووە ، فەوتاوە ·

فـاق ـ فاقی داوە :ـ تێ قوپاوە ؛ لەبەر لاواز بووە ، لە لاوازیدا وەکو فاقە چەوتاوەتەوە ·

فـاك ـ فاکو فیکیەتی ـ کەوتۆتە فاکو فیك :ـ

کەوتۆتـە :

١ ـ فیـڵو تـەڵەکەبازی ، دەغـەڵی ·

٢ ـ کەڵکەڵەی شتێکی کەوتۆتە کەڵلەوە ·

٣ ـ هـەوەس‌و ئـارەزووی شـتێکی جووڵاوە ·· فـاك = فیـڵ ·

دەڵێن : فلانە کەس کەوتووەتە سـەر فاکو فیـکی ژن هێنان ·

یان لە فاکوفیکی خۆی ناکەوێت ·

فـەرهاد ـ فەرهاد کوژە :ـ

بە پیرێژنێـك ، یـا هـەر ژنێـك دەڵێن کـە بەد بێت ، وەك ئـەو پیرێژنەی کە لە داستانی شیرین وفەرهاددا فەرهادی بە کوشت دا ·

فـەریك ـ فەریکە دێوە :ـ

بۆ پیکەنین بە مرۆڤێکی زۆر قەبە دەڵێن ·

فـەریك ـ فەریکە کەر :ـ

بە پیاوێکی قەبەی نێرەکەر خووی عەقڵ سووك دەڵێن ·

فـەنگ ـ فەنگو فێڵ ـ فەنو فێڵ :
تەڵەکەو فێڵبازی .

فـەنی ـ فەنی تۆ بەسەر شـەڕە سـەگتۆ جی !؟
(فەنی : ناوی تووتە سەگێکە . واتا : تۆ کە هیچت نە باردا نییە چیتە بەسەر زۆرانی گەورەوە ) ، خۆ تتووشی گاشە بۆ دەکەیت . بۆ سووکی بە یەکێکی هەڵەتەکاسە دەڵێن .

فت ـ فتی کرد :ـ
بۆ پێکەنین یان تەوسە . واتا : تەواوی کرد ، لرفی لێ دا ، لای دا .

فـڕە ـ فڕەی باڵی دێت :ـ
مرەوتی نییەو هەمیشـە گەڕە هەر لە هەڵپەدایە . بۆ گاڵتەو تەوس دەوترێت .

فـڕی ـ فڕی بە دنیاوە نییە ـ فڕی بەوەوە ـ پێوە نییە :ـ
١ ـ لێی نازانێت ، تێی ناگات .
٢ ـ ساویلکەو بێ مێشـکە .

فریشتە ـ فریشتەی هەڵکەوتووە :ـ
بۆ تەوسە ، واتا : پیاوێکی ناتەواوە .

فریشك ـ فریشکی خست :ـ
فریشك کەوتن : دەڵێن منداڵ فریشکی دەکەوێت ، گوایا دەماری ژێر باڵی وەردەگەڕێتو تووشی سکچوون دەبێت چارەکەشی بـەوە

دەکەن منداڵەکە سەرەو خوار دەکەنەوە ، وا ماوەیەك ڕای دەگرن پاشان راستەو چەپی دەکەن ٠ دەڵێن : باڵی منداڵەکە ڕا مەکێشە فریشکی دەکەوێت ٠
ئەمە بە تەوسەوە ، بە گاڵتەوە دەوترێت ٠ واتا : تووشی ئازاری کرد٠٠ ترساندی ٠

فـڕو ـ فڕو فێڵ دەکات :ـ
واتا کەوتۆتە فێڵ کردن پاشان فڕینو خۆشاردنەوە ٠

ڤـڕو ـ ڤڕو هووڕ :ـ
ڤڕە ڤڕێکی زۆرو بەرز ٠

ڤـژو ـ ڤژو هووڕ :ـ
دەنگی جووڵانی با ، یان ئاو بەڵام زۆرو بەرز ٠

فس ـ فس فس باڵەوانە :ـ
واتا : فشەکەرێکی هیچ لەباردا نەبووە ٠ بە یەکێکی گردەڵـــەی بچووکی بی جورم دەڵێن کە هەر لە فشەی دابێت ٠

فس ـ فسی دایەوە :
بەزی ، کۆڵی دا ، وازی هێناو کارەکەی تەواو نەکـــرد ٠ لـە فسدانەوەی مریشکەوە هاتووە بۆ سووکیی ئەو کەسە دەوترێت ٠

فش ـ فشو فۆڵ :ـ
دەلب ٠

— فش‌و هوور :ـ

فش دەنگی دەرچوونی بایە لە شتێك بەڵام فشەیەكی زۆرو بەرز دەڵێن : فلانەكەس فش‌و هوور زۆر دەكات ، فشە فش زۆر دەكات، فشە زۆر دەكات . ئەمە بۆ گاڵتە پێكردن‌و تەوسە . واتا : درۆی زل زل دەكات ، خۆی زۆر هەڵدەكێشێت درۆكانی بە باڵ دەفڕێت درۆو قسەكانی وەك بایەكە كە لێی دەرچێت .

فلسێك-فلسێكی دایكیەتی‌و یەكێكی باوكی :ـ

زۆر پارە پەرست‌و پوولەكی‌یە .

فلق ـ فلق‌و هوور :ـ

لوولەكێك (اسطوانة) بخرێتە لوولەكێكی ترەوە شلەیەك لە نێوانیاندا بێت لە كاتی هێنان‌و بردنیدا دەنگێك پەیدا دەبێت ئەوە فلقەیە . هوور = زۆرو بەرز كە ببیسرێت .

ڤنگ ـ ڤنگ‌و هوور :ـ

ڤنگ دەنگی خولانەوەیەكی تیژ واتا ڤنگە ڤنگێكی زۆر .

فۆتە ـ فۆتە حەمامی‌یە ـ پەشتەمالی حەمامە ـ هەر رۆژە وا بەبەر یەكێكەوە :ـ

بە یەكێكی بێ باری بێ وەفای هەلپەرست دەڵێن كە هەر رۆژەی لەگەڵ یەكێكدا بێت‌و بە پێی كەڵك و قازانجی خۆی لەگەڵ رۆژدا بگەڕێت .

فوو ـ فوو لە دۆ ناكات :ـ

لە ماڵی حەرام‌و حەلال ناكۆڵێتەوە ، لە سامان پێكەوەناندا بەتەنگ

هیچەوە نایەت‌و هەرچی بێت نەیماشێتەوە ، گوێ بە پیس‌و پاکی نادات ٠

فوو ـ فووی داوە :

١ ـ بەزیوە ، پەکی کەوتووە ٠

٢ ـ لەبڕ بووە هێزو گوڕی نەماوە ٠ وەك کوندەیەکی دەم بەستراو کە کونی تێدابوو باکەی تێدا نەماو فووەکەی کە تێیـــان کردبوو هاتە دەرێ هێزی کەڵەك ڕاگرتنی نامێنێت ٠

فسێر ـ فێری نانی خووساوە :ـ

واتا فێری نانی بەر سێبەر بووە ، فێری تەمەڵیە ، بێکارەیە ٠

فیزە بەرخانە ـ فیزە بەرخانەیە :ـ

خراپە خانەیە ـ شوێنێکە جێی پیاوی سەرسەریو ناچیزەیە ٠ دەڵێن : شوێنەکە بووە بە فیزەبەرخانە ٠ واتا : هەرچی دێت‌و خۆی پێدا دەکات ٠

فیشك ـ فیشك‌و هووڕ :ـ

فیشکە = دەنگێکی تایبەتی‌یە بە مار لە هاتنەدەرەوەی هەوا بە گوڕ لە گەرووەوە پەیدا دەبێت دەڵێن : ئەو فیشك‌و هووڕەت لە چی‌یە یان فیشکەفیشکێ جگەرەیەتی ٠ واتا دەنگێکی زۆری وا دەر دەکات وەك دەنگی مار وایە ٠

فیکە ـ فیکە بەبێ لێو لێ دەدەن :ـ

واتا : کار دەدەنە دەست یەکێك کە شایـــستەی ئەوە نەبێت‌و پێی نەکرێت ٠

فیـک ـ فیکو هوور :ـ

فیکه فیکێکی زۆرو بەرز ٠

فیـکه ـ فیکەی خۆی دەناسێت ـ له فیکەی خۆی دەگات :ـ

( به یەکێك دەڵێن گەر به قسه پلارێکیان تێ گرت خێرا تێی بگات) ٠

فیـڵ ـ فێڵو تەڵەکه :ـ

داوو تەڵەنانەوە ، چاوو ڕاوکردن ٠

ـــ فێڵو فەرەج :ـ

٠ فڕو فێڵ ٠

# ق

**قـاپ ـ قاپی گرت ـ قاچی گرت ـ لاقی گرت :ـ**

بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە بەگژ یەکێکدا بچێت · چونکە درندە یا سەگ پەلاماری قاچ دەدات‌و دەیگەزێت ·

**قـات ـ قات‌و قڕی‌یە :ـ**

قات : (قحط)ی عەرەبی‌یە · واتا : شت ، خـواردن ، دەسـت ناکەوێت‌و گرانییەکە قـڕی خستۆتەوە · بـەکار دەهێنرێت بـۆ نەبوونی هەموو شتێك ، کە کەم بێت‌و بەگران دەست بکەوێت ·

**قاچ ـ قاچ بیزوێنە :ـ**

واتا : خێرا بڕۆ · پێ هەڵگرە ·

**قاچ ـ قاچی بە خومخۆرکدا چووە :ـ**

واتا : وریا نەبووەو لە کارەکـەیدا هـەڵەنگووتووەو کەوتووە خومخۆرك :ـ کونێکی نادیارە ، جانەوەر هەڵیان کەندووەو کڵەکەی سەری نشە · مەردوم قاچی پیا دەچێت‌و ئازاری دەگات ·

**قارس ـ قارسی قیامەت :ـ**

زیندووبوونەوە ، ئەوە دنیا دەڵێن : کارێکت کردووە هەتا قارسی قیامەت لێت نابڕێتەوە·

**قـاڵ ـ قاڵ بووە :ـ**

١ ـ پوخت بووە ، قایم‌و پتەو بووە ·

٢ ـ خاوەن تاقیکردنەوەیە ، لەو کارەدا شارەزایە · لە قاڵکردنی

ڕۆنەوە هاتووە کە کەرەکە ، یان ڕۆنەکە گەرم دەکرێت و
کەف و پیسییەکەی لێ دەگرن و ساغ دەبێتەوە ٠

قالە ـ قالە قوولەی قینگ داوە :ـ
واتا : بە قاڵەی دەم کابرای بەزاندو دەری پەڕاند ٠

قانگ ـ قانگی دا :ـ
قانگدان = دڕندەیەکی کێوی کە لە کونێکدا دەبێت ، بۆ دەرپەڕاندنی ،
دووکەڵ دەکەنە کونەکەوە تا تەنگەنەفەس بێت و بێتە دەرەوە دەڵێن:
قانگیان دا ٠ واتا :
١ ـ هەناسەی ئەو کەسەیان سوار کردو شپرزەیان کرد ٠
٢ ـ دەریان پەڕاندو لەو شوێنە ، لەسەر ئەو کارە دەریان کرد ،
وایان لێ کرد خۆی ڕاپکات ٠

قاو ـ قاوو قیژ :ـ
دەنگە دەنگ و زریکە زریک ٠

قەپات ـ قەپاتە :ـ
واتا : پێ گەیشتووە ، سامانی تەواوی پێکەوە ناوە ، مسۆگەر
بووە ٠ واتا : ئەوەی پارەکەی تێ دەخات پڕبووە هیچی تر ناگرێت ٠

قەپ ـ قەپ و برە :ـ
( قات و قڕە ٠ واتا : شت دەست ناکەوێت و خواردن و ئازووخە
نەماوە ) ٠

قەرەباڵغ ـ قەرەباڵغ ـ قەڵەباڵغ :ـ
( بۆ شوێنێک بەکار دێت کە عەشاماتێکی زۆری لێ گرد بووبێتەوە ، بە

سەر یەکدا رژابن و کەس بەکەسەوە نەبێت و تەنیا ڕەش بچێتەوە) ٠
قەرە = رەش.باڵغ = ماسی ٠ دوو وشەی تورکین ٠

قەرە ــ قەرەچەناغ ــ چەنە ــ چەناگە درێژە :ــ
زۆر بڵێیە ٠ چەنەبازە ٠ چەناخ = چەناگە ٠

ــــ قەرمزاخە :ــ
( گرێتۆکە ، هەرزەبێژە ) ٠

قەرز ــ قەرزو قۆڵە :ــ
قەرزاری زۆر ٠

قەشە ــ قەشەیە :ــ
دەڵێن فلانەکەس قەشەیە ٠ واتا : لە هەموو شوێنێکدا دیارە ٠ هەر
گۆتاو رۆیەك بێت دەبێت بەسەر ئەودا بتلێتەوە ٠ ، نەگبەتە ٠

قەل ــ قەل بە قەلی وت رووت رەش بێت :ــ
١ ــ بە یەکێك دەوترێت کە خۆی بەد بێت و خەڵك بەدناو بکات ٠
٢ ــ گوناهبار بێت لەکەدار بێت و عەیب لە گوناهبار یا لەکەدارێکی
تر دەربێنێت ٠

قەڵەم ــ قەڵەمی ئەژنۆی شکا :ــ
١ ــ رووخاو ورەی بەردا ٠
٢ ــ شەکەت بوو ، هێزی لەبەر بڕا ٠ داخێکی جەرگبڕی بیست ٠

قەلەندەر ــ قەلەندەر بابایە :ــ
قەلەندەر = دەروێشێکی گەڕۆك ٠ بە یەکێــك دەڵێن ، دەروێشانە

بژی ، بە تەنگ ژیانەوە نەیەت‌و خۆشی دنیای نەوێت ٠

قەڵتاغ ـ قەڵتاغە کۆنە :ـ

(بە گاڵتەوە ، بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێت کە زۆر پیرو رزیو بێت ٠

قەڵتاغ = چوار دارە بە چەرمی خاو دادەبەسترێ‌و دەخرێتە سەر تەکەڵتووی زین ٠ ) ئافرەتێك پیرێك داوای دەکات ، ئەویش دەڵێت جا قەڵتاغە کۆنی وا بە کەڵکی چی دێت ؟

قەڵخان ـ قەڵخانی لێ هەڵەوگەرانکە ـ گەرانووە :ـ

واتا پشتی تێ کردووەو لێی یاخی بووە ، لێی هەڵگەڕاوەتەوە ٠

قـەلفڕ ـ قەلفڕی کرد ـ بۆ کرد :ـ

بۆ گاڵتە ، بۆ تەوسە ٠

١ ـ بۆ شـوێنێـك رۆیشت ٠

٢ ـ دەرباز بوو ٠ واتا وەك قەل زوو خۆی دوور خستەوە ٠

قەمتەر ـ قەمتەری ـ لغاوی ـ شەیتانی لە دەمدایە :ـ

(قەمتەر = ئاسنێکە وەك لغاو ، دەکرێتە دەمی ئێسترو مەیموونەوە )٠

بە یەکێکی رژدی چرووك دەوترێت کەماڵەکەی خـۆی بە دەمدا نەچێت ٠

قەواڵە ـ قەواڵەی خۆی خوێندەوە :ـ

باس‌و بەسەرهاتی خۆی کردو گێڕایەوە ٠ (قەواڵە : نوسراوێکی مۆرکراوە لە کڕین‌و فرۆختندا دەدرێ بە یەکتری ) ٠

قەوم ـ قەوم‌و قیلە :ـ

خزم‌و خوێش ٠

قەیار ـ قەیاری هاتووە :ـ

( قەیار : زیادەی سمسی وڵاخی یـەك سـمە ٠ بە یەکێك دەوترێت یاخی بووبێت‌و زیاد لە ئەندازەی خۆی سەربەست بووبێت ٠ واتا : ئەمیش دەبێت نینۆکی بکرێت ) ٠ واتا : کاتی لێپرسینەوەو سزای هاتووە چونکە لە هێڵ دەرچووە ٠

قـــرە ـ قرەو برە :ـ

قرەو هەراو گرمەگرم ٠

قرچـــە ـ قرچەی گەرما :ـ

گوڕەی گەرما دەمی نیوەڕۆی هاوین،قرچە ـ لەوەوە هاتووە کە ئاگر ، قامیش یان گۆشت دەسووتێنێت دەنگێکی تایبەتی لێوە دێنێت دەڵێن قرچەی دێت ٠ واتا ئەو کاتەی کە گەرما پیاو دەبرژێنێت :

قـــرچ ـ قرچ‌و هووڕ :ـ

دەنگی شکاندنی دار ، شووشـــە ، یان تـەقاندنی لە ئاگردا ، یـا برژاندن‌وسووتاندنی گۆشت بەڵام دەنگەکەی زۆرو بەرز بێت ٠

قرخـــە ـ قرخە کۆن :ـ

واتا وەك گۆزەیەکی قرخ کە هەتاو زۆر لێی دابێت‌و کۆن بووبێت‌و ئاو سارد نەکات‌و بە کەڵك نەمابێت ، لووس بووبێت ٠ بە گاڵتەوە بە یەکێك دەوترێت زۆر بکۆکێت ٠ واتا زۆر پیر بووی.یان بە پیرێك دەوترێت کە ڕقیان لێی هەستابێت واتا بە کەڵك نەماو٠

قــرخو ـ قرخو هوورِ :ـ

قرخه قرخێکی زۆر (قرخه دەنگێکه لە گەرووی گیانداریکەوه دێ له کاتێکدا که شتێکی لە گەروو گیرابێت ) • کۆکەی مرۆڤی پیریش ئەو دەنگەی هەیە •

قــرژاڵ ـ قرژاڵی دووسەرە ـ وەك قرژال به دوو سەره دەڕوات : به یەکێك دەڵێن رووی راستی بۆ نەبێتو له رووی رامیارییەوه بێبار بێت •

قــــڕو ـ قڕو قەپۆز :ـ

به دەمو پلی یەکێك دەوترێت که رقت لێی هەستابێت ، یان حەز له چارەی نەکەیتو له رووی سووکییەوه دەوترێت •

قــــڕو ـ قڕو هوورِ ـ کڕو هوورِ :ـ

قڕه = کڕه = قسه کردن به دەنگی بەرزو قسەیەکی زۆر دەڵێن ئەو .قڕو هووڕه ، کڕو هووڕەی لەچییە • واتا کردوویەتی بە هەراو دەنگی بەرز کردۆتەوه •

قــــرم ـ قرمو هوورِ :ـ

قرم = گرم • واتا گرمه گرمی هەور یان زەلام ، قسه کردنی زەلام ، گرمەیەکی زۆرو بەرز •

قریشــك ـ قریشكو هوورِ :ـ

قیژه قیژێکی زۆرو بەرز بەتایبەتی هی ئافرەت •

قســــه ـ قسه بەردەداتەوه :ـ

به بێ لێکدانەوه زۆر دەڵێت بێ سەرو بێ‌یە ، قسه ناجوێتەوه •

أ ــ قسه دهجوێت :ــ

بیری لێ دهکاتهوهو ههڵی دهسهنگێنێت ئهوسا دهیکات ٠

ــ قسه دهجوێتهوه :ــ

له قسهکردندا منجه منج دهکات قسهکه دهڵێتو دهڵێتهوه ٠

ــ قسهی بهگوێدا ناچێت ٠

لاساره ، ئامۆژگاری وهرناگرێت ، یاخیه :ــ

قسهی ــ قسهی بێ سهروبن ــ بێ سهروبهر دهکات :ــ

بێ لێکدانهوه دهدوێتو قسهکانی هیچی بهسهر هیچهوه نییه ٠

ــ قسهی دڵت بۆ من بێت :ــ

واتا : ئهوهی بهسهرزاری پێم دهڵێیت تهواو نییهو راستیی دڵت نییهو ئهوهی که له دڵتدایه ئهوهم بۆ بڵێو به دڵ ههر خۆشت دهوێم ٠

ــ قسهی سواره :ــ

قسهی ئهو لهسهرهوهیهو سهری گرتووه ٠

ــ قسهی شهوه :ــ

واتا : نایهته دیو ههر بۆ خلافاندنه ٠

ــ قسهی گوێ ناگردانه :ــ

( واتا : هیچ نرخێکی نییه ، به یهکێك دهوترێت ههر هاشهو هووشه بکات ) ٠

ــ قسەی وەك قوڕی زستانە :ــ

واتا : وەك قوڕی زستان چۆن پیاو لە نوێژ نایاتو دەبەخشرێت ، قسەکانی ئەویش وایەو لێی ناگیرێت .

قسەی ـ قسەی وەکو کوچكو کولۆیە :ــ

قسەکانی ڕەقو نالەبارە ، پیاو ژانی پێ دەکات .

ــ قسە ناچێتە هەمانەوە ـ جەواڵەوە ـ گیرفانەوە :ــ

١ ـ ( بە یەکێك دەوترێت کە قسەیەکی نابەجێ بکاتو تۆ قسەکەی بدەیتە دواوە . واتا قسە ئەوەیە بچێتە مێشکەوە ـ وەربگیرێت ) .

٢ ـ بە یەکێك ئەوە دەوترێت کە هەر لە گۆترە گفتو بەڵێنی زل بداتو ئەنجامیشی هیچ بێت . واتا : قسەی بێ بایەخو بێ ئەنجام کەڵکی چییە .

ــ قسەی نەکوڵاوە ـ نەکوڵۆکە :ــ

واتا : قسەکەی ڕەقو ناخۆشەو وەڵامەکەی وشکەو سەرو دڵ دەگرێت .

ــ قسەی هاتەرانو پاتەران دەکات :ــ

هاتەران : وڕێنە . پاتەران : شێتان .

واتا : قسەیەك دەکات وەك هی وڕێنەکەر یا هی شێت .

ــ قسەکەی بردە سەر :ــ

١ ـ بەڵێنەکەی بەجێ هێنا .

٢ ـ کارەکەی تەواو کرد .

قسه ـ قسەکەی گا :ـ

وای گێڕایەوە هیچی لێ تێ نەگەیشتین ، بچڕ بچڕو بە منجە منج قسەکەی کرد .

قسەکانی ـ قسەکانی نەخشی بەردە ـ وەك نەخشی بەرد وایە :ـ

هەر قسەیەکی کرد دێتە دی ، چونکە لێکدانەوەی زۆرەو دنیا دیدەیە.

قسەیەك ـ قسەیەکیش بۆ دز بکەین :ـ

( واتا : تاوانبار ئەگەر بیانویەکی بەدەستەوە بوو پێویستە بەزۆر لیوە نەگرێت ) .

قفـڵ ـ قفڵی لە دەمی خۆی داوە ـ دەمی خۆی کوڵۆم کردووە :ـ

( بە هیچ جۆرێك قسە ناکات ) . نقەی لە خۆی بڕیوەو هیچ نادرکێنێت .

قڵپ ـ قڵپەو هووڕ :ـ

دەنگێکی زۆرو بەرزی رشانەوە . یان دەرهاوردن و قڵپ کردنەوەی شلەیەك کە لە تیانێکدا بێت دەم تەسك وەك گۆزەو شەربە .. هتد .

قلی ـ قلی بلیانە ـ قلی و بلیانە :ـ

قلی‌بلی : (واتایەکە کە بێ مانا بێت) . واتا خەریکی شتێکی هیچ و پووچن .

قنگە ـ قنگە جنۆکەیەکە :ـ

( بە شوێنێکی زۆر تەسك و تروسك و تەنگەبەر دەوترێت)

قـنگ ـ قنگ بەتاڵ دەرچوو :ـ

هیچی دەست نەکەوت ، هیچیان نەدایە ۰

ـــ قنگ بدەرە سەر دەرپێی خۆت :ـ

( واتا : دەستدرێژی مەکەو ئاگات لە دەستو زمانی خۆت بێت)۰

قنـگر ـ قنگر ـ کنگرو ماست بە وەختی ـ بەوەعدەی ـ خۆی :ـ

هەموو شتێك ، کارێك ، قسـەیەك لە کاتی خۆیدا باشـە ، خۆشـە ۰

قنگی ـ قنگی ـ کنگی چووزایەوە :ـ

واتا : ژان چووە دڵی بە قسـەکەی ، بە کردارەکەی دڵگیر بوو ، پێی پەسـتو قارس بوو ، تەنگە گرتی ۰

ـــ قنگی ـ کنگی ـ کەر حەمامە :ـ

(بە شتێك ، بە قسـەیەك دەوترێت کە نەگونجێت ) ۰ لە جێی خۆیدا نەبێتو ناتەواو بێت ۰ ئەمە بە تەوسـەوە ، بە رقـــەوە ، بە رووی یەکێکدا دەوترێت ۰

قنـگی ـ قنگی کردە رەشـەبا :ـ

( لە ڕووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێت کە بمرێت ) ۰

قنـگ ـ قنگ لێ کەوتووە :ـ

واتا : بێ هۆشو گۆشـە ، ئاگای لە خۆی ینیەو شتی زوو زوو لێ دەکەوێتو لێی بەجێ دەمێنێت ۰

قووت ـ قووتی دا :ـ

شتەکەی لەناو برد ، دەستی بەسـەردا گرتو ونی کرد ۰

قووچاند ـ قووچاندی :ـ

پاشەکشەی کردو هەڵات ، خۆی لە هەلوێستێك رزگار کرد . بۆ تەوس و گاڵتەپێکردن دەوترێت .

قـوڕاو ـ قوڕاوی خەستە :ـ

١ ـ دەردەکەی کوشندەیە .

٢ ـ کارەکەی تەواو ئاڵۆزەو گرفتار بووە . تووشی گاشـەیەکی گەورە بووە .

قـــۆڕە ـ قۆڕە :ـ

دەڵێن کارەکەی قۆڕە . واتا : کارەکەی نالەبارو ناتەواوو ئاڵۆزە . بارەکەی پڕ مەترسی و ئەندێشـەیە .

قـــوڕ ـ قوڕو چڵپاو :ـ

واتا قوڕو شلپە شلپی لیتاو .

ـــ قوڕو چڵپاوی دنیای بە قنگدا هەڵپژاوە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە هەموو جۆرە ناخۆشییەکی دنیای دیبێت ) . خاوەن تاقیکردنەوەیەکی زۆرەو زۆر گەڕاوە .

ـــ قوڕو قەپ :ـ

واتا قوڕ بە ـ قەپ ـ بەدەمدا بدرێت بێ دەنگ و کپ بێت .

قوڕی ـ قوڕی بە دەمیدا دا :ـ

قوڕو قەپی پێ کرد ، بێ دەنگی کرد ، بەوەی بەدرۆی خستەوە ، ناڕاستی بیرەکەی خستەڕو پێی سەلماند کەوا نییە .

٢ ـ قسەکەی پێ بڕی ٠

— قوڕی بۆ گرتەوە :ـ
جاران قوڕ بۆ یەکێك دەگیرایەوە کە کۆستێکی گەورەی بکەوتایە ، تا خۆی بۆ لە قوڕ بنایە ٠ واتا تووشی گاشـــە ، ماڵوێرانی ، زیانێکی گەورەی کردو تووشی داخ‌و ناسۆرێکی زۆری کرد ٠

قـوڵ ـ قوڵیان لە پندا بڕیوە :ـ
١ ـ لە خشتەیان بردووە ٠
٢ ـ شتەکەیان بە گران پێ فرۆشتووە‌و زیادیان لێ سەندووە ٠

قولەتێن ـ قولەتێنە :ـ
بە پێی شەرعی ئیسلام بە ئاوێك دەڵێن کە (٥٠٠ رطلی بەغـدادی) بێت کە هەر (رطل)ەی $\frac{٤}{٧}$ ١٢٨ درهەمە ئاوێك وەستاو بەڵام پاك بێت بێ بۆن‌و ڕەنگ‌و تام ٠ بەڵام واتای ئیدیۆمەکەی ئەوەیە کـە شتەکە زۆر تەواو نییە‌و کارەکە تێکەو لێکەیە ٠

قـولفی ـ قولفی کابە کەچ نابیت :ـ
بۆ تەوسەو تەشەرە واتا ئەگەر ئەو کارە بکرێت چ زیانێـــك دەبەخشێت ؟ ئەی بۆ نەکرێت خۆ لە ڕێ لادان نییە ٠

— قولفی کارەکە پچڕاوە ـ قولفی تۆڕەکە پچڕاوە :ـ
شیرازەی کارەکە تێك چووە‌و کار لە کار ترازاوە ٠

قونە قون ـ قونە قونکەرە :ـ
خۆی دەنوێنێت‌و پیشان دەدات ٠ بە کوڕێك یان کچێکی هەرزەکار دەڵێن کە میانەوێت دڵخوازێك بگرن ٠

قوونێ ـ قوونێ لە دووەم مەڕۆ بۆن گووت لێ دێت :ـ

( بە کەسێکی بەفیز دەڵێن کە لەگەڵ خۆیشی نەسازێت ) •

قوونی ـ قوونی هەر کلکی پێ دەوێت :ـ

( شتەك لە شتێك نەوەشێتەوە ) • بە بەکێـکی کـەودەنو نێـ

نەگەیشتوو دەڵێن کە پەلاماری کارێك بدات و سەری لێ دەرنەچێت و

سوور بێت لەسەر ناتەواویی خۆی •

قیتە ـ قیتەی کوڕی قیتەیە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن باکی هیچی نەبێت ) •

قیری ـ قیری ئەحمەد بڕندەیە ـ بووە بە قیرەکەی ئەحمەد بڕندە :ـ

واتا بە هیچ کولۆجێك ناچێتەوە • بە یەکێك دەڵێن کە پێتەوە لکا

ئیتر لێت نەبێتەوە •

— قیری کەوای سپییە :ـ

١ ـ بە یەکێك دەڵێن کە خۆی بە یەکێکەوە هەڵبواسێت و بە ئامان و

زەمان لێی نەبێتەوە •

٢ ـ بە نەنگییەك دەوترێت کە بە یەکێکەوە لکا هەرگیز لێی

نەبێتەوە و لە کۆمەڵدا سووکی بکات •

قیرو ـ قیرو سیا ـ قیری سیا :ـ

واتا قیری رەش • واتا : چش ، بە جەهەنم ، بەۆچاتر کە ئەو شتە

ئەو کارە رووی دا •

قیزندە ـ قیزندەو بیزندە بووە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە زۆر پیر بوو بێت ، زۆر نەخۆش و پەککەوتە بێت ،

پیسایی له خۆی دوور نەخاتەوەو لێی بێزار بن‌و قێزی لێ بکەنەوە

قیژ ـ قیژو واژ :ـ

قیژەو واژە کردن .

ـــ قیژو هوورِ :ـ

دەنگی هاوار یا قـــەکردنێکی بەرزی وەك هاوارێکی زۆر .

# ك

کـــا ـ کاکە هی خۆت نەبور ، کایەنەکە هی خۆت بور :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە چووبێتە سەر خوانی یەکێکی تر ، یان سەر هەر خوانێك هێندەی خواردبێت خۆی تووشی ژانەسك کردبێت ٠

ـــ کای تۆ نییە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە قسە لە شتێکدا بکات لە پایەی ئەودا نەبێت‌و لەژێری‌ی ئەو بەرزتر بێت ) ٠

ـــ کای ـ لە بانە ـ بەسەردا کراوە ـ کای لەبەرە :ـ

بە یەکێکی بێ مێشکی تێ نەگەیشتوو دەڵێن ٠

ـــ کای کۆن بە با ـ دەدات ـ دەکات :ـ

رابوردوویەکی تاڵی مردوو زیندوو دەکاتەوە ، قسەو ناخۆشی‌و گیرو گرفتی لەوەپێش دێنێتەوە کایە ٠ ئاشووب دەگێڕێت ٠

کـــابە ـ کابە کەچ نابێت!؟ خۆ کابە کەچ نابێت !؟ ٠

کابە = كَعبة ٠ واتا چی دەبێت ، دەقەومێت ، با ئەو کارە بکرێت ، خۆ بە کردنی گوناە ناکرێت‌و کفر نییە ٠

کـــار ـ کار لە کار ترازاوە :ـ

کارەکە تەوماوەو لە دەست چووە چاری نییە ٠

کـــار ـ کاری لەبەر ناچێت :ـ

لە کارەکەیدا سستە ، سا یا لەبەر تەمەڵی ، یا نەشارەزایە ، یان خاوو خلیچکە ٠

ـــ کاری لە جێی خۆیدایە :ـ

مرۆڤێکی دروستو سەرڕاستە ، بە لێکدانەوەیە ، کارەکانی پوختە٠

کارێکی ـ کارێکی پێ کرد ، با بەدەواری شڕی نەکات :ـ

حەشری پێ کرد ٠ واتا : شەڕێکی گەورەی لەگەڵدا کرد زیانێکی زۆری پێ گەیاند ، کردی بەبەند ، شرتو شۆی لەبەر بڕی ٠

کـارد ـ کارد بە پێشە گەیشتووە :ـ

کارد = کێرد ٠ واتا = چەقۆ گۆشتی بڕیوەو گەیشتۆتە سەر ئێسك٠ واتا : ســتەمو زۆرداریو کاری نالـەبار گەیشـتۆتە رادەیەك هەڵناگیرێتو چاو پۆشی لێ ناکرێت ٠ ئازار گەیشتۆتە سەر ئێسقان

کــارد ـ کارد وەکفنی کردووە :ـ

(خۆی بۆ مردن ئامادە کردووە ) ٠

کاروان ـ کاروانکوژەیە :ـ

(وەك ئەستێرەی کاروانکوژە خەڵك لە خشـتە دەباتو هــەلی دەفریوێنێت ٠ بە یەکێکی فێڵبـازی خــەڵك خەڵەتێن دەڵێن) ٠ کاروانکوژە : ئەستێرەیەکە رووناك ، وەك ئەســتێرەی بەیانە ٠ جارەهای جار کاروانی پێ هەڵخەڵەتاوە ، کاروان وایزانیوە نزیك رۆژەو ئەستێرەی بـەیانە ، کـەوتۆتە رێ ٠ بەڵام وێن بووە ، یا تووشی کارەساتی گەورە بووە ، تووشی کوشتنو مردن بووە بۆیە ناو-نراوە کاروانکوژە ٠

کاسە ـ کاسەکە پڕ بووە ، لێی دەرژێت :ـ

ستەم زۆر بووە ، دڵ پڕ لە داخەو سەری کردووە ٠ ئیتر دڵ بەرگە

ناگرێت ، پاخی دەبێتو بەکژدا دەچێت ·

— کاسەکەی بە مل مندا دەشکێنێت :ـ
گۆتاو ڕۆی کارەکە بەسەر مندا دەهێنێت (گوناهەکەی بەسەر مندا دەسەپێنێت ) ·

— کاسە لە ـ ئاش ـ چێشت گەرمترە :ـ
(بە یەکێك دەوترێت کە لە ئێشی یەکێکدا ئەم لە خاوەنەکەی سەر گەرمتر بێت ) ·

کاسە ـ کاسە لێسە :ـ
١ ـ ماستاوکەرە ، مەراییکەرە ·
٢ ـ خوازلۆکە ·
٣ ـ نۆکەرە ·

— کاسەی جەژنیان نییە :ـ
هەژارن تاخواردنی جەژنیشیان نییە ·
کاغەز ـ کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە :ـ
مرۆڤێکی زیرەکو وریایە ، لە شت باش دەکۆڵێتەوەو دەکات ·

کالاّ ـ کالاّ لەقەد بالاّ :ـ
هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆی · کالاّ = بەرگ ·
واتا :بەرگ بە پێی بالاّ دەبڕرێت ·
— کاڵەکخۆریت یان بێستانڕن ؟ :ـ
واتا : تۆ چیتە بەسەرەوە ، بخۆ ، بپۆشە ، کەڵك لەو شتە وەرگرەو مەپرسە ، چۆن بەچەند کراوە ·

کـــاڵ ـ کاڵو کرچ :ـ

کاڵ = نەگەییو ٠ کرچ = رەقێکی وا کە دانی پێدا بنێیت کرچەی بێت ٠ واتا کاڵێکە کرچەی دێت ٠ ناتەواوە نەگەییوە ٠ دەڵێن : قـــەکانی کاڵو کرچن ٠

واتا : ناتەواونو لە بیرەوە نایەن ، لێکدانەوەی کەمە ٠

کەچەڵ ـ کەچەڵ کرد ـ گەڕی کرد :ـ

واتا : مێشـکی برد هێندە ئەو شتەی خواست ، دای بەگوێیدا ٠

کەراو کەر ـ کەراو کەر کەوتوون :ـ

بە دوو کەس دەڵێن کە هەڵــو کەوتیان لەگەڵ یەکدا ناتەواو بێتو لە هۆشەوە نەبێت ٠

کـــەرەکە ـ کـــەرەکە مـــەرە بەهـــارە چووز کـــەما دیارە ـ کەوەکە مەرە بەهارە کورتانت بۆ دێنم لەو شارە :ـ

واتا : ئەو وا پەرێشـانە ئێـستە پێویستی بە یارمەتی هەیە ، بـەو شتە هەیە ، تۆ تازە گفتی دەمێکی تری دەدەیتێ ، ئەوە فریای ئەو ناکەوێتو بە کەڵکی نایەت ٠

کەر بازاڕ ـ کەر بازاڕە :ـ

کارەکە بێ سەرو بەرە ، بەرەڵایە ، هیچی بەسەر هیچەوە نییە ٠

کـــەر ـ کەر بە جۆ بمرێت شەهیدە :ـ

( بە یەکێکی نەوسنی چڵێس دەوترێت کە لە زۆر خواردنەوە نەخۆش کەوتبێت ) ٠

— کەر بگێت سەقەتی دەکات :ـ

بۆ گاڵتە پێکردنە ، واتا : نەزانە ، دەست لە هەر کارێکەوە بدات چەواشەی دەکاتو تێکی دەدات ٠

— کەر بووە :ـ

١ ـ لە خشتە براوە ، لاس دراوە ٠

٢ ـ توورە بووەو زماندرێژی دەکات ٠

٣ ـ هەڵسو کەوتی کەرانەیە ٠

— کەر گوڵو بار سووک :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە سەڵتو قوڵت بێت وباری سووک بێت )و ئەرکی بەسەر کەسەوە نەبێت ٠

— کەر لە چاویدا قازیە :ـ

واتا : مرۆڤێکی بێ مێشكو کەودەنە ٠

— کەر لە قوراودا دەگێت :ـ

بە یەکێك دەوترێت کە یەکێکی تر بگرێتو خەریکی بکات ، پرسیاری لێ بکات داوای شتێکی لێ بکات لە کاتێکدا ئەو کەسەی پرسیارەکەی لێ دەکرێت ، دەستی نەپەرژێتو بوارەی نەبێت ٠

کـەر ـ کـەر لە کوێ کەوتووە ـ تۆپیوە ـ وکونده لە کوێ دڕاوە :ـ

واتا : باسەکە لە کوێیەو تۆ لە چی دەدوێیت ٠ بە یەکێك دەوترێت ئاگای لە کارێك نەبێتو بیەوێت چارەسەری هەڵوێستێك ، کارێك ، بکات ، بەڵام نەشارەزایانە تێ هەڵچێت ٠

— کەر لەماڵیاندا بکەوێت دانی دەشکێت :ـ

واتا : زۆر هەژارن‌و ماڵەکەیان رووتە ٠

— کەرو جاشێك ـ ماکەرو جاشێك ـ بەر قلیانیەتی ـ قلیان قاوەڵتییەتی:

واتا : ئێجگار زۆر خۆرە ٠

— کەرو خۆڵە مێش :ـ

دەڵێن خزمایەتییەکەیان کەروخۆڵەمێشـــــە ٠ واتا خزمایەتییەکی دوورو ناتەواوە ٠

— کەرو ماجوومییان نەوتووە :ـ

( بە یەکێـــك دەڵێن کە لەگـــەڵ کارێکدا خـــەریك بێت هیچی لێ نەزانێت ) ٠

کـــەر ـ کەری ئەم بارە نییە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە دەرەقەتی ئیشێك نەیەت ، واتا : ئەم کارە بەو ناکرێت ) ٠

— کەری تۆپیو باری نییە ـ کەری مردوو جۆ ناخوات :ـ

( لە رووی سووکییەوە بە یەکێك دەوترێت کە نەتوانێت ئیشـــێك بکات ) ٠ یەکێك دەیلێت کە بێ دەسەلاتیی خۆی پیشان بدات ، لە کردنی کارێکدا کە لێی بخوازن بێ دەسەلاتییەکەشی بە هۆی نەخۆشی پیری یان هەر هۆیەکی ترەوە بێت ٠

— کەری خۆی بەستۆتەوە :ـ

واتا : کارەکەی خۆی بنجبەست کردووەو دڵنیایە ٠

ــ کەری خۆیەتی‌و گوێی ناڵ دەکات :ـ
واتا : ماڵی خۆیەتی‌و چی لێ دەکات دەیکات ، کار بە ئارەزووی خۆی دەکات .

ــ کەری کێ تۆپیوە !؟
بۆ سەر سوڕمان‌و تەوسە بە یەکێك دەوترێت کە کارێکی باشی وا بکات لێی تەوەشێتەوە .

ــ کەری لێ بووە بە رمووزن :ـ
رموزن = بروانە دەڵێی رمووزنە .
( بە یەکێك دەوترێت کە یەکێکی هیچو پڵوچی لێ بووبێت بە پیاوێکی باش ) ، پیاوێکی بە دەستەڵاتو تەواو .

کەر ـ کەری ناو جۆگەیە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە کەڵك لە دوولا یان چەند لایەك وەربگرێت‌و گوێ نەداتە هیچ .

ــ کەری ناو قوڕاوە ـ لە قوڕدا چەقیوە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لە کارێکدا بەکی کەوتبێت ، سەری لێ دەرنەچێت ، یان چەواشە بووبێت .

کەرت ـ کەرت‌و پەرت بوو :ـ
لەت لەت بوو ، پەرش‌و بڵاو بووەوە .

کەروێشك ـ کەروێشك بە گا دەگرێت :ـ
پەلەی نییە ، لە کارو باردا شێنەیی‌یە ، چونکە بە دەسەڵاتە ؛

گاڕەکەی لە چنگ دەرناچێت‌و جێبەجێی هەر دەکات ٠

کـەس ـ کەس بە دۆی خۆی ناڵێت ترشە ـ لە عەرش هەتا فورش × کەس بە دۆی خۆی ناڵێت ترش :ـ
هەرکەسە شتی خۆی لا چاکە :ـ

کـەس ـ کەس بە کەس نییە ـ کێ بە ـ لە ـ کێیە شێخە دێیە :ـ
١ ـ کەس گەورەی کەس نییە ، هەرکەس بۆ خۆیەتی ٠
٢ ـ پشێوییەکە ، شیرازە تێکچووە ، هەر کـەسـە بۆ خـۆی کوێخایەکە ٠

ـــ کەس بەو دوعایە ـ بە دوعای تۆ ـ ناڵێت ئامین :ـ
کەس بڕوا بەو قسەیە ناکات ، کەس گوێ ناداتە ئەو قسەیە ، کەس ئاواتی پێ ناخوازێت ٠

ـــ کەس شان لە شانی نادات :ـ
لە هەر ڕوویەکی ژیانەوە بێت کەس نایگاتێ ٠ بە تواناو دەسەڵاتە تەواوە ٠

ـــ کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوە :ـ
( کەس گوێ لە قسەی کەس ناگرێت ) ٠ کەس بە تەنگ کەسەوە نایەت ٠ بە دانیشتنێك دەڵێن هەموویان قسە بکەن کەس گوێ لەوی تری نەگرێت ٠

ـــ کەس گوو بە کڵاوی ناپێوێت :ـ
لە ڕووی سووکییەوە دەوترێت واتا ( کەس بە هیچی نازانێت‌و لێی نابرسێتەوە ) ٠

کـەس ـ کەس ناتوانێت پێی بڵێت بەری چاوت کلی پێوەیە ـ کەس ناتوانێت پێی بڵێت پێت خوار داناوە :ـ

۱ ـ بە یەکێك دەوترێت کە کەمو کوورِی نەبێت ، واتا مرۆڤێکی تـەواوە ۰

۲ ـ بەیەکێك دەوترێت جەربەزە بێت ۰

ـــ کەس نایەژێت خاڵۆ کەرت بەچەند : ـ

کەس لێی ناپرسێتەوە ، گوێی ناداتێ ۰ یەکێك ئەمە دەڵێت کـــە بەدەست شتێکەوە دامابێت ، بیەوێت بیفرۆشـــێت ۰ یان لێی قەوماپێتو کەسێك نەبێت لایەکی لێ بکاتەوە ۰ نائومێدانە ئەوە دەڵێت ۰

کـــەش ـ کەشو فش :ـ

دەڵێن بە کەشو فشێکەوە هات واتا : بە فیزو لووت بەرزییەکەوە هـــات ۰

کەشك ـ کەشکیش برای دۆیە :

( بە یەکێك دەوترێت کە خزمی یەکێکی خراپ بێت واتا ئەمیش وەك ئەو وایە ) ۰

کەفتگە ـ کەفتگە ناو دەسو دەم ـ کەوتۆتە بەر چاوو دەم :ـ

واتا خەڵکی لێی دەڵێنو بەخیلی پێ دەبەن ، پیادا هەڵدەکـــفێن ، چاوی پێ هەڵدەهێنن ۰

کـــەف ـ کەفو کولێەتی :ـ

لە گەرمەی هەڵچووندایە ، سا یا بۆ هێزو دەسەڵات ، بۆ گەنجێتی ، یا بۆ توورە بوون ۰

کەلانە ـ کەلانە ـ کلانە ـ ی شین کەوتۆتە بە ینیانەوە :ـ

( بە دوو کەس دەوترێت کە زویری کەوتبێتە بەینیانەوە ) ٠

ـــ کەلانە ـ کلانە ـ ی گورگ کەوتۆتە بەینیانەوە :ـ

( بە دوو کـــەس دەوترێت کـــە زۆردارێکی ستەمکار کەوتبێتە بەینیانەوەو لە هەردولایان بخوات ) ٠

کەڵەشێر ـ کەڵەشێری ناوەختە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کارێك بکات ئەنجامەکەی بۆ خۆی خراپ بێت واتا نەهاتیەتی بۆیە ئەو کارە دەکات ٠

کەڵبە ـ کەڵبەی شکاوە :ـ

بۆ سووکی‌یە ، واتا : نابوشتی ئەماوە بێ‌هێزو پەککەوتەیە ٠

کەڵەك ـ کەڵەکەترێیەك بوو مەپرسە ! :ـ

چڕی‌و بە یەکدا چوونێك بوو ، ســــوار ســــــەری یەك بووبوون بەرەلایی‌و ئاژاوە بوو ٠

کەڵەك ـ کەڵەکی لێ دا :ـ

فێڵی لێ کرد ، درۆی لەگەڵدا کرد ٠

کەللە ـ کەللە بەران :ـ

بۆ ڕق لێ بوونە ٠ بە یەکێکی سەر زل دەڵێن ٠ واتا : وەك سەری بەرانە ٠

ـــ کەللە شەقە :ـ

تووڕەو ترۆیە ، بە گژو نش بە ئاسماندا دەچێت ، هەڵسو کەوتی ناناسایی‌و سەیرە ٠

— کەللەم لە جاو نەدروابێت ـ هەر کەللەم لە جاو نەدروابێت :ـ

جاو = (جۆرە تەنراوێکە «نسیج» وەك خام ، بـەڵام ڕێســـەکەی ئەستوورترەو بە خەرەك دەرێسرێتو جۆلاّ دروستی دەکات ) ٠ جاران لە گەلێك شاری کوردستاندا دروست دەکرا ٠ ئێستە نەماوە

واتا هەر نەمرم ئەو کارە جێبەجێ دەکەم ٠

کەڵەگا ـ کەڵەگایەکە بۆ خۆی :ـ

بە ڕقەوە بە یەکێك دەوترێت واتا : جـــەربەزەیە ، زۆردارە ، دەست درێژکەرە ٠

کەڵەمـــە ـ کەڵەمە کراوە :ـ

بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە شتێکی لێ بپرسنو وەڵام نەداتەوە ٠ نهێنییەك بێت نەیدرکێنێت ٠ واتا : وەك گاجووت لە کاتی گێرەدا چۆن کەڵەمە دەکرێت بۆ ئەوەی دەم نەکاتەوەو بە کرشە خواردنەوە خەریك نەبێت ، ئەمیش وای لێ کراوە ، دەمی بەستراوە ٠

کەللەیی ـ کەللەیی بوو :ـ

١ ـ شێت بوو ٠

٢ ـ وا تووڕە بوو وەك شێتی لێ هات ٠

کـــەم ـ کەم چیکڵدانە :ـ

١ ـ زوو هەڵدەچێت ٠

٢ ـ بێ ئارامە ٠

— کەمو کووڕی زۆرە :ـ

کەم = ناتەواو ٠ کووڕی = کورتی = کرژی ٠ واتا : ناتەواوەو کورتە نەگەیوەتە ئەنجامو خواست ٠

کـەمەر ـ کەمەر بەستەیەتی :ـ
بە یەکێك دەوترێت کە کەمەری خزمەت ، بەندەیی ، بۆ کارگوزاریی یەکێکی تر بەستبێت یان بە یەکێك دەڵێن کە پیاوێکی پیرۆزی ئاین پشتگیری بکات ) ٠

کـەمەر ـ کەمەری بۆ بەستووە :ـ
خۆی بۆ گورجو ئامادە کردووە بڕیاری داوە چابوکانە تێ هەڵچێت ٠

کەمەریی ـ کەمەریی بووە :ـ
هێندە ماندوو بووە ناوقەدی ـ کەمـــەری ـ راســـت نابێتەوەو دەیەشێت ٠

کەمتیار ـ کەمتیار پیاوی چاکە x قولەپێی بسمی دەنگ ناکات :ـ
بۆ گاڵتە پێ کردنو سووکی یەکێکی ساویلکە دەوترێت وا باوە کە کەمتیار دەنگی خۆشی لا خۆشەو پێی سەرمەسْت دەبێت ٠ گوایا قولەپێیشی دەسمن کەچی هێشتا بە خۆی نازانێت ٠ واتا ئـەو ساویلکەیەش بە هەڵدان وەك کەمتیار چی لێ بکەن بە خـــۆی نازانێت ٠

کـــەو ـ کەو ئەوەیە بەرامبەر کەو بخوێنێت :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە لە پاشملە باسی یەکێکی تر بکات واتا : ئەگەر دەتوانیت ڕوو بەڕووی خۆی قسە بکە ٠

کەوەری ـ کەوەری دەیجنێت :ـ
شێنەیی‌یە ، لە ڕۆیشتندا ، لە کاردا ٠

کەوتە ـ کەوتە خۆی :ـ

١ ـ فریای خۆی کەوت‌و خۆی رزگار کرد ٠

٢ ـ خۆی گورج‌و ئامادە کرد ٠

کەوتوەتە ـ کەوتوەتە بازاڕی خواوە ـ لە بازاڕی خوادایە :ـ

واتا نەخۆشەکە هێندە کەشەنگ‌و هیلاکە وەختە بمرێت ، ســا مەگەر هەر خوا چاکی بکاتەوە ، ئەگینا دەستی لێ شۆراوە ٠

ـــ کەوتووەتە چەناگە کوێ :ـ

لە گیانکەنشتدایە ، لەسەرە مەرگدایە ٠

ـ٠ کەوتۆتە خاکو پای :ـ

دەست دامانیەتی ، لێی دەپاڕێتەوە ، خۆی داوە بەسەر خــاکی بەرپێیداو پێیدا ٠

ـــ کەوتووەتە خوارو ژووری :ـ

خەریکە قایلی بکات لاسی بدات ٠ ملی پێ بدات بۆ ئەو ئامانجەی ئەم کۆششی بو دەکات ٠

کەوتووەتە ـ کەوتووەتە داویەوە :ـ

١ ـ دڵی تێی چووەو حەزی لێ کردووە ٠

٢ ـ توشی بووە بە تووشیەوەو گرفتار بووە ، بە فێڵ لە خشتە براوە ٠

ـــ کەوتووەتە دەراوی تەنگەوە :ـ

گرفتار بووەو دەرهاتنەوەی ستەمە ٠

— کەوتووەتە ژێرەوە •

١ ـ دۆڕاوە •

٢ ـ بەزیوە •

٣ ـ نوشوستی هێناوە •

٤ ـ نابووت بووەو قەرزار کەوتووە •

— کەوتووەتە بەر چنگی :ـ

کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ، کەوتووەتە بەر دەستی •

— کەوتووەتە ساجی عەلی :ـ

دەشێ ئەمە لەوەوە هاتبێت ، یەکێکی هەژار ساجێکی بەدەستەوە گرتبێت و هاواری کردبێت کە بۆ خاتری حەزرەتی عەلی شتێکی بدەنێ • واتا کەوتووەتە سواڵ و هیچی بە دەستەوە نەماوەو نابووت و هەژار کەوتووە •

— کەوتووەتە سەر زمان :ـ

ناوی زڕاوەو بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی ئەم و ئەو •

کەوتووەتە ـ کەوتووەتە سەر سایە :ـ

( لە حینجە بۆتەوەو ئێستا بە سایە دەخوێنێت واتا : چـــاوی کراوەتەوەو فێری قسە کردن بووە ) •

— کەوتووەتە قاچ و قووچ :ـ

١ ـ دەستی بە تەڵەکەبازی و کەڵەک و کوڵەک کردووە •

٢ ـ کەوتووەتە دزی و پیاکێشان •

— کەوتووەتە قەلو بەرد :ـ

نابووت بووەو هیچی نەماوە ، دەســەڵاتی براوە ، دەســـتی بـە پوولێکەوە دەلەرزێت ٠

— کەوتووەتە قوڕەوە ـ قوڕاوەوە :ـ

تووشی دەردیسەریو گاشە بووە ٠ لێی قەوماوە ٠

— کەوتووەتە کلکە لەقێ :ـ

١ ـ بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن مەرایی بکات ٠

٢ ـ کەوتۆتە پەلەپەلی گەڕانەوە ، ڕۆیشتن ٠

کەوتووەتە ـ کەوتووەتە گێرەو کێشە :ـ

١ ـ لە هاتوچۆدایەو ماندووە ٠

٢ ـ تووش بووە ٠

— کەوتووەتە گێژەوە ـ گێژاوەوە :ـ

گێژ یان گێژاو : شوێنێکە کە ئاو تیایدا گێژ دەخوات دەسووڕێتەوە ، بە دەوری تەوەرەیەکدا ، هەر شتێکی بکەوێتە حاست قووتی دەدات٠ واتا : تووش بووەو لە ئەندێشەو مەترسیدایە ٠

— کەوتووەتە هەلەقو مەلەق :ـ

نازانێت کامیان هەلبژێرێت ، ڕاڕایە ٠ سەری لە کارەکە شتەکە دەرناچێت ئەمە لە یارییەکی منداڵانەوە هاتووە کە بۆ هەڵبژاردنی شتێك لە چەند شتێکدا دەڵێن : هەللەق مەللەق دەنکی لەقلەق ، کێسەو کەمەر یاسیس عومەر یا پێغەمبەر ٠

— کەوتۆوەتە هەڵەکەسەما :ـ

واتا جرتو فرتیەتیو شپرزەیە ، سا یا لە خۆشـیدا یان لـە ناخۆشیدا ، بۆ تەوسیش دەوترێت ·

کەوچك ـ کەوچکی نییە بۆ ···· دەخوات :ـ

کە قسە نازانێت ، قسەی جوان نازانێت بۆ دەیکات ·

کەوڵ ـ کەوڵە کۆنە :ـ

بۆ گاڵتە لەگەڵ کردن ، پێ کردن دەوترێت بە پیرێکی پەك کەوتە دەڵێن واتا ئەو وەك پیرێکی پەك کەوتە وایە ·

— کەوڵ سوور ـ کڵاو سوور ـی بەر لەشکرە ·

( بە مەردومی زۆر جەربەزەی چەتڵەمەز دەوترێت ) ·

— کەوڵی بۆ بازار دەبەن :ـ

( واتا : هاکا مرد ) ·

— کەوڵی کرد :ـ

واتا : (١ ـ زەبوونو بێ هێزو بەیدەستی کرد ) ·

٢ ـ بۆژوو بێزاری کرد ·

کـەین ـ کەینو بەین :ـ

دەڵێن هەزار کەینو بەینیان هەیە واتا : هەزار تەگبیرو رایان بـە نهێنی هەیە ·

کتـك ـ کتك ختوکەی شێر دەدات ـ بەگژ قولەی قافدا دەچێت :

بە یەکێك دەڵێن کە بێ دەسەڵات بێتو ململانێو زۆران لەگـەڵ

یەکێکی دەسەڵاتداردا بکاتو بگرێت ٠

کتــــك ـ کتك دەمی نەدەگەیشتە دووگ دەیوت ـ سۆڵە ـ سوێرە :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە دەستی نەگاتە شتێك ، کارێك ، دەســــەڵاتی نەبێتو بڵێت ئەو شتە ، ئەو کارە بێکەڵکە ٠

ــــ کتك لەسەر ڕمانە :ـ
( واتا زۆر چڕو قەڵەباڵغە تا جێی پشیلەش نەماوە مەگەر بەســەر نووکی ڕمەوە نەبێت ) ٠

ــــ کتكو مشك بوون بە خوشك :ـ
( بە دوو دوژمن دەڵێن کە بوبن بە برا بۆ خواردنیماڵی یەکێکی تر ) ٠

کتێب ـ کتێب بۆ ئاخری دەگێڕێتەوە :ـ
کار بە ئەنجامەو پێویستە ئەو سەری ڕەچاو بکرێت ٠

کــــڕ ـ کڕ کەوتووە :ـ
١ ـ واتا لە جرتو فرت کەوتووە ، دامردۆتەوە ٠
٢ ـ لە ماڵەوە یان لەو شوێنە خۆی هێشتۆتەوەو نایەتەدەرێ ٠

کراس ـ کراسێك بەپیسیو هەزار بەپاکی :ـ
واتا : پیاو کردەوەیەکی خراپی کرد لە یادی خەڵکدا دەمێنێتەوەو بۆی دەبێتە لەکە ، لەبەر ئەوە تا دەتوانێت پێویستە خۆی لە خــــراپە بەدوور بگرێت ٠

کــــرا ـ کرایە باخەڵیەوە :ـ
واتا بووکەکە کرایە پەردەوە ٠

کــرە ـ کرمی میری سوور دەکات :ـ
واتا : بەو شتە ، کارە ، قایلەو سوپاسیش دەکاتو هەمیشەش چاوەچاویەتی . واتا خێر بۆ میری سوور دەکات ،کە بەو ئـاواتە بـگات .

کــردە ـ کردەی تۆیەو بردەی شەیتان :
رەنجەکەت بەفیرۆ دەڕوات ، خۆت کەڵکی لێ نابینیتو بۆ ئـــەو ئـەوە .

کـردنی ـ کردنی بە ئەموستیلەیەکو کردنیە پەنجەیەوە :ـ
ـ بە قسەی شیرینو کردەوەی جوان دڵی لێ سەندن وای لێ کردن ملی بۆ شۆڕ بکەن ، خۆشیان بوێت لەگەڵی بگونجێن .

کــردی ـ کردی بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە قسەیەك زۆر بلێتەوە ) .

ـــ کردی بە پووش برنج :ـ
سووکو ڕسواو بێ نرخی کرد .

کردوویە ـ کردوویە بە بنێشتی مەلای مەزبوورە :ـ
( واتا : ئاگاداریی ماڵەکەی دەکاتو دەیپارێزێت . گوایا مەلای مەزبوورە بنێشتی جاویوەو کاتێ زاری شل بووە دەری هێناوەو بە سەری لوولیەوە نووساندوویە ، گوتوویانە مەلا ئەوە بۆ وا دەکەیت گوتوویە دەمەوێ ماڵی خۆم هەمیشە لەبەر چاوم بێت ) .

کردییــە ـ کردییە کونەوە :ـ
١ ـ بەزاندی .

٢ ـ تۆقاندی ٠

کـــرمن ـ کرمنه :ـ
به ئافرەتێك دەڵێن زۆر حەز له مێرد بکات ٠

کـــرم ـ کرمی خۆی دەکوژێت :ـ
به یەکێك دەڵێن که دڵخوردیی خۆی بەکارێك لابەرێتو خـــۆی پێوه خەریك بکات ٠ مەراقی دڵی خۆی پێ دامرێنێت ٠

کـــزه ـ کزەی ـ کسپەی ـ له جەرك هەستاند :ـ
ســـوێی کـــرده دڵیـــەوەو خەفەتێکی تاڵی پێ گەیاند ٠ زارۆڵەکەی فەوتاند ، مراندی ، کوشتی ٠

کسپ ـ کسپو کۆ :ـ
گڕی گەرمییەکه که له دەروونادا پەیدا دەبێت واتا : کسپه کـــسپی سووتانو کێویکی ئاگر له دەروونادا ٠ ئەمه به هۆی توورِه بوونەوه ، به هۆی ئارەزوو حەزێکەوه ، هەوەسێکەوه پەیدا دەبێت ، لـــه دەروونادا پەیدا دەبێت ٠ دەڵێن ، کسپو کۆی دڵی دامردەوه ٠ واتا رقەکەی نیشتەوه ٠ گڕی ئاگری دەروونی حەزەکەی دامردەوه ٠

کـــسپ ـ کسپو هوورِ :ـ
کسپه کسپێکی زۆر ٠

کشه مرێ ـ کشه مرێیه :ـ
واتا : هەر بڵێی کشه مرێ دەرکی کولانەکەمان لێ دەگرێت ٠ به یەکێکی دڵ ساسکی به بیانوو دەوترێت که زوو دڵگیر بێتو لووت هەڵکات

کش‌و ـ کش‌و مات :ـ

بێ دەنگ‌و بێ جووڵەو خشپە ٠

کفت ـ کفت‌و کۆ :ـ

دەڵێن کفت‌و کۆی دڵی دامردەوە ٠ کفت : شەکەتی‌و پەرێشانی‌ی دەروون‌و دڵ ، یان لەش واتا : تێری لەو شتە خواردو تاسەی لێ شکا بە تایبەتی بۆ ئافرەتی بێزووکەر ٠ ماندوێتی‌و ئازاری لەشی دامرکاو دامردەوە ٠

کفن در ـ کفن درە :ـ

ژیانێکی ئەفسووناوی دەژی ولە مردن سڵ ناکات ٠

کفن دز ـ کفن دزە :ـ

واتا چاوی بریوەتە ماڵی ئەم‌و ئەوو لەو پێناوەدا کۆ لە هیچ ناکات بێ ویژدانی دەکات ٠ ئەمە ئەو بەندەوە هاتووە کە دەڵێت : رەحمەت لە کفن دزی قەیم ٠

کفنی ـ کفنی بۆ بڕی :ـ

واتا : تۆقاندی‌و ترساندی بە شێوەیەك وەك مردووی لێ کرد ٠

ــ کفنی لە کوێ هەیە تا گۆڕی هەبێت :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە هیچی نەبێت ) ٠

کـــل ـ کل لە چاو دەفڕێنێت ـ کل لە چاو دەدزێت :ـ

١ ـ دزێکی چابوك‌و شارەزایە ٠

٢ ـ ناپاکە پشتی پێ نابەسترێت ٠

کڵاوی ـ کڵاوی لە ڕاستیدا دڕاوە ـ کڵاوەکەی لە ناوەڕاستدا دڕاوە :ـ
( واتا : هێندە ڕاستگۆو حەقبێژە بە چەپۆك کڵاوەکەیان دڕاندووە )٠

کـــڵاو ـ کڵاویان ئاوێتە بووە :ـ
بە هـۆی ژنو ژنخـــوازییەوە خزمایەتییان پەیدا کـــردووەو پەیوەندییان پتەو بووە ٠

ـــ کڵاوی ئەحمەد دەکات بەسەر مەحمووددداو هی مەحموود بەسەر ئەحمەددا :ـ
١ ـ بۆ مەرامی کاری خۆی لە فێڵو تەڵەکەبازیدایە ٠
٢ ـ کار بە بێ بنچینە دەکات ٠

کـــڵاو ـ کڵاوی بکەوێتە مزگەوتەوە بە گۆجان دەری دەهێنێتەوە :ـ
( واتا سەرو ساختیی لەگەڵ مزگەوتدا نییە ) ٠

ـــ کڵاوی پەرت دەکرد :ـ
توورە بوو بوو ، ڕقی هەستابوو ٠

کڵاوێکی ـ کڵاوێکی بۆ دابنێن هەتا ئێواریٚ لەگەڵی دەدوێت :ـ
زۆر چەنەبازە ٠

کڵاوی ـ کڵاوی هەمیشە لارە ـ کڵاوەکەی بە لایەکی سەریەوە ناوە :ـ
واتا : هەمیشە سەربڵندە ، کارەکەی پوختە کردووەو دڵنیایە ٠ منەتی کەس نازانێت٠

کـــڵاو ـ کڵاو هەڵدەدات :ـ
لە خۆشیدایە ، بە ئامانج گەیوە ٠

**كلك ـ كلكه له قنێیه‌تی :ـ**

مه‌رایی ده‌كات ، له به‌ریدا ده‌پاڵێوێت · بۆ سووكی ده‌وترێت ، چونكه سه‌گ بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی كلكه‌له‌قێ ده‌كات ·

**كلكه ـ كلكه‌قونێ ده‌كات :ـ**

١ ـ یاری له‌گه‌ڵدا ده‌كات‌و ختووكه‌ی ده‌دات ·

٢ ـ ده‌یبزێوێت‌و هانی ده‌دات هاری ده‌كات ، به تایبه‌تی بۆ منداڵه ·

**ـ كلكه قونێیه‌تی :ـ**

نیازی كارێكی هه‌یه‌و ده‌ری نابڕێت ده‌ڵێن : كلكه‌قونێ چیته ؟ · واتا : نیازی چیت هه‌یه ؟ وا كه‌وتوویته جرت‌و فرت‌و خۆ خه‌ریك كردن ·

**كلكیان ـ كلكیان هه‌ڵكێشا :ـ**

بۆ سووكی‌ی ئه‌و كه‌سه‌یه كه پێی ده‌وترێت · واتا : له‌سه‌ر كاره‌كه لایان برد ، ده‌ریان كرد ·

**كلكیه‌تی ـ كلكیه‌تی :ـ**

هه‌میشه به دوایه‌وه‌یه ·

**كلك‌و ـ كلك‌و گوێی ده‌كات :ـ**

بۆ هه‌ڕه‌شه‌یه · واتا ته‌مێی ده‌كات ، سزای پێ ده‌نۆشێت ، تووشی زیانی ده‌كات · زوو وا باو بوو كه گوێی وڵاخی دوژمن ده‌بڕا یا كلكی ، بۆ ئه‌تك‌و هه‌ڕه‌شه ·

کلکی ـ کلکی پێواوەو دەزانێت چەند بستە :ـ

واتا : دەزانێت چی لە باردایە ، هەڵی سەنگاندووە ٠

ــ کلکی کەر بە دەستەسڕ دەگریت :ـ

١ ـ ( بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێت کە زۆر پاکو تەمیزی بخوێنێتەوە ) ٠

٢ ـ بە دەعیەو فیز بێت بە بێزەوە دەست بداتە کارێك ٠

ــ کلکی لە کوڵە کەمترە ـ کلکی لە سەگ کەمترە :ـ

کوڵە ÷ ناوی سەگە ٠ بۆ تەوس‌و پێکەنین دەوترێت واتا : زۆرزانە ٠

ــ کلکی لە هەزار تەڵە پساوە :ـ

واتا : مرۆڤێکی زۆرزان‌و شارەزایە پێچ‌و پەنای ژیان بەڵەدە ٠

ــ کلکی ـ جووچکەی ـ وشتر گەیبە زەوی :ـ

دەڵێن : تا شتێکی لەدەست بووەوە کلکی وشتر گەیبە زەوی واتا : زۆر بە گران‌و درەنگ ٠

کلیل ـ کلیلی خانی دزیوە :ـ

بە یەکێك دەڵێن پارەی زۆر بێت ، یان بێ دەربەسانە پارە خەرج بکات ٠ خان ÷ ئەو بازاڕەیە کە دووکانی بازرگانە گەورەکانی تێدایە ئەو کەسەی کلیلی خان بدزێت واتا پارەی ئەو بازرگانانەی دزیوە ٠ یان خان بە مانای میرە ، پاشایە ٠ ئەوەی کلیلی ئەویش بدزێت کلیلی قاسەکەی دزیوە کە پارەکانی تێدایە ٠

کنگە ـ کنگە شەڕ :ـ

شەڕە قسە ، شەڕ کردن‌و بە دەم شەڕەوە کشانەوە ٠

و ـ کنگەو تلوور :ـ

پاڵ کەوتن بە شێوەیەك کنگ دەرپەڕێت ·

کـــۆتر ـ کۆتر لە دەماخی دەفڕێت :ـ

( لووتی هێندە بەرزە کۆتر هێلانەی تێدا دەکات ) ·

کـوت‌و ـ کوت‌و پڕ ـ کوت‌و مزرەقی :ـ

دەستبەجێ ، لە ناکاودا ·

ـــ کوت‌و کوێر :ـ

کوت لە پەل کوتانەوە هاتووە · واتا کوێرێکە پەل دەکوتێت یان چاوی کزە وەك کوێرە بۆ تەشەرو تەوسیش دەوترێت دەڵـێن : جـا ئەو کوت‌و کوێرە چی‌یە کچی بدەنێ !؟ ·

کـوت‌و ـ کوت‌و مت :ـ

دەڵێن کوت‌و مت لەو دەچێت · واتا بە تەواوی وەکو ئەوە · یان کوت‌و مت دەڵێی بەدەم دایناوە · واتا : زۆر لەو دەچێت ·

کـــوجا ـ کوجا شاهی میسلی قازی :ـ

کوجا = کـوا ( فارســی‌یە ) · شاهی : شـــاهد ( عـــەرەبی‌یە )

میسـلی : مثل ( عەرەبی‌یە ) : وەکو · واتا : چی لەوە باشترە کە قازی خۆی شایەت بێت ·

کوچـك ـ کوچك دەکوڵێنێت :ـ

( هەوڵی بێ سوود دەدات ) ·

— کوچك دەدا بە مل کوچکدا ـ دار بەسەر بەردا دەدات :

١ ـ زۆر تووڕە بووە .

٢ ـ بۆ شت دەگەڕێت و بۆی شپرزەیە .

کوچوولە ـ کوچوولەی خواردووە :

کوچوولە = ژارە ماسی‌یە بۆ گاڵتەو پێکەنینە . واتا : ژارەماسی خواردووە وا نەخۆشە ؟

کوڕانی ـ کوڕانی‌یە :ـ

بە ئاڤرەتێك دەڵێن کە لاسایی پیاو بکاتەوەو لەسەر سروشت و ڕەوشتی ئافرەت دەرچێت .

کوڕ ـ کوڕ شیوەڵەیە :ـ

شیوەڵە : خڕۆڵە = پێگەیشتوو واتا : کوڕ تەواوەو پێگەیشتووەو کارەکەیشی دروستە . بە کارێك لە هەلوێستێکدا دەوترێت کە کارەکە تەواو بێت و بە پێی پێویست و دڵ بێت .

کورتەك ـ کورتەکەکەی کورتە :ـ

کورتەك کالآیەکی ناودارە لە زستاندا دەکرێتە بەر (واتا بێ ئەقڵ و نەفامە ) .

کورت و ـ کورت و کۆڵ :ـ

کەم و ناتەواو .

کورتی ـ کورتی هێناوە :ـ

١ ـ نەگەیوەتە ئەنجام .

٢ ـ بەشی نەکردووە ـ بۆ قوماش ، پارە دەوترێت ٠

٣ ـ تێ شکاوە ، لە کارەکەیدا زیانی لێ کەوتووە ، مایەکەی خۆی نەگرتۆتەوە ٠

کوڕ ـ کوڕی کۆڕە :ـ

لێهاتووەو لە هەموو کۆڕێکدا دەردەچێت ٠

کــوڕی ـ کوڕی عەتە ترپاشایە :ـ

بە یەکێك دەڵێن ـ بە تایبەتی منداڵ ـ کە لووتی بەرز بێتو بــە هەموو شتێك ، خواردنێك ، دانەکەوێتو قایل نەبێت ٠

ـــ کوڕی گوێ ئاکردانەو کون لە جەرگیدا نییە :ـ

١ ـ ( بەیەکێك دەوترێت کە لە ماڵی خۆیدا دانیشتبێتو مەردوم بۆ جەنگو کاری ترسناك بنێرێت ) ٠

٢ ـ بە یەکێکی فیشاڵکەری ترسنۆك دەوترێت کە لە پاڵەوە باسی ئازایەتیو شەڕ بکات ٠

کوزێ ـ کوزی بێ مووی دەوێت :ـ

بە تەوسو تەشەرەوە بە یەکێك دەڵێن کە بە شتێك ، یان هیــچ شتێك قایل نەبێت ، شتێکی بوێت بێ ئەرکو کێشە دەستی بکەوێت٠

کۆزەر ـ کۆزەرو بەربای عومری نا :ـ

واتا : باشی کوتاو لێی دا ، وەك چۆن سەرکــۆزەری خــەرمان دەکوترێت ، تا گەنمەکە لە گوڵە نەکوتراوەکە دەردێت ٠

کووزەڵە ــ کووزەڵە بە نان دەکات :ــ

زۆر هەژارە ٠

کۆستە ــ کۆستە بایی‌یە :ــ

(گاڵتە جارە ، وشکە دێوانەیە) کۆستە بە پیاوێك دەڵێن کە رووی مووی لێ نەڕوێت یان زۆر تەنك بێت لە چــیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی کورددا کۆستە بە پیاوێکی گاڵتەجاڕو فێڵباز پیشان دەدرێت ٠

ــ کۆستە کۆستەیە :ــ

١ ــ هەر کەسە هەوڵی بەشی خۆیەتی ٠

٢ ــ چاوو ڕاوی هەڵخەڵەتاندنە ٠

کۆستی ــ کۆستی کەوتووە :ــ

کەسێکی نزیکی مردووە کە ژیانو خۆشی‌ی ئەوی پێوە بەند بووە ٠

٢ ــ بە یەکێك دەڵێن کە پشتو پەنای بڕابێت ، هەژار کەوتبێت ٠

٣ ــ تووشی خەفەتێکی گەورە بووبێت بە هۆی ئەوەوە کە ناحەزەکەی سەرکەوتبێت یان تووشی قازانجێکی زۆر بووبێت بۆ ئەمە بە تەوسەوە بە کەسە دەڵێن : دەڵێی کۆستی کەوتووە ٠ واتا زۆری پێ ناخۆشە ٠

کۆڵە ــ کۆڵە ــ کۆڵی‌یە :ــ

١ ــ شارەزانییە ، فێر نەبووەو قاڵ نەبووە ٠ کوڵ = کــورتو ناتەواو دەڵێن : پەنجەی کۆڵە ٠ واتـاکورتە ٠

کۆڵەی ــ کۆڵەی کوتا :ــ

١ ــ پەکی خستو لە بڕی بردەوە ، دەستی بەستەوە ٠

٢ ـ زیانێکی گەورەی پێ گەیاند ٠

٣ ـ ئازارێکی زۆری دا ٠

کوللە ـ کوللە بە جەڕە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە هێندە لاولز بێت ، ئەندامەکانی وەك بەجـــەڕ لێکدرابێت وابێت ) ٠

کوڵ ـ کوڵو کۆ :ـ

دەڵێن کوڵو کۆی دامردەوە ، واتا سووتاو بوو بەەقـــەرەبروت یان دەڵێن : کوڵو کۆی دەروونی دامردەوە ، واتا : جـــۆشی دەروونیو هەستانی دەروونی کپ بوو ، خاو بووەوە ٠

کـوڵێ ـ کۆڵێ پێوە هەڵگرتووە :ـ

زۆر بەتەنگەوە دێتو دڵـسوازنە خەمی دەخواتو خـــەریکیەتی ، مشووری دەخوات ٠

کـــۆن ـ کۆنە چەکمەرەقە :ـ

( بە یەکێکی بێ ناوو نیشان دەوترێت کە بەناو ئاغـــاو وەکی تریش هیچی نەبێت ٠ بە پیاوێکی بووەی لێکەوتوو دەڵێن کە بە فیزو دەعیە بێت ) ٠

کـــون ـ کونە فیشاڵە ـ کونە درۆیە :ـ

بە یەکێکی درۆزنی خۆ هەڵکێش دەوترێت کە شتی گەورە گەورە بداتە پاڵ خۆی ٠

ـــ کونە مشکی لێ بوو بە قەیسەری :ـ

لە ترساندا شوێن نەبوو خۆی تێدا بشارێتەوە ٠

— کون بە سەهۆڵ ناگیرێت :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە چارەی شتێك بە شتێکی هیچو پووچ بکات ) ٠

واتا ئەم چارەیە سەر ناگرێت ٠

— کون لە جەرگیدا نییە :ـ

زۆر نازاو بەجەرگە ٠

کوێرایی ـ کوێرایی بە چاویدا هاتووە :ـ

تووشی خەفەتێکی ئەوتۆ گرانو سەخت بووە جیهانی لەبەر چاو تاریك بووە ، وەك کوێر بووبێت ، رۆ شنایی‌و خۆشی‌ی جیهان نابینێت ٠

بە یەکێك دەڵێن کە وریا نەبێت‌و سەرنج نەداتە بەر پێی یان کارەکەی٠

کوێر ـ کوێر بووەوە :ـ

دەڵێن ئەو بنەمالەیەش کوێر بووەوە ٠ واتا : کەس لەوەجاخیاندا نـەما ٠

کوێر ـ کوێری کردەوە :ـ

براندییەوە ، کوژاندییەوە نەیهێشت ٠

کێچ ـ کێچ بە گا دەفرۆشێت :ـ

واتا : زۆر گرانجانە ٠

— کێچ کەوتە کەوڵی :ـ

١ ـ ئارامی لەبەر برا ، پەلەی رۆیشتنیەتی ، پەلەی تەواوکردنی کارەکەیەتی ٠

٢ ـ دڵخوردە ٠

— کێچی هەڵهێناوە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کـــە زۆر دانیشتبێت‌و لە دانیشتن وەڕس بوو‌بێت ) ٠

کـێر ـ کێر بەر کێری نادرێت :ـ

بە وەڕسی‌و بێزارییەکەوە بە یەکێك دەوترێت کە زۆردارو جەربەزە بیت ٠ واتا ملەملەی لەگەڵدا ناکرێت ، لەبەر زۆرداری شان لــە شانی نادرێت ٠

کـێر ـ کێر زلی‌یە :ـ

بە بێزارییەوە دەوترێت واتا زۆرداری‌و کەڵەگایی‌یە ٠

کیسە ـ کیسەی بۆ هەڵدڕووە :ـ

چاوەڕێ‌یە ئەو شتەی دەست بکەوێت ٠

کێشە ـ کێشەو بەرە :ـ

دەڵێن ئەم کێشەو بەرەیە بەمن ناکرێت ٠ واتا ئەم هاتو چۆو ئەرکە گرانە بە من ناکرێت ئەمە لە کرشە کێشـــانو بردنی بۆ ســـــەر خەرمانەوە هاتووە ٠

کیمیایی ـ کیمیایی ناگانی

( بە کارێك دەووترێت قازانجی ئێنجگار زۆربێت )

کێو ـ کێوی بە کۆڵەوە گرتووە

سەری دنیای لێ هاتۆتەوە یەك ٠ خۆی ماندوو خەفەتبار کردووە

ســا ـ گا به پێوه قووت دەدات :ـ

به یەکێك دەڵێن بەرتیلخۆر بێت یان دزێك بێت چابوك ، ماڵی میری ، هی ئەمو ئەو بێ سڵ دەماشێتەوه ·

ــ گا به دەنگی ناڕوات :ـ

بێ دڕکه · ( کەس به قسەی ناکات ) ·

ــ گا به گوندا دەناسیتەوه :ـ

بۆ تەوسو گاڵته پێ کردنه واتا ( زۆر نادانه ) ، نه شارەزایه ، درشته ·

ــ گاپێ یه :ـ

له رۆیشتندا سسته پەلەو خاوه ·

ــ گا ڕییاوه !؟

واتا : بۆچی پاره رژاوه ؟ · یەکێك ئەمه دەڵێت که بێزاریی خۆی بەرامبەر کەسێك دەربېڕێت که به تەنگەوه نەیەت ، زیان بدات شتی زۆرو زیاد بخوازێت ·

ــ گا گورواوه هەر کلکی ماوه :ـ

کار گەیشتۆته کۆتایی ، ئەوەندەی نەماوه به ئەنجام بگات ·

گــــا ـ گا گوی کرد :ـ

له رووی سووکییەوه به یەکێك دەوترێت که قسەیەکی ناپەسند بـکات ·

— گا لە کوڵاورۆژنەوە سەر دەخات :ـ

( دزێکی شارەزاو چاپوکە ) ٠ کلاو٠ رۆژنە ؛ کلاورۆشنەیە ، کونێکە هێندەی دەمی کلاوێکە لە بنمیچی خانوودا دەکرا ـ خانووی گڵی جاران ـ تا دووکەڵی لێوە بچێتە دەرەوەو شتێکیش روشنایی لێوە بێتە ژووریٚ ٠

— گاو کەرن بەرامبەرن :ـ

لە رووی سووکییەوە ( بە دوو شت ـ دووکەس ـ دەڵێن کە لە یەك بچن ٠ ) ٠

گـا گـو ـ گا گوە :ـ

بە کەسێکی بلـحی بێکارە دەوترێت ٠

گــاە ـ گاە گاە بە خەربار گاە گاە بە مسقاڵ :ـ

( بە شتێك دەوترێت کە هەندێك جار زۆرو هەندێك جاریش کەم بێت ) گاە : فارسی‌یە ، واتا : جار ٠

گــای ـ گای بە تەنیایە :ـ

واتا : وەك چۆن گایەك بە تەنها گێرەی پێ ناکرێت ئەو کەسەش بە تەنها ، بەبێ یارمەتی کاری بۆ نایەتە ئەنجامو بۆی ناکرێت ٠

گــا ـ گای بێ گاوانە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە کەسی نەبێت سەرپەرشتی بکات ، پشتگیریو راوێژی بۆ بکات ٠

— گای تەنها لەوەڕاوە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە لەگەڵ کەسدا هەڵ نەکاتو نەتوانێت بژی ) ٠

— گـای مارۆیە :ـ

١ ـ واتا : لە هەموو شوێنێك دەناسرێتەوە ٠

٢ ـ چارە رەشەو گوناە دەدرێتە پاڵ ئەو ، بێگاری پێ دەکـ
کار بە ملیدا دەدرێت ٠

— گای ناو گوێرەکەیە :ـ

( بە یەکیك دەلین کە هەمیشە لەکەل مندالاندا یاری بکات ) ٠

— گای یەك ئاخورە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە بیەوێت هەر بە تەنها بژیو لەگەڵ کەسدا نەبێت )

گـــاڵە ـ گاڵەی پێ کرد :ـ

حەشری پێ کرد ، زۆر لەگەڵیدا خەریك بوو ، دەڵێن گاڵەی بـە خواردنەکە کرد ٠ واتا : زۆری خوارد ، گاڵەی بە کارەکە کرد ٠ زۆر لەگەڵیدا خەریك بوو ٠

گاڵ ـ گاڵت وەگوێزە ـ بگوێزەرەوە :ـ

گاڵ = هەرزن ٠ واتا : بگوێزەرەوەو لاچۆ ٠ ئەمە بە گەمەوە بـە یەکێك دەوترێت بۆ لاچوونو گوێزانەوە ٠

— گاڵیش زادی خوایە :ـ

(یەکێك دەیڵێت بە یەکێك کە بە چاوی سووك تەماشای خزمێکی خۆی بکات ) ٠

گانیك ـ گانێك‌و تۆپێك جاو قەرزار دەبێت :ـ

بە تەوس‌و داخەوە.یەکێك دەڵێت کە چاوەڕێی ئەنجامێکی باشی کارەکەی ، پیاوەتییەکەی بێت کەچی لەبری ئەوە ، پیاو خراپیش بکرێت یان تووشی زیان بێت .

گـاور ـ گاور ـ دوژمن ـ بە جەستەی بێت :ـ

١ ـ واتا : زۆر پەرێشانەو ئازارێکی زۆری هەیە .

٢ ـ بارێکی نالەبارو شپرزەی هەیە .

گـــاور ـ گاوری سەر کۆی پی موسوڵمان دەبێت :ـ

واتا : زۆر شپرزەیەو هەموو کەسێك بەزەیی پێدا دێتەوە ، سا یا کۆستێکی گەورەی کەوتووەو لە شینــدایە یان ئازارێکی زۆری هەیەو لە چەپۆکاندایە .

گەجەر ـ گەجەرو گوجەر :ـ

( مەردومی هیچ‌و پووچ ) .

گەڕەلاوژێ ـ گەڕەلاوژێیە :ـ

گەڕەلاوژێ = گۆرانی وتنە بە سەرە . بەڵام لێرەدا واتاکەی ئەوە دەگەیەنێت کە هەر یەکە بۆ خۆی دەنگی لێ هەڵبڕیوە ، ســا یا قسەدەکات یان گۆرانی دەڵێت‌و کەس گوێ لەوی تر ناگـرێت‌و ژاوەژاوەوکەس لە هیچ ناگات .

گــەڕ ـ گەڕ بووە :ـ

١ ـ ڕسوای بەر چاوی خەڵك بووە .

٢ ـ هەژار کەوتووە .

— گەڕو گوڕ :-
فڕو فێڵ • بیانوو گرتن‌و تەشقەڵە لێدان •

— گەڕو گێنچەڵ :-
گەڕ بیانوو گرتن‌و تەڵەکەبازی،گێنچەڵ = گۆبەند • گۆبەند گێڕان
شەڕ فرۆشتن واتا فڕو فێڵ‌و تەشقەڵە کردن •

گـەڕ ـ گەڕی بارە ترێیە :-
( بە یەکێك دەڵێن کە دوای بڕانەوەی کارێك ئینجا گەڕ بکات ) •

— گـەڕی کرد :-
پەرێشانی کرد ، سا لە هەر ڕوویەکەوە بێت بە ئازار بێت ، بە
زیان بێت ، بە سووك کردن بێت بە هەر چییەك بێت •

گـەردن ـ گەردن کەچە ـ لارە ملە :-
١ ـ بار کەوتووە •
٢ ـ خەفەتبارە •
٣ ـ بێکەس‌و پشتیوانە •
٤ ـ هەژارە •

— گەردنت ئەستوورە :-
بە تەوس‌و تەشەرەوە بە یەکێك دەڵێن کە گوناه یا خراپەی زۆر
کردبێت ، یان بییەوێت بیکات •

گـەرما ـ گەرماو سەرمای زۆر دیوە :-
قاڵبووی ژیانەو شتی زۆر بەسەر هاتووە ، دنیا دیدەیە •

گەرم ـ گەرم بووە :ـ
واتا : جۆشی سەندووە ، سا یا لە قسەکردندا یان لە کار کردندا ، یان لە توورە بووندا ٠

ـــ گەرمو گوڕە :ـ
دەڵێن لە کارەکەیدا گەرمو گوڕە ٠ واتا باش تێ هەڵچووەو بەتین دەڕەنجێت ٠

گــەز ـ گەز گەز باڵا دەکات :ـ
زۆر دڵخۆشە ٠

ـــ گەزو مەقەست بە دەست خۆیەوەیە :ـ
سەربەستە ، خۆی خاوەنی دەسەڵاتە ٠

گـەندە ـ گەندە خۆرە :ـ
١ ـ بە شتی هەرزانەوە دەنیشێتەوە گەرچی گەندیش بێت ، دەیکڕێت ٠
٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە لە کاری سووکو بێ نرخ بگەڕێت ٠

گـەنم ـ گەنم گردو جۆ بڵاو :ـ
واتا هیچ نەماوە بڵاوەی لێ بکەن بۆ شەڕ یان بۆ یاریی منـــداڵان دەوترێت ٠

ـ گەنم گەنمی چیتە :ـ
واتا ئەم هەموو پرسو وەڵامو قسە کردنەت لە چییە ٠

گـەنم ـ گەنمی قەندەهاری‌یە :ـ

بە یەکێك دەڵێن خاوەن بەهرە بێت ، لێهاتوو بێت ، پیاوی هەموو کارێکی گران بێت • گەنمی قەندەهاری = گەنمێکە لە کوردستاندا دەکرێت ، باش دەبرێت‌و زۆریش بەپێزە • باشترین گـــەنمی کوردستانە • •

گەوهەر ـ گەوهەری شەو چراخە :ـ

گەوهەری شەوچـــراخ = گەوهـــەرێکە ئەفسانە ؛ لـــە چـیرۆکە فۆلکلۆرییەکاندایە وەك چـــرا شـــوێنی ڕووناك کردۆتەوە • بە ئافرەتێك دەڵێن سوورو سپی‌و زۆر جوان بێت ، دڵی تەماشاکەرەکەی ڕووناك بکاتەوە •

گـــران ـ گران دێتە دەست :ـ

١ ـ بەکارێك دەڵێن کە تەگەرەی زۆری بێتە ڕێ •

٢ ـ بە یەکێك دەڵێن کە لەکاردا خاوو خلیچك بێت ، یان کـــەم مشوور بێت •

گـــڕ ـ گڕەکەی دامردەوە :ـ

ئارەزووەکەی مردو بە ئاوات گەیشت.تێر بوو دامرکایەوە •

ــ گڕو ـ بف ـ پف :ـ

دەڵێن گڕو پفێکە • پف = فوو لە ئاگر کردنە بۆ خۆشکردنی واتا : زوو دادەمرێتەوە ، تەمەنی ئەو شتە کورتە ، زوو کـۆتایی دێت‌و لەناو دەچێت •

گـــڕ ـ گڕو کف :ـ

واتا گڕێکی کەمو کفێکی خێرایە دادەمرێتەوە.دەڵێن : هەڵچوونەکەی ، تابوشتو کارەکەی هەر گڕو کفێك بوو ، واتا زوو کۆتایی دێت ٠

گـــــڕ ـ گڕو گاڵ :ـ

دەڵێن منداڵەکە کەوتۆتە گڕوگاڵ ٠ یا بە تەوسەوە بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە کەوتبێتە جرتو فرتی شتێك یان قسەی بەرزو نزمی کردنو لە خۆ گۆڕان ، واتا کەوتۆتە خۆ نواندنو دەرخستن.منداڵەکە بەوەی کە گاڵە گاڵ دەکاتو جۆرە دەنگێکی تایبەتی دەکاتو وتـە وتێکی ساوایانە دەکات ٠ دەڵێن : حەز لە دەنگی خۆی دەکات ، کە ئەوەش راستە چونکە خۆ دەرخستنەو بوونی خـۆی بە دەورو پشتەکەی دەسەلمێنێت ٠

ـ گڕو هووڕ :ـ

گڕ = دەنگێکی ناسافە ٠ واتا : دەنگێکی ناسافی بەرزو زۆر.دەڵێن : ئەو گڕو هووڕەت لە چی‌یە ٠ واتا ئەو گڕەگڕە زۆرەت لە چی‌یە ٠

گـــڕ ـ گڕی تێ بەر بوو ـ ئاگری گرت :ـ

١ ـ ئارەزوویەکی تەواوی جووڵا ، سا بۆ هەر شتێك بێت ٠

٢ ـ سۆزی جووڵاو بۆی شپرزە بوو ، بەزەییەکی زۆری پێـدا هاتەوە ٠

گـرەو ـ گرەوی لە شەیتان بردۆتەوە :ـ

واتا : زۆرزانێکی ئەوتۆیە کەس نایگاتێ ٠

گرتیه ـ گرتیه دەستی خۆی :ـ

١ ـ خۆی کارەکەی کرد ٠

٢ ـ خۆی سەرپەرشتی کرد ٠

گرێشمه ـ گرێشمه ـ و ناز :ـ

گرێشمه = به تیلایی چاو تەماشاکردن ٠ واتا : شۆخی کردنو به تیلایی چاو ڕاکێشانی سەرنجو خۆ خۆشەویست گردن ٠

گـــرێ ـ گرێ کوێرەیه :ـ

کارەکه ئاڵۆزەو چارەکردنی گرانه ٠

گرێی ـ گرێی بەختی کرایەوە :ـ

به کچێك دەوترێت که شوو بکات ، به تایبەتی دەمێك بێت سەروعوزر شۆریش بێتو شووەکەیشی باش بێت ٠

ـــ گرێی دەست مەخەرە ـ دەم ـ دان :ـ

( ئیش زوو ڕاپەڕێنه تا گرێ کوێرەی تێ نەکەوتووه ) کارێك مەکه پەشیمان بیتەوە ٠

گـــز ـ گزو فتی بۆ دەدات :ـ

( زۆر به جەختی ئارەزووی دەکات ) ٠ گز = ئارەزوویەکـی زۆرو خولیای شتێك ٠

گـــژ ـ گژو گیا :ـ

گیایەك که زۆر بێتو به گژ یەکدا چووبێت ٠

گشته ـ گشت گیانی ملّووچه دەکات :ـ

واتا : لە خۆشیاندا گشت گیانی پێ دەکەنێت · ملّووچە = تەزووی خۆشی · یان · گشت گیـــانی تەزووی خـــۆشی پێدا دێتو لـــە خۆشیدایە ·

گڤـــە ـ گڤەی ـ گوڕەی ـ داوێنی دێت :ـ

١ ـ زۆر بە گوڕە ، هێشتا بە تینەو پیر نەبووە ·

٢ ـ بۆ تەوسە · واتا : هەر لە هاتو چۆ دایە ، خۆی خەریك کردووەو کەسیش نازانێت بۆ ؟ ·

گـــڵ ـ گڵە کوێر بێت :ـ

واتا : گڵ کوێرت کات ، بمریت · وەڵامی ئافرەتێکە بۆ ئافرەتێکی تر کە لە کردنی کارێکدا یان شتێکدا گاڵتەی پێ بکات · واتا : چ ڕایەکت دەکەوێت وا بە من بڵێیت · یا زەمان وای لێ هات تـــۆ گاڵتە بە من بکەیت ·

گـــوو ـ گوو بە کڵاوی کەس ناپێوێت :ـ

پرس بە کەس ناکاتو ڕای کەس وەرناگرێت ، لاسارە ، قســـە هەر قسەی خۆیەتی ، کەس بە هیچ نازانێت ·

ـــ گوو ناکات نەك برسی بێت :ـ

( زۆر چرووكو پیسکەیە ) :

ـــ گووی پی کرد :ـ·

١ ـ شپرزەی کرد ·

٢ ـ ترساندی ، تۆقاندی ·

— گوی دنیایان پێ دەڕپاندین :ـ

بە بێزارییەوە دەوترێت واتا : ئەرکێکی زۆریان بەسەردا دەداین و بێگارێکی زۆریان پێ دەکردین ٠

گـــوو ـ گووی قیرینی پێ کرد :ـ

١ ـ زۆر چەرمەسەریی دا ٠

٢ ـ ئازاری دا ٠

گـــۆ ـ گۆی هونەری بردەوە :ـ

واتا شارەزایانە ، لە کارەکەدا سەرکەوت ٠

گۆبەند ـ گۆبەندی نایەوە ـ گۆبەندی گێڕا :ـ

ئاژاوەی خستەوەو ململانێی دروست کرد ، هەراو گۆڵەزی نایەوە ٠

دەڵێن : قنگ بە گۆبەندە ٠ واتا : لە هەر شوێنێك بێت ئاژاوەیەك دەنێتەوە ، هەرایەك بەرپا دەکات ٠

گـــۆڕ ـ گۆڕ بەگۆڕ چوو :ـ

بە رقەوە بە یەکێك دەوترێت کە مردبێت و حەز لە چارەی نەکرێت ٠

واتا : ئەوچاکتر کە مردو لە دەستی رزگار بووین ٠

— گۆڕ نایگرێتە خۆی :ـ

واتا : ئەو کارە بکات زۆر گوناهبار دەبێت ٠ یان زۆر گوناهبارە ٠

گـــۆڕ ـ گۆڕ هەڵتەکێنە :ـ

بە مردوویەك دەوترێت کە لە دوای ئەو شتێکی ئەوتۆ ڕووی دابێت کە لە کاتی خۆیدا ئەو نەیهیشـــتبێت بـــکرێت ، نەیویستبێت ٠

به تەوس یان رقەوە دەوترێت واتا : وەرە دەرەوەو ببینە کار بەچی گەیشتووە .

— گۆڕی باوکی هەڵئاخنی :ـ
واتا : چنێوی بە باوکو باپیری دا .

— گۆڕی گومە :ـ
بە تەوسەوە بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە دیار نەبێت .

— گۆڕی هێناوەتە گۆڕخانە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت کە یەکێکی گەمارۆ دابێتو بە هەموو ڕەنگێك ئازاری بداتو تەنگی پێ هەڵچنێت ) .

گوڕە ـ گوڕەو بڕەیەتی :ـ
بە فیزەوە بەسەر ئەمو ئەودا دەخوڕێت .

— گوڕەی داوێنی دێت :ـ
گەڤەی داوێنی دێت ، هێشتا بەتینەو پیر نەبووە .

گورج ـ گورجو گۆڵە :
چابووكوبەدەستو بردە .

گوڕچك ـ گورچکی بڕی :ـ
گورچك = گورچیلە . واتا .
١ ـ کوشتی .
٢ ـ ئازارێکی زۆری پێ گەیاند .
٣ ـ تووشی گاشەی کرد .

ـــ گورچکی پره :ـ

واتـا :

١ ـ تێرو تەسەلە ٠

٢ ـ گوزەرانی باشە ٠

گورگان ـ گورگانە شەوێ بۆ دەكات :ـ

واتا : دەیخلافێنێت ، دەینوێنێت ٠ گورگانە شەوێ : وتەیەكـە وەك لایلایە ، بە دەم پشت خوراندنەوە دایك بۆ منداڵەكەی دەكات، تا خەوی لێ دەكەوێت دەڵێت : گورگانە شەوێ گورگانە شەوێ ، شەوكار درەنگەو خەوت لێ بكەوێت ، گورگانە شەوێ لە ماڵەكەی ئێمە دوورەوە كەوێ ٠ بچۆ بۆ ماڵی كوێخا ، كوێخا بخۆ پیـاوێكی پۆرخزو نالەبارە ، ژنە دەم هەراشەكەی بكە بە توێشوو ، كچەكەی بخەرە چاڵێكی گوو ٠ بەم شێوەیە ، دایك بە گەرەكدا ، بە ئاواییدا دەگەرێت‌و خەڵك بە خواردن دەدات تا منداڵەكەی كە چەند سالانێكە خەو دەیباتەوە ٠ وە ئەمە شێوەیەكی گاڵتە بازی‌و پێكەنیناوی هەیە نەك بۆ شكاندن‌و دوژمنكاری بێت ٠

گورگـە ـ گورگە بووە ـ خۆی گورگە كردووە :ـ

١ ـ یاخی بووە ٠

٢ ـ دوورە پەرێز وەستاوە ، وەك چۆن گورگێك ، كە زۆر بە پارێزە، دوورە پەرێز لە شتێك دەوەستێت ، چاوەڕێی ئەنجامێكە ٠

ـــ گورگە خەو دەكات :ـ

واتا : وەك گورك خەوی سووكە ٠ بە چاو نوستوو بە دڵ وریا ٠

— گورگە زێیە :ـ

کاتێك باران دەبارێتو هەتاویش دەبێت دەڵێن گورگەزێیە · گوایا گورك لەو کاتانەدا ، کەوا دەبێت ئەو دەزێت ·

— گورگە لۆقە :ـ

( ڕۆیشتنی کەسێك بە لۆقەو نەرمە ڕاکردن دەبێژرێت گورگە لۆقە ) ·

گورگە ـ گورگەو لە پێستی مەڕ دایە ـ لە پۆش مێشاگورگی دەکات :ـ

بە سەرزاری بەسزمانو پاكو دڵسۆزە ، لە ژێریشەوە ناپاکێکە بەوەزند ·

گورگ ـ گورگو تاو بوو :ـ

واتا ( فڕان فڕان بوو ) دەڵێن : کە دیم گورگو تاو بوو بەجێم هێشت·
واتا : وەك چۆن گورگ تاو دەداتە لاکی نێچیرەکەیو دەیفڕێنێت ئەو خەڵکەش وا تاویان دەدایە شتو شەڕەشانیان بۆ دەکردو فڕان فڕان بوو ·

— گورگ ومەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە :ـ

(دنیا زۆرئەمینە) · داد پەروەری بەسەر هەموو لایەکدا باڵی کێشاوە ·

— گورگی باران دیدەیە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە لە سەد ئاو بداتو قولەپێی تەڕ نەبێت )
واتا : خاوەن تاقیکردنەوەیەکی زۆرە،فێڵبازەو ناکەوێتە داوەوە ·

— گورگی ڕاودیدە ناکەوێتە رت ـ گورگی راودیدەیە :ـ

واتا یەکێك لەوەپێش گرفتارو تووش بوو بێت جارێکی تر خۆی لەو گێچەڵی تووش بوونە نزیك ناخاتەوە ٠

گوڕنەتەڵە ـ گوڕنەتەڵە :ـ
( شتێکی خەیاڵی یە مەردومی زیتەڵەو بزێوی پێ دەشـــوبهێنرێت )
دەڵێن : دەڵێی گورنەتەڵە یە ٠ بە منداڵێکی زیتو وریا دەوترێت ٠

گوریس ـ گوریس بە یەك لۆنە نەدەگەیشتەوە جا بە دوو لۆنە !!
( یەکێك ئەمە دەڵێت کە گوزەرانی تەواو نەبێت کەچی لە لابەلاوە تووسشی مەسرەفێکی قەبەی تر بێت ) ٠

ـــ گوریسی کاکڵە شێرە :ـ
واتا : درێژەی کێشاوەو هەر نابڕێتەوە ٠ دەڵێن چـــی بوو ؟ بوو بە گوریسی کاکڵەشێرە ؟ ئەم قسەو باسە هەر نە بڕایەوە ٠ ٠

ـــ گوریس کێشەکێ :ـ
دەڵێن ئەم گوریس کێشەکێیە بە من ناکرێت ٠ واتا ئەم ململانێو زۆرانبازییە سەختە ناکەم ٠ گوریس کێشەکێ = جۆرە یارییەکە بە دوو تاقم دەکرێتو هەر تاقمەی سەری گوریسەکەی بەینیان بۆ خۆی رادەکێشێت تا تاقمەکەی تر بۆ لای خۆی رابکێشـــێتو بەوەش یارییەکە دەباتەوە .٠

گۆزە ـ گۆزەش برای دیزەیە :ـ
بە دوو کەس دەوترێت کە لەیەك بچنو جیاوازییـــان نەبێت ، دەشێت خزم بن یا نەبن ٠ بە یەکێك وا دەوترێت کە شتێك بکات جێی رەختە بێت ٠

— گۆزەکە لە سەری ئەودا شکا :ـ

تاوانەکە بە ناڕەوا بە مل ئەودا تلایەوەو ئەو تاوانبار کرا ٠

گۆشت ـ گۆشت هەر لایەقی بازە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە شایستەی ئیشێك ـ شتێك بێت ) ٠

— گۆشتی پیسە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە درەنگ برینی چاك بێتەوە ٠

— گۆشتی تاڵ بووە :ـ

خۆی ناشیرین‌و بێزراو کردووە ، کردارێکی نواندووە ، لەبەر چاوی خەڵکی کەوتووە خەڵك خۆشی ناوێت ٠

— گۆشتی خۆشە :ـ

برینی زوو چاك دەبێتەوە ٠

گۆشت ـ گۆشتی دەخورێت :ـ

١ ـ ( زۆر بەستەزمان‌و کەڕەواڵەیە ) ٠

٢ ـ بە کچێك دەوترێت کە گەورە بوو بێت واتا : وەختی شووی هاتووە ٠

— گۆشتی سەر چەپەرە :ـ

( بێ نرخە ، هەرزانە ) ٠

— گۆشتی قازمان نەخواردووە :ـ

یەکێك دەوترێت کە قاوو قیژ بکات‌و مێشکی سەری ئەمو

ئەو بەرێت ، واتا · بێ دەنگ بە دەڵێن گوایا گۆشتی قاز مێشك‌و دەماری هەست بەهێز دەکات ·

— گۆشتی قیمەت ناکات :ـ

واتا : ناشیرینەو کەس نایخوازێت ·

گـوڵ ـ گوڵ گشتی دەخوێنێت :ـ

( یەکێکی شاد وا دەڵێت کە ئامانجی هاتبێتەدی‌و دنیا بەدڵی ئەو بێت ) ·

گـــوڵ ـ گوڵی دنیای چنیوە :ـ

بەری دنیای خواردووەو بەشی خۆی تەمەنی بەســـەر بردووەو خۆشیی دنیای دیوە ·

گولۆڵە ـ گولۆڵەی کەوتۆتە لێژی :ـ

١ ـ کاری بەرەو خراپی دەڕوات ، بۆی نایەت ·

٢ ـ چارەی لای ، لایان رەش بووە ·

٣ ـ تەنی دروست نییەو هەمیشە نەخۆشە ·

گوڵنگە ـ گوڵنگە دارە :ـ

واتا هەرزەو نەفامەو مەیبرزوێنە تێگەیشتنی نییە ·

گـــون ـ گونی بۆ لە خوم دەدات :ـ

بە تەوسەوە دەوترێت · واتا : هەر بە تەنگیشەوە نایەت‌و بە خەیاڵیشیدا نایەت · بۆ مردنی خۆشەویست سەر لە خـــوم دەنرا ·

— گونی خۆی‌و گێزەو لێك ناكاتەوە :ـ

بە گاڵتەو ئەوسەوە :

١ ـ بە یەكێك دەڵێن كە هیچ نەزانو كەودەن بێت ٠

٢ ـ سەری لە كارێك دەرنەچێت‌و تیایدا نەشارەزا بێت ٠

گـون ـ گونی گوندار دەر دێنێت :ـ

١ ـ ( زۆر بەدەستەڵات‌و دەست رۆییوە ) ٠

٢ ـ زۆردارە ٠

— گونی میش دەخەسێنێت :ـ

بە گاڵتەوە دەوترێت ٠ واتا : دەست بەتاڵەو كاری نییە ٠

گونك ـ گونكی سەر دڵە :ـ

واتا : زۆر خۆشەویستە ٠ بە منداڵێك دەوترێت كە یكی زۆر خۆشی بوێت ٠ دەڵێن ئەوە چییە ئەوەندە خۆشـتدەوێت دەڵێی گونـكی سەر دڵە ٠

گـوێ ـ گوێ قوڵاخ بە :ـ

واتا : گوێ شل بكە ، گوێ هەڵخەو هەواڵ بزانە.قوڵاخ : وشەیەكی توركی یە ، بە واتای گوێ یە ٠

— گوێ لەقە :

مرۆڤێكی نەقامە زوو مل دەدات‌و لە خشتە دەبرێت بۆ سووكی ئەو كەسە دەوترێت ٠ كەر گوێی لەقە ٠

ـــ گوێ له مشته :ـ

خۆش بڕوایه ، چی پێ بڵێن دەیکات ، بێ ئـەوەی بیر له ئەنگیو سەربەرزیی خۆی بکاتەوە ،

گـوێ ـ گوێی بڕی :ـ

١ ـ فێڵی لێ کردو له خشتەی برد ،

٢ ـ به گران شتەکەی پێ فرۆشت ، به هەرزان شتەکەی لەدەست دەرهێنا ،

٣ ـ تەمێی کرد ،

ـــ گوێی تەپه :ـ

مرۆڤێکی سەر شـــۆڕە ، به هەموو ئەنـــگییەك قایله ، به کەرێك چوێنراوە که گوێ تەپه ، واتا گـوێ شۆڕەو هەرچی پێ بـکەنو لێ بکەن نقه نەکات ،

ـــ گوێی خۆی دایه دەستی :ـ

ملی بۆ شۆڕ کردو خۆی دایه دەست ئەو ،

ـــ گوێی خۆی لێ خەفاندووە :ـ

به تەنگیەوە نایەتو خۆی لێ کەڕ کردووە ، خـستوویەتیه پشت گوێ ،

ـــ گوێیان له کڵاو دەرپەڕاند :ـ

( چاوەڕوانیی خراپەیان لێ دەکرێت ، ئامادەن بۆ خراپه کردن ) ،

گـوێ ـ گوێی مسی تێدایه ـ تێ کراوە :ـ

به ئارەزوو خۆی کەڕ دەکات ، به بێزاریو ڕقەوه به یەکێك دەوترێت

که بانگی بکەن‌و وەڵام نەداتەوە ٠

— گوێی ناڵ دەکات ـ گوێی دەبڕێت :ـ
بۆ هەڕەشەیە ٠ واتا تەمێی دەکات ٠

گوێز ـ گوێز بە گومەزدا هەڵدەخات :ـ
( ئەو ئامۆژگارییەی دەیکات جێ ناگرێت‌و لە گوێ ناگـــیرێت ) ٠
کارەکەی بێ ئەنجامە ٠

— گوێز لە باری خۆی دەژمێرێت :ـ
واتا : هەر کەسە خەمی خۆیەتی ٠ ( بە یەکێك دەوترێت کە ئاگای لە حاڵی یەکێکی تر نەبێت‌و نەزانێت کە ئەوی تر لـــەم کەمترە لـــەو شتەدا ) ٠

— گوێزی هەورامانی بۆ دەژمێرن :ـ
بە تەوس‌و پێکەنینەوە بە یەکێك دەوترێت کە ئاگای لە خۆی ، لە کارێك ، نەبێت‌و تێ نەگات لە کاتێکدا پرسیاری لێ بکەن یان باسی ئەو شتەی بۆ بکەن ٠

گوێزەبانە ـ گوێزەبانەی خاتوو پەریزادە :ـ
واتا ( گوێزەبانەی منداڵی ئاواتەخوازە ، مووفەرکە بیخۆ ) ٠

گیـــا ـ گیای تۆ نییە :ـ
( ئەم باسە تۆ تێی ناگەیت ) ٠ ئەم کارە لە کێشی تودا نییە ٠٠ بـۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە بیەوێت کارێك بکات یان لە باسێك بدوێت‌و نەیزانێت ٠

گیـــان ـ گیانی لەسەر لەپی دەستی خستووە :ـ

بێ سڵ خۆ دەهاوێتە ئەندێشەو باوەشی مەرگەوە ٠ خۆی قوربانی دەکات ٠

گـێرە ـ گێرە شێوێنە :ـ

١ ـ تەگەرە دەخاتە کارەوە ، کارەکە تێك دەدات ٠

٢ ـ ئاشووبگێڕە ٠ گێرە = کوتانی خەرمانە بە وڵاخ یان جەنجەڕ ٠ وڵاخێك مان بگرێت گێرەکە دەشێوێت ، واتا پەکی دەکەوێت و ڕادەوەستێت ٠

ـــ گێرەی پێ دەکات :ـ

واتا : بەسەری دەگێڕێت بۆ شتێك کە دیار نییەو نادۆزرێتەوە ، زۆر دەیهێنێت و دەیبات ٠

گیرفـان ـ گیرفانی بۆ هەڵنەدرووە ـ کیسەی بۆ هەڵنەدرووە :ـ

واتا : چاوەڕێی ئەو شتە نییە چونکە یان شتێکە بێ نرخەو ئـەوە ناهێنێت پیاو حەتی هەڵگرێت یان هی یەکێکە کە شایستەی ئەوە نییە پیاو چاو بەرەژێری بێت ٠

ـــ گیرفانی قووڵە :ـ

( زۆر چرووکە ) ٠

گـێزو ـ گێزو گۆڵنك :

گۆڵنگەیەکی زۆری شۆڕەوە بوو بەسەر ئەگریجەدا ٠ گێزوو = گێسووە کە ئەویش ئەگریجەیە ٠

گێژ ـ گێژو وێژ :ـ

( مەردومی وڕی بێ هۆش ) ٠

گیسك ـ گیسکە گڕویێ بار بوان :ـ

( بۆ شتێ بێ نرخ بەکار دێت ) ٠

ـــ گیسکەکەی هەیاسی خاسە :ـ

واتا هەر بەخۆیدا دێتو شتێکی بۆ دەبێت ، دەچێتەوە دۆخـی جارانی ، لاوازو پەرێشان دەبێتەوە ٠

گێسوو ـ گێسوو بڕاوە :ـ

گێسوو = ئەگریجە ٠ واتا ئەتلکو بە پەند کراوە ٠ جارێ واش هەیە بۆ پێکەنین ، یان لە رقدا بە ئافرەتێك دەوترێت گەورە بێت یان بچووك ٠

# ل

لات ـ لات پاڵەوانی خوایە :ـ

هەژارو پەرێشانەو ئەگەر لە پێناوی مافێکی خۆیدا سـەریشی دابنێت بە دەربەسەوە نایەت ·

ـــ لات‌و لەوار ـ لێوار :ـ

لێوار = سەر بەگێچەڵ واتا : هەژارو رەزەڵخوای سەر بەگێچەڵ · دەڵێن ئەوە چیتە هەر بەلات‌و لەوارەوە دەنیشیتەوە · واتا هـەر هەژاری سەر بەگێچـەڵ دەکەیتە ئاشنـات ، لە خـۆت کـۆ دەکەیتەوە ·

ـــ لات‌و لووت :ـ

نابووت‌و هەژار ·

لاتانە ـ لاتانە دەفرۆشێت :ـ

بە یەکێکی هەژار دەڵێن کە گێچەڵ بنێتەوەو شـەڕ بەم‌و بـەو بفرۆشێت ، تا شتێکی دەست بکەوێت ·

لاتڕ ـ لاتڕ قەوچەپێچ :ـ

واتـا :

١ ـ لاسەرلایی ، بە تەنگەوە نەهاتن ·

٢ ـ قسەیەك یان کردەوەیەکی بێ تامی ناتەواوو نەفامانە ·

٣ ـ ( بە شتی لارو وێرو پێچ‌و پلووچ دەڵێن · دەبێژرێت : ئەم شتە لاتڕقەوچەپێچە بەمن چاك ناکرێت ) ·

لاجلاج ـ لاجلاجه :ـ

قومارکەرێکی ئەفسانەیی‌یە کە کولووری دنیا هی ئەو بووەو دەستی لە قومار کردنەکە هەڵ نەگرتووەو بە تەنگ دۆڕانیشەوە نەهاتووە ·
ئەمە بە یەکێك دەڵێن کە چی دەست بکەوێت لەبەردی بداتو بە تەنگیشەوە نەیەت ·

لارەمل ـ لارەمله :ـ

١ ـ دڵ شکستە ·
٢ ـ نوشوستی هێناوەو باری کەوتووە ·
٣ ـ بێ نەوایە ·

لار ـ لارو لەنجه :ـ

شۆخی‌و لەنجەکردن لە ڕۆیشتندا ·

لاف ـ لافو گەزاف لێ دەدات :ـ

خۆ هەڵدەکێشێت ، شانازی بە کەسێکەوە ، بە شتێکەوە دەکات ، بای تێ چووە ·

لالا ـ لالا موو دەکات :ـ

واتا : زۆر سەرخۆشە بەڕەنگێك ئاگای لە خۆی نەماوە ·

لاولاو ـ لاولاوه :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە تازە باریبێتە ، هاتبێتە ، شوێنێـــكو هیچی نەبێتو بیەوێت زوو سەرکەوێتو پێ بگات بێ ئەوەی لە هیـــچ ڕوویەکەوە بە تەنگ دەورو پشتەکەیەوە بێت ·

لام ـ لام‌و جیم ده‌کات :ـ

به یه‌کێك ده‌ڵێن دژی یه‌کێك بجووڵێته‌وه ، قسه بکات ، سه‌رپێچی بکات‌و به‌هانه بهێنێته‌وه ٠

له‌ناو ـ ده‌رهاتگه ـ ده‌رهاتووه :ـ

( واتا تازه پێ‌گه‌یشتووه‌و جوانه ) ٠

ـــ له ئاوی ساردو گه‌رم ده‌ترسێت :ـ

سڵ له هه‌موو شتێك ده‌کاته‌وه‌و هه‌میشه له پارێزدایه ٠

ـــ له ئاوی شه‌و پارێز ـ وه‌رع ـ ده‌کات :ـ

پیاوێکی موسوڵمانه ، دنیای خستۆته لاوه ، تا ئاوی شه‌ویش که ده‌کرێته گۆزه‌وه تا ساردبێت له‌و ئاوه‌ش خۆی بێبه‌ش ده‌کات ٠ نه‌فس‌و ئاره‌زووی خۆی تا ئه‌و راده‌یه ده‌مرێنێت واتا : له حه‌ڵاڵ‌و حه‌رام زۆر ده‌پرسێته‌وه ، ده‌کۆڵێته‌وه ٠

له ئه‌ستۆ ـ له ئه‌ستۆی خۆی دا : ـ

قسه‌کانی سه‌لماندو بڕوای پێ کرد ، پشتگیری کرد ٠ ده‌ڵێن : باپیرت پیاوێکی چاکه هه‌رچی بڵێت خه‌ڵك بۆی له ئه‌ستۆ ده‌ده‌ن ٠ واتا ده‌ڵێن : ئۆباڵ به گه‌ردنم‌و ده‌ستیش ده‌ئێشن به گه‌ردنی خۆیاندا ٠

له‌بار ـ له‌باره :ـ

واتا گونجاوه رێکه ٠ ده‌ڵێن : فیسارکه‌س بۆ ئه‌و کاره زۆر له‌باره ، واتا ده‌گونجێت ئه‌و کاره‌ی پێ بکه‌ن ، توانای هه‌یه‌و قابلیشه‌و تیایدا سه‌ر ده‌که‌وێت ٠

له بەختان ـ له بەختانمه :ـ

به داخ‌و تەوسەوه دەوترێت واتا : بێ بەختم ئەگینا ئەو خوێرییە نەدەبوو بە کۆڵەوە ، کارەکەم ناڕاست نەدەڕۆیشت ٠

لەبەر ـ لەبەر باجی لەپشت بەیچی :ـ

( قەیچی شەمەقەست ٠ واتا روو بەروو دۆستەو له پاشـــلەش دەمی وەك مەقەست لێت دەخاتە کار ) ٠

لەبەر ـ لەبەر چاوی نییە :ـ

سپلەیه پێ نازانێت ، ئەو شتە باشانەی لەگەڵیدا کراوە ناهێنێتە بەر چاوی خۆی تا بیر بکاتەوەو کردەوەی خراپیان لەگەڵدا نەکات.

لەبەرد ـ لەبەردی دا :ـ

بە فیڕۆی دا له ناوی برد ، فەوتاندی وەك چۆن شتێکی ناســك بەبەردا بکێشێت لەدەست بچێت ٠

له برسا ـ لەبرساندا سکی، قوڕەی دێت :ـ

واتا : زۆر هەژارە ٠

له برنج ـ له برنجی بازیان بەنرخترە :ـ

بازیان ناوچەیەکی بەپیتی پارێزگەی سلێمانی‌یە ، برنجەکەی زۆر ناودارەو هیچ برنجێکی تری ناگاتێ ٠ ئەمە بەشتێك دەڵێن کــە زۆر بەنرخ بێت ٠

لەبلەبان ـ لەبلەبانێکە بۆ خۆی :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە قسەزان‌و کۆستاخ بێت ، بەدەم‌و پل بێت ٠

لەبلەب ＝ جۆرە کۆتریکە کە زۆر دەخوێنێتو خۆشیش دەخوێنێت

لەبن ـ لەبن دارێکدایە ـ پەلکی هیچ نییە ـ ج.پەلکی نییە :ـ
( بە کەسێك دەڵێن رەشبینی دایگرێت ) ٠

لە بن ـ لە بنی کوولەکەی دا :ـ
واتا : کارەکە ، قسەکە ، نهێنیەکەی ئاشکرا کرد ٠

لە بنە ـ لە بنەدایە :ـ
دەڵێن : بۆی لە بنەدایە واتا : بۆ هەل دەگەڕێت :
١ ـ پێوەی بدات ٠
٢ ـ کەڵك لەو شتە ، کارە ، ببینێت ٠ بنە ＝ کۆڵێتێکە کە ڕاوەکەر بە گەڵا دەیکات خۆی تێدا دەشارێتەوە ، نێچیرەکە ئەو نابینێت ، بەڵام ئەو نێچیرەکە باش دەبینێتو دێتە بەر دەستیو ڕاوی دەکات ٠

لە بێخەبەر ـ لە بێخەبەران کەشکەك سڵاوات :ـ
( لە رووی تیتاڵییەوە بە یەکێك دەوترێت کە ئاگای لە کارێك نەبێت) ٠

لە پار ـ لە پارەوە دوو ساڵە :ـ
( لە رووی تیتاڵییەوە بە یەکێك دەوترێت کە خۆی بە منداڵ بداتە قەڵەم ) ٠

لە پەنجە ـ لە پەنجەی ساغ کرم دەردێنێت :ـ
( ئەمەندە دانایە لە هەموو شت رەخنە دەگرێت ) ٠

لە پشت ـ لە پشتیەوە هێشوو دەکات :ـ

واتا : ئەو لەم زۆر خراپترەو ئەم لەو رووەوە کە باسەکەی لێ دەکرێت ناگاتە ئەو .

لە پلنگ ـ لە پلنگە لاندا ـ دەخەفێت ـ دەخەوێت :ـ

واتا : زۆر بەجەرگو بێباکو چاو نەترسە .

لە تام ـ لە تامی دەرکرد :ـ

زیاد رۆیشت ، لە هەرشتێکدا بێت .

لە تای ـ لە تای ترازوویەکدان ـ هاوتای یەکن :ـ

١ ـ چۆن یەکن .

٢ ـ بۆیەك باشن . بە زۆری بۆ دوان یان چەند کەسێك دەوترێت کە لە ڕەوشتو هەڵسو کەوتدا وەك یەك بن و بە دڵی ئەو کەسە نەبن کە پێیان دەڵێتو لە ڕووی تەوس و سووکییەوە وایان پێ دەڵێت .

لە تەڕ ـ لەتەڕ دەخواتو لەوشك دەنوێت :ـ

بە تەوس و ڕقەوە دەوترێت . واتا : خۆ نارەنجێنێتو لەسەر ڕەنجی ئەمو ئەو دەژی .

لە تەك ـ لەتەك خرسدا دەچێتە جەواڵەوە :ـ

( خرس : ورچ . بە یەکێك دەوترێت کە هاودەمی هەموو خراپێك بێت ) .

لە ترەنگەڕێ ـ لە ترەنگەڕێ خستیە سەنگەڕێ :ـ

بە یەکێك دەوترێت کە شتێك لە جێیەکی ناقۆڵاوە بخاتە جێیەکی

ناقۆلاترو خراپترەوە ٠

لەت و ـ لەت و پەرت ـ پەت :ـ

واتا لەت لەت و پەرش و بلاو بووەوە ٠

لە جلەو ـ لە جلەو بەر بوو :ـ

لە شیرازە لای دا ، بەرەڵا بوو بە ئارەزووی خۆی دەبزوێتەوە ٠

لە جێدا ـ لە جێدا ـ لە قافدا ـ گرتی :ـ

لە کردنی کەتنەکەدا روو بەرووی بـوو ، گـرتی ، ئاشـکرای کـرد ٠

لە جێی ـ لە جێی خۆی وشك بوو :ـ

١ ـ زۆر ترساو سام گرتی ٠

٢ ـ حەپەساو داخ دڵی گرت ٠

ــ لە جێی سندان ـ سنگان ـ قوزەلقورتە :ـ

یاداشتی خراپە هەر خـــراپەیە ٠ سـنگان ـ سندان = جـوٚرە نەخۆشییەکی کوشندەیە تووشی کاڵەکو شوتی دەبێت قوزەلقورتیش هەر وەك سندانە ٠

لە جێیەك ـ لە جێیە ـ نانیشێت ـ نانوێت ئاو بچێتە ژێری :ـ

( زۆر دووربین و بە پارێزە ) ٠

له چاو ـ له چاو ئەودا بە حەوت ئاو شۆراوەتەوە :ـ
بۆ بەراوردە ۰ واتا : ئەم گەلێك لەو باشترە ۰

ـــ له چاوی منەوە تەماشای بکە ـ لە دڵی منەوە تێی بڕوانە :ـ
چۆن دێتە بەر چاوی من با لەبەر چـاوی تۆیش وا بێت ۰ واتا :
من چەندو چۆنم خـــۆش دەوێت ، تۆیش با هێندەت لا نزیكو
خۆشـەویست بێت ۰

ـــ لە چاوی منت نەکەوتبێت :ـ
واتا : ئومێدم بە تۆیە کارەکەم بۆ جێبەجێ بکەیت ئەم رستەیە بۆ
هاندانی کەسێکە کە کارێك بکات ۰

لە حاڵ ـ لە حاڵی خۆیدایە :ـ
لە گیانکەنشتدایە ، لەسەرەمەرگدایەو خەریکە دەمرێت ۰

لە حەوت ـ لە حەوت ئاسمان ئەستێرەیەکی نییە :ـ
١ ـ ( ناو چەوان رەشو بێ بەختە ) ( ئەستێرەی بەختی ئـاوا
بووە ) ۰ وا دەوترێت کە هەموو یەکێك ئەستێرەیەکی هەیە
کە ژیانی بەو ئەستێرەیەوە بەندەو نیشانەی بەرزیو روناکیو
بەخت روونی‌یە ۰
٢ ـ بێ کەسە ۰
٣ ـ نائومێدە ۰

ـــ لە حەوت ئاسیاو مشتێك ئاردی نییە :ـ
دەست بڵاوە ۰

ـــ له حه‌وت ساڵان راست بۆته‌وه :ـ

١ ـ واتا مردووه ٠

٢ ـ خه‌وی لیٚ که‌وتووه

له خاك ـ له خاك هه‌ڵساگه :ـ

واتا ( له خۆیه‌وه پیٚ گه‌ییوه ) ٠

له ده‌ست ـ له‌ده‌ستکه‌وتووه :ـ

واتا : زۆر ده‌وڵه‌مه‌ند بووه ٠

ـــ له ده‌ستیدا :ـ

به فیرۆی دا ، له ناوی برد ٠

له ده‌م ـ له ده‌می بده :ـ

مه‌هێڵه زۆر قسه بکات ، قسه‌که‌ی ته‌واو بکات ٠ جڵه‌وگیری بکه ٠

له ده‌م ـ له ده‌می خۆی گرته‌وه :ـ

پاشه‌که‌وتی کرد ٠

له دوای ـ له دوای که‌ره‌وه ـ بووه ـ رۆیشتووه :ـ

١ ـ تیٚ نه‌گه‌یشتووه ٠

٢ ـ هیچ نازانێت ، دنیا نه‌دیوه ٠

٣ ـ بیٚ وێڵه ٠

له دووی ـ له دووی سه‌ری ده‌گه‌ڕێت :ـ

١ ـ ده‌یه‌وێت تووشی بکات ٠

٢ ـ ده‌یه‌وێت بیفه‌و تێنێت ٠

لە ڕەت ـ لە ڕەت دەرچووە :ـ

١ ـ لە ژێر ڕکێف دەرچوو ·

٢ ـ لەو هێڵە دەرچوو کە بۆی دانراوە ·

لە ڕەش ـ لە ڕەش ڕەشتر نییە :ـ

واتا : لەمە خراپتر نییە ·

لەڕەشی ـ لە ڕەشی‌ی دەکوژێت :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە لەسەر شتی هیچو پــووچ ملی مەردوم بشکێنێت وەك یەکێك کە هەر تارماییەکی بەدی کرد تفەنگێکی پێوە بنێت ) ·

لە ڕێوی ـ لە ڕێوی‌ی دایك مردوو دەکات :ـ

( بە گیانداری لەڕو تێقوپاو دەوترێت ) ·

لە ڕێ ـ لە ڕێی ڕاستاندا دەکەوێت :ـ

واتا : بۆی نایەت ، کولۆلە :

لەرز ـ لەرزی بۆ بڕی :ـ

تۆقاندی ، ترساندی ، ترس‌و تۆقاندن بەتایبەتی بۆ منداڵ دەبێتە هۆی نەخۆشی · جارانیش یەکێك لەرێگەی چارەکردنی نەخۆشــی دۆعابوو ، دۆعایان بە سەر دەزوویەکدا دەخوێندو پاشان دەیــان بەستە دەستی نەخۆشەکە بۆ لەرز کە لەرزی لێ نەیەت · یان بۆ ئەوەی ئەو کەســە لەرزوتاکەی لەکۆڵ بکەوێت ·

ـــ لەرزی لیٚ هیٚنا :ـ

ترسی نایە بەر، ترساندی ٠

لەژیٚر ـ لەژیٚر بار دەر دەچیٚت :ـ

١ ـ یاخی دەبیٚت ٠

٢ ـ بەرگە ناگریٚت ، وەك چۆن وڵاخیٚکی باری کە بارەکەی گران بوو ، یان چموش بوو لەژیٚر بار دەر دەچیٚت ٠

لەژیٚر ـ لە ژیٚر رکیٚفی کەسدا نییە :ـ

رکیٚف = ئاوزەنگی وڵاخ ٠ واتا لەژیٚر دەسەڵاتی کەسدا نییە ٠

لە سەد ـ لە سەد ـ هەزار ـ حەوت ـ ئاوی داوە قولەپیٚی تەڕ نەبووە :ـ

١ ـ زۆر فیٚڵبازە ، زرنگە

٢ ـ دنیای زۆر دیوە ٠

لەسەر بەردی ڕەق نان پەیدا دەکات :

زۆر بەکارو چابوکە کارکردەیە زیرەکو بە توانایە

لەسەر ـ لەسەر تەولی شەر دەخولیٚتەوە ـ لەسەر حەوت سەرین جیٚی نابیٚتەوە :ـ

واتا : لەتاو ئازار هەندەرانی لەبەر براوە ٠

ـــ لەسەر دەستانە :ـ

بە ئافرەتیٚك دەڵیٚن کە لە منداڵ بووندا بیٚت ٠

ـــ لەسەر دەست ڕای دەگریٚت :ـ

١ ـ ریٚزی زۆر دەگریٚت ٠

٢ ـ نازی دەداتیٚو بەهەنگیەوە دیٚت ٠

ـــ لەسەر رەنگی ئەو دەڕوات :ـ

١ ـ شوێن پێی ئەوی هەڵگرتووە •

٢ ـ بە پیلانی ئەو دەڕوات •

لەسەر ـ لەسەر گوریس ئارد هەڵدەخات :ـ

بێ لێکدانەوە هەڵەتەکاسە دەست دەداتە کار نازانێت کار بەچی بهێنێت •

لە سەگ ـ لەسەگ سواڵ دەکات :ـ

زۆر نەداراو هەژارە •

لە سووژن ـ لە سووژن بێ کەسترە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە کەسی نەبێت یان کەسەکانی خۆی تێ نەگەیەنن •

لەش ـ لەش بەبارە :ـ

هەمیشە نەخۆشە ( بە بایەك ساغو بە بایەك نەخۆشە ) •

ـــ لەش بە دۆشاوە :ـ

بۆ نەخۆشی بێ ورەیە ، زوو هاواری لێ هەڵدەستێتو خۆی هیلاك پیشان دەدات •

ـــ لەشی سووکە :ـ

ئیشکەرو ئازایە •

لەش ـ لەشی گرانە ـ قورسە :ـ

١ ـ سستە ، تەمەڵە لە کاردا •

٢ ـ هەست بە نەخۆشی دەکات ، لەشی داهێنزراوە •

لەقـــە ـ لەقەی لیٚ دا :ـ

بۆ سووکی بە یەکێك دەڵێن کە نەفامانە شتێکی باشی خـــ
دەسکەوتێکی لە دەست بدات ، کەڵك لە هەلێکی باش وەرنەگر

لەقــەلان ـ لە قەلانی کردو لە کۆترانیش :ـ

واتا :ـ لە هەردوولا نائومێدی کرد ٠ لە هەردووکی بێبەش کرد

لە قەڵەم ـ لەقەڵەمی دا :ـ

ژماردی ، دیاری کرد ، ئاشکرای کرد ٠

لە قنگەوە ـ لە قنگەوە ـ کلکەوە ـ لغاوی دەکات :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە کارەکـــەی پاش و پێش بکات ، ناڕاست بـۆ
کارەکە بچێت ، پێچـەوانە کارەکە بـکات واتا : نەشـــــارەزاو
چەواشـەیە ٠

لە قوتوو ـ لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییە :ـ

دەڵێن : ئەوەی تۆ دەیکەیت لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییە ـ واتا :
ئەو کارەی تۆ کەس نایکات و نەبووە ٠ بە یـــەکێك دەڵێن کارێکی
خراپ بکات و جێی ناڕەزایی بێت ٠ عەتاری جاران هەموو بەرەگیاو
داوو دەرمانێکیان لا دەست دەکەوت ٠ هەریـــەکەیان دەخســـــتە
قوتوویەکەوە ، لەسەر یەك هەڵیـــــان دەچنی و بەو شـــێوەیە
دووکانەکەیان دەڕازاندەوە ٠

لەقوڕ ـ لە قوڕ تۆز هەڵناسێت :ـ

( بە یەکێکی ڕژدی چرووك دەڵێن کە هیچی لەدەست نەبێتەوە ) ٠

له قۆڕه ـ له قۆڕەی سکی دەسلەمێتەوە :ـ

زۆر ترسنۆکه ٠

له قُـل ـ له قولوەڵلا ـ قل هو الله ـ ساتمه دەکات ٠

( هیچ خوێندەواری‌ی نییه ) ٠

لـــەق ـ لەقو لۆق :ـ

دەڵێن دانەکانی لەقو لۆقه ٠ واتا : جووڵاونو خەریکن دەکەون ٠

بنکەند بوون ٠ جێگیر نین ٠

لەکـه ـ لەکەی بەر چاوه :ـ

به یەکێك ، به شتێك دەوترێت که بێزرێت ، یان به تەوس ، به

تەشەرەوه دەوترێت ٠

لەکەر ـ له کەری تۆپیو دەگەڕێت ناڵی بکێشێتەوه :ـ

به تەوسەوه.به یەکێك دەڵێن که بۆ ماڵی مفت بگەڕێت ٠

له کەسەوه ـ له کەسەوه دیار نییه :ـ

١ ـ کەس خۆی تێ ناگەیەنێتو به تەنگیەوه نایەت ٠

٢ ـ بەناوبانگ نییەو کەس نایناسێت ٠

له کـەف ـ له کەفو کوڵدایه :ـ

١ ـ گەیشتۆته پۆپه ، سا له هەر رووو بارێکەوه بێت ٠

٢ ـ تووڕه بووەو هەڵچووه ٠

لەکـەل ـ له کەلی شەیتان بێژه خوارەوه :ـ

به یەکێك دەڵێن کەلله رەقی بکات ( لەسەر کارێکی چەوتو چەوێڵ

قینی گرتبێتو بەهیچ جۆرێك نەیەتەوە سەر ڕێی ڕاست ) ۰

لە کۆپان ــ لە کۆپانی خۆی دەخوات .ــ

( لە بەر بێ قازانجی لە سەرمایەی خۆی دەخوات ) بۆ سووکیٚ وا بەو کەسە دەوترێت ۰

لە کۆڵ ــ لە کۆڵی نابێتەوە ــ ناگەڕێت :ــ

١ ــ وازی لێ ناهێنێت ، بەرۆکی بەر نادات ، لیێ دوور ناکەوێتەوە ۰

٢ ــ نەخۆشییەکەی لێ نابێتەوە ۰

لە کون ــ لە کونی هەتیتەدا بێت دەیدۆزێتەوە :ــ

هەتیتە پارچە ئاسنێکە لای زەڕەنگەر کونێکی زۆر وردی تێدایە ، تەلی زێڕو ریوی پێدا رادەکێشن ، بەهێز ، بۆ لووسی‌ی‌و باریکی‌ی تەلەکە ۰ واتا : زۆر وردبین‌و بە تابوشتە ۰

لە کۆهی ــ لە کۆهی ــ کێوی ــ شەنگار بڵندتر چیا هەیە :ــ

واتا : ئەوەی تۆ پێی دەنازیت لەویش گەورەترو دەستدارتر هەیە ۰

لەگەڵ ــ لەگەڵ کلکی خۆی ــ تری خۆی ــ سێبەری خۆی ــ شەڕ دەکات :ــ

١ ــ بە یەکێك دەڵێن کەم چیکڵدانە بێت ، بە گڕو فش بە ئاسماندا بچێت ۰

٢ ــ هەرزەیە ۰

ــــ لەگەڵ مانگدا ــ رۆژدا ــ شەڕ دەکات.:ــ

وەك مانگ ، رۆژ ، جوانەو بگرە لەویش جوانترە ۰

ـــ لەگەڵیدا کێلاویەتی ـ هەمیشە لەگەڵیدا کێلاویەتی :ـ
لەگەڵیدا تەبا نییەو هەمیشە لە بۆرەبناردان ·

لە گرێژەنە ـ لە گرێژەنە چووە :ـ
گرێژەنە ئەو شوێنەیە کە دەرگای جاران تیایدا دەوەستێنراو دەخولایەوە · شوێنەکە کەمێك چاڵ بوو کە زمانەی بنی دەرگاکە لەو چاڵە دەربچوایە دەرگاکە دەکەوت · دەرگاکە لە گرێژەنە دەردەچوو · واتا ئەو شتە شیرازەی تێك چووە ·

لە گوریس ـ لە گوریسی رەش‌و بازوو دەسلەمێتەوە ـ لە خشەی مارو مێروو دەترسێت :ـ
( زۆر ترسنۆکە ) · چونکە لەوەپێش لێی قەوماوەو تووش بووە ·

ـــ لە گوریسی ناو هەمانە بەپێچترە :ـ
( چەوت‌و چەوێڵ‌و بە فڕو فێڵە ) ·

لە گوڵ ـ لە گوڵ پاکترە :ـ
بە یەکێك دەڵێن گوناهێکی درابێتە پاڵ · واتا : بێ تاوانە ، پاکە ·

ـــ لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێم :ـ
( قسەیەکی وای پێ ناڵێم کە دڵی گەرد بگرێت ) ·

لەگون ـ لەگونی گا رووتترە :ـ
بە یەکێك دەڵێن زۆر رەجاڵ‌و رووت بێت ·

لە گوێ ـ لە گوێی گادا نوستووە :ـ
( بە یەکێك دەڵێن کە لە شتێك زۆر بێ ئاگا بێت ) ·

لەگیرفان ـ لە گیرفانی ئەهریمەندا هەڵدەپەڕێت و لە توورەکەی جنۆکـــەدا سەما دەکات :ـ

( بە یەکێکی شەڕەنگێز دەڵێن کە ڕێی خراپەی گرتبێت و بە پارە بۆ ئەم و ئەو خراپە بکات ) ٠

لـە مردن ـ لە مردن گڕ دەخوات ـ مل لە چەقۆ دەسوێت :ـ

١ ـ خۆی دەهاوێتە گێژاوێکەوە کە پڕ مەترسی یە ٠

٢ ـ ناهومێدە بە تەوسیشەوە دەوترێت ٠

لە مل ـ لە ملیان دا :ـ

کوشتیان ، سەریان بڕی ٠

لە من ـ لە منت نەکەوتبێت :ـ

واتا : من بە کەم مەزانەو پشتم پێ ببەستە ٠

لەواشە ـ لەواشە بکرێت باشە :ـ

بۆ سووکی بە یەکێک دەڵێن کە زۆر بڵێت و قسە بێتام بکات ٠ وڵاخی بەرزە لە کاتی ناڵ کردنیدا ، بۆ ئەوەی گاز نەگرێت لەواشەوە دەکرێت واتا : دەمی ببەسترێت باشە ٠

لەوەڕ ـ لەوەڕەکەی پاکژە :ـ

بە تەوسەوە بە یەکێک دەڵێن کە خۆی لە شوێنێک دامەزراندبێت و نیازی ڕۆیشتنی نەبێت و گوێ بە هیچ نەدات ، ماڵی ئەم و ئـەو بخوات و بە مفتی بزانێت ٠

لە ناڵ ـ لە ناڵیش دەدات و لە بزماریش :ـ

( باشیش دەڵێت و خراپیش ) ٠

له ناو ـ له ناو دوو ئاگردایه :ـ له نێوان دوو گاشەی گەورە دایه ، کەوتۆته چورتومەوه ٠

له هەتاو ـ له هەتاو نایخاته بەر سێبەر :ـ
پەله لەکارەکه دەکات ، واتا ناهێڵێت سێبەری بەسەردا بێت کـه جێبەجێی دەکات ٠

له هـەر ـ له هەر لایەکەوه بابێت ئەو شەن دەکات :ـ
( به یەکێك دەوترێت که لەگەڵ هەموو کەسێکدا رێك بـــکەوێت‌و بەرێدا بڕوات‌و بەپێی رۆژ هەڵ بسوورێت ) ٠

له هەزار ـ له هەزار ئاشی کرد :ـ
هەزار باسی هێنایه پێشەوه ٠

له هەموو ـ له هەموو دیزەیەکدا ئەسکوێیه :ـ
دەست دەخاته هەموو کارێکەوەو له هەموو شوێنێکدا بێ ئەوەی کـــەس داوای لێ بکات ٠ بۆ بێزاری‌و تەشەر به یەکیـــکی وەهـا دەوترێت ٠

له هەولێر ـ له هەولێر کۆنتره :ـ
به یەکێك یان شتێك دەوترێت که زۆر بەتەمەن بێت ٠

له هوو ـ له هوویەك موویەك دەکاتەوه :ـ
به یەکێك دەڵێن که زۆر بەکارو دنیاریکەر بێت ٠

له هیچ ـ له هیچ شوێنێك قنگی توێتکه ناخوات :ـ

به یەکێك دەڵێن که ستارەی لەبەر بڕابێت و له هیچ شوێنێك نەوەنده دانەنیشێت ٠

له یەك ـ له یەك پڕن :ـ

رقیان له یەکەو ، له یەك بۆ هەل دەگەڕێن ٠

ـــ له یەك دەخۆنەوە :ـ

لەگەڵ یەکدا لێبوردوون ٠

لـەیل ـ لەیل و مەجنوون ژن بوون یان پیاو !؟٠

به گاڵتەو تەوسەوە به یەکێك دەڵێن کـه له دنیـــا بێ ئاگا بێت و کەودەنانه له قسه تێ هەڵچێت ٠

لـچ ـ لچی داهێشتووە ـ لچی شۆڕ کردۆتەوە ـ لوتی به یەکدا داوە :

١ ـ پەسته ٠

٢ ـ تۆراوە ٠

٣ ـ تووڕە بووە ٠

ـــ لچی لێك ناوە :ـ

نقەی له خۆی بڕیوە ، پەسته ٠

ـــ لچێکی داخستووەو یەکێکی داوە بەخۆیدا :ـ

دڵگیرە ، پەسته ٠ له چیرۆکی ئەفسانەی کورددا دێوی تووڕە ، یان خەنەتبار لچێکی دا دەخات و لچێکی بەخۆیدا دەدات ٠

لنگ ـ لنگی ـ گونی ـ بەسەردا شۆڕ کردۆتەوە :ـ

بە سەریا زاڵە ، سەری پێ شۆڕ کردووە ، دەسەڵاتی بڕیوە .

ـــ لنگی جووت کرد :

لە رووی سووکییەوە دەوترێت واتا : مرد .

لووت ـ لووت لووتی خۆتە هەرچەند چڵمن بێت :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە نەنگ لە خزمی خۆی بگرێت ) .

لووتەلا ـ لووتەلایە :ـ

دڵگیرەو لووتی لێ هەڵکردووە .

لووت ـ لووتی بەرزە ـ لووتی لە عاسمانە ـ لووتی لە کورەکاژاوە،لووتی گۆیژە دەکێلێت :ـ

فیزی زلە ، ( بە دەعیەو دەمارە ) .

ـــ لووتی بە لووتیەوە بوو :ـ

یەکانگیر بوون ، تووشی یەك بوون .

ـــ لووتی بۆ برد :ـ

١ ـ سووسەی کردو ویستی تێی بگات .

٢ ـ بۆنی کرد .

٣ ـ دەستی خستە کاری ئەم و ئەوەوە .

ـــ لوتی بگریت گیانی دەردەچێت :ـ

( زۆر لاوازو زەبوونو تێقوپاوە ) .

— لووتی تیٚ دەژەنیٚت :ـ

١ ـ سووسە دەکات تا لە نهیٚنییەکە ئاگادار بیٚت ٠

٢ ـ دەست دەخاتە کاری ئەمو ئەوەوە ٠

— لووتی دەشکیٚنیٚت :ـ

١ ـ بەرەنگاری دەبیٚتو بەربەستی دەکات ٠

٢ ـ تەریقی دەکاتەوەو لە دەماخی دەدات ٠

٣ ـ دەیبەزیٚنیٚتو لە فیزی دەخات ٠

لووت ـ لووتی رەق بوو :ـ

بە قسەکە پەست بوو ، گرژ بوو دڵگیر بوو ٠

— لووتی لیٚ دەخوریٚت :ـ

حەزی لیٚ دەکات ٠

— لووتی لیٚ خوارە :ـ

١ ـ دڵی لیٚ ساردە ٠ حەزی لیٚ ناکات ٠

٢ ـ لیٚی دڵگیرە ٠

— لووتی ـ لیٚ وەرگێڕا ـ لیٚ هەڵکرد :ـ

١ ـ لیٚی تۆرا ٠

٢ ـ ڕقی لیٚ هەستا ٠

٣ ـ لیٚی دڵگیر بوو ٠

— لووتی هیٚنایەوە بەر خۆی :ـ

لووتی شکاو ملی شۆڕ کردو قایل بوو ٠

— لووت‌و بزووت :ـ

کوت‌و پڕ · دەڵێن ( دوێنی لووت‌و بزووت تووشی فیسار کەس بووم ) واتا : لە ناکاودا وەکو بزوتکێك بنێیت بە سەری لووتمدا ئەناوا تووشی بووم کە چاوەڕێی نەبووم ·

— لووت‌و پووت :ـ

دەڵێن لووت‌و پووتی زۆرە ـ بە لووت‌و پووتە · واتا :
بە بیانووە بە فیزە ( پرت‌و بۆڵی زۆرە ) ·

لۆتر ـ لۆترەوانی دەکات :ـ

١ ـ ( تەڵەکەبازی‌و ساختەو قسەی بێکەڵك‌و سوود دەکات ) ·

٢ ـ ( قسەی هەلەق‌و مەلەق‌و شاش ویش دەکات ) ·

لووس ـ لووس‌و پووس :ـ

دەڵێن : خۆی لووس‌و پووس کردووە · واتا : تاس‌و لووسی خۆی داوەو خۆی جوان کردووە ·

لۆکە ـ لۆکەی لە گوێدایە ـ گوێی خۆی ئاخنیوە :ـ

١ ـ خۆی کەڕ کردووە ، نایەوێت ئەو قسەو باسە ببیسێت ·

٢ ـ بە دەربەسەوە نایەت ·

لێخوڕە ـ لێخوڕە دەشتە :ـ

بە کارێك دەوترێت کە گیرو گرفتی لە رێدا بێت ·

لێرە ـ لێرە نا لە دیری :ـ

واتا : بە تەنگەوە نایەم ، هەر شوێنێك بێت بۆ من یەکە ·

لیره ـ لیرەی ناو قوڕە :ـ

بە یەکێـــکی بەهرەدار دەوترێت کە لێی قەومابێت • بە ئافرەتێکی کارامەو جوان دەوترێت کە هەژار بێت ، واتا : هەر باری ژیانی بگۆڕێت‌و کـەمێك پێشـــکەوێت بەنرخیی بەهـــرەی ، جـــوانی دەردەکەوێت‌و ناو دەکات •

لیس ـ لیـسی خۆی داکوتا :ـ

١ ـ قـسەی خۆی داکوتاوکردی •

٢ ـ خۆی لەو شوێنە دامەزراند •

ـــ لیـسی کوێرانە دەهاوێت :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە بە بێ لێکدانەوە گوناهبارو بێ گوناه وەك یەك تەماشا بکات‌و قـسەیەك بکات چاك‌و خراپ بگرێتەوە •

لێـو ـ لێوە لەرەیەتی :ـ

دەترسێت •

ـــ لێوبەبارە :ـ

کۆستی کەوتووە • خەفەتبارە •

ـــ لێو بە دان نازانێت :ـ

( کارەکە زۆر بە تەبێنی‌یە ) •

لێـو ـ لێو لەسەر دانە :ـ

( هاریك و دۆستان‌و ـ کەس ـ کەم‌و کوورێت دادەپۆشێت ) •

— لێوی خۆی گەست :ـ

لێ گەیشت‌و هەستی بە کارەکە کرد،وریابووەوە ٠

— لێوی لە لێوی نەناوە ـ لە بزی لە لەبزی نەگەڕاوە :ـ

لەگەڵی نەدوواوە ، نەیدیوە ٠

— لێوی هەڵ نەپچڕی :ـ

نەهاتە زمان‌و نقەی لە خۆی بڕی ٠

— لێوێکی با دێنێ‌و یەکێکی بۆران :ـ

( بە مەردومی توورەو تڕو دەوترێت ) ٠

— لێوی لێ نەداوە :ـ

نەیخواردووە ، نەیخواردۆتەوە ٠

لێی ـ لێی ئالاوە ـ لێوەی ئالاوە :ـ

١ ـ لێی ورووژاوە ٠

٢ ـ دەست دامێنیەتی ٠

— لێی بووە بە کوردە نامووسی :ـ

پێی شەرمە ، بە نەنگی دەزانێت ئەو کارە نەکات ، یاریدەی نەدات ،

بەدەنگیەوە نەچێت ٠

لێی ـ لێی بووە بە کوڵی شێر ـ لێی چۆتە کوڵی شێر :ـ

کارەکەی زۆر لاگران‌و ترسناك بووە ٠ وەك ئەوە وایە داوای لێ

بکەن سواری پشتی شێر بێت ٠

— لێی چۆتە دارێ نایەتە خوارێ :ـ

بە یەکێك دەڵێن لایەنی کەللەرەقی‌ی کرتبێت ، بیانووی گـــەورە گەورە بگرێت‌و نەرم نەبێت ( بە یەکێك دەوترێت کە هەرگیز لەو قسەیەی کردوویەتی پەشیمان نەبێتەوە ) ٠

— لێی چۆتە کەشکەلانی فەلەك ـ لێی چوتە عاسمان :ـ

کەشکەلان = شوێنی زۆر بەرز کە دەست نایگاتێ ٠ لێی چۆتـە بەرزترین شوێنی فەلەك ٠ واتا : کەللە رەقی لەگەڵدا دەکات بەقیندا کەوتووە ٠

— لێی ـ دەرهێنا ـ دەرکێشا :ـ

زمانی ، نهێنییەکەی پێ ئاشکرا کرد ٠

— لێی کەوتە ئەقە :ـ

تەشەرو توانجی تێ‌دەگرێت ٠

— لێی ناکەوێت :ـ

لێی نایەت ، لەگەڵیدا ناگونجێت ٠

لێی ـ لێی هەڵپێچاوە :ـ

شەڕی پێ دەفرۆشێت ، بیانووی پێ دەگـــرێت ٠ هێناویەتیـە گیروگاز ٠

ماخۆلان ـ ماخۆلانیەتی :ـ

بە یەکێکی بزێو دەڵێن کە جێ بە خۆی نەگرێت‌و سەرەوت‌و هەنەرانی لەبەر بڕابێت ٠

ماچ ـ ماچ‌و مووچ :ـ

دەڵێن کەوتنە ماچ‌و مووچ ٠ واتا : کەوتنە ماچ‌کردن‌و مژینی یەك ٠

مارانگاز ـ مارانگازە :ـ مارانگاز ـ لە گوریسی رەشبازوو ـ لەخشەی مارو مێروو سڵ دەکاتەوە ـ دەترسێت٠٠ بە یەکێك دەڵێن کە لە ژیاندا بە پارێز بێت‌و هەمیشە سڵ بکاتەوە ، ئەوەش دیارە لە ئەنجامی بەسەرهاتی ژیاندایە ٠ مارانگازە : واتا چاوترسێن بووە بەوەی کە لەوەپێش مار گەستوویەتی ، پێوەی داوە ٠

مار ـ ماری بێ ئیجازەیە :ـ

بە یەکێکی وەزنددار دەڵێن کە ناپاك بێت‌و متمانەی پێ نەکرێت ٠

ـــ ماری رەش ئێقی بۆ دەکاتەوە :ـ

زۆر هەژارە ٠ واتا : هێندە شایستەی میهرەبانی‌و بەزەیی پیاهاتنەوەو دەستگرۆیی‌یە تەنانەت ماریش بەزەیی پێدا دێتەوە ٠

مار ـ ماری سکی خۆی دەخوات :ـ

( بە یەکێکی دەروون پیسی بوغز لە سکی ڤین ئەستوور دەوترێت ) ٠

— ماری مار خۆرە :ـ

لە هەموان زەهەندە ترەو کەس پێی ناوێرێت ·

— ماری مردوو دەخاتە بەر ـ پای ـ پێی :ـ

واتا : دەیترسێنێت ·

مازوو ـ مازوو بەرەڵایە :ـ

مازوو بەرەڵا : کاتێکە لە دوای بەهار مازووی تێدا بەرەڵا دەکرێت‌و هەموو کەس دەتوانێت بێ ترس‌و پرس بۆ مازوو چنین بچێت واتا : بەرەڵایی‌یەو بێ سەرو بەرگری‌یە لە شتدا دەڵێن کە چووم باخەکە مازوو بەرەڵا ، هەر کەس بۆ خۆی بوو ·

— مازووی ناو تەبەقە : ـ

بە منداڵێکی زۆر بزێو دەوترێت کە هیچ سرەوتی نەبێت ·

ماست ـ ماست نییە بە لێویەوە دیار بێت :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە هیچی لەبەرچاو نەبێت ، حاشا لە هەموو شتێك بکات ·

ماستاو ـ ماستاو دەکات ـ ماستاو سارد دەکاتەوە :ـ

مەرایی دەکات ، لە بەریدا دەپاڵێوێت ، خۆی تێ هەڵدەسوێت تا کەڵکێکی لێ ببینێت ·

ماسی ـ ماسی‌ی بێ کێردە :ـ

( واتا : هیچ جۆرە ئەرك‌و بێکارێکی بەسەرەوە نییە ) ·

— ماسی دەریا دەبەخشێت :ـ

( بە یەکێك دەوترێت خاوەنی شتێك نەبێت‌و بیبەخشێت ) ٠

ماش ـ ماش‌و برنجە :ـ

واتا رەش‌و سپی‌یە ٠ ماش رەشەو برنجیش سپی ٠

ماکەر ـ ماکەر مەلەی بۆ دەکات :ـ

بە گاڵتە پێ‌کردن‌و رقەوە دەوترێت واتا : خـــۆی بۆ دەکـوتێت ( مەرایی بۆ دەکات ) ٠

— ماکەرو جاشێك بەرقلیانیەتی :ـ

بە تەوس‌و گاڵتە پێ‌کردنەوە بە یەکێکی زۆر خۆر دەڵێن ٠

مـاڵ ـ ماڵ ئاوایی لە دنیا کرد :ـ

واتا : مـــرد ٠

— ماڵ نەبو ـ ماڵ لە خۆیدا نەبو ـ میوانیش رووی تێ کرد :

( لە کاتێکدا بە کەسێك دەوترێت کە کەم‌دەست‌و نەدارا بێت کەچی سەربارەی ئەوەش بارێکی تری بەسەردا بتلێتەوە ) ٠ خۆی تەنی ناتەواو بێت‌و دەردێکی تریش بگرێت ٠

— ماڵی ـ بایە ـ ئاوە :ـ

بە شتێك دەڵێن بە هەوانتە دەست کەوتبێت‌و بە هەوانتەش بڕوات٠

— ماڵی بە قوڕ گرت :ـ

تووشی زیانێکی گەورە ، گاشەیەکی گەورەی کرد ٠

— ماڵی چووه سەر بەشی ماڵان :ـ

واتا : مردو میراتگر ماڵەکەی بەش کرد ٠

— ماڵی خۆنەخۆرە :ـ

بەشتێك دەوترێت کە هی چرووکێك بێت دڵی نەیەت خۆی بیخوات ، کاریٚ بکات ، یەکێکی تر لرفی لیٚ بدات ٠

ماڵی ـ ماڵی میران بەگی جافە :ـ

بە یەکێك وا دەوترێت کە شت زۆر کار بکاتو لە ماڵدا دەست بە قرپ بێت ، دەستگرتنەوە نەزانێت ٠ واتا دەست بگرەوە ، دڵت بە ماڵەکە بسووتێت ٠ میران بەگ سەروکێکی گەورەی خێڵی جاف بووە ٠ نانبدەو خاوەن دیوەخانێکی گەورە بووە ٠

— ماڵی وا بە کۆڵیەوە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کەجێگاو ڕێگایەك ـ لانەیەك ـ ی نەبێتو هەر شەوە لە شوێنێك بێت ) ٠

— ماڵی وێران بووە :ـ

١ ـ زیانێکی گەورەی لیٚ کەوتووە ٠

٢ ـ کۆستێکی گەورەی کەوتووە ٠

٣ ـ نابووت بووە ٠

مام ـ مامە خەمەیە :ـ

١ ـ هاوڕێی تەنگانەیەو هەمیشە مشوورو خەمی خەڵك دەخوات٠

٢ ـ بە یەکێك دەوترێت بە هەموو شتێك خەفەت بخوات ٠

— ماڵی چووە سەر بەشی ماڵان :ـ

واتا : مردو میراتگر ماڵەکەی بەش کرد ٠

— ماڵی خۆنەخۆرە :ـ

بەشتێك دەوترێت کە هی چرووکێك بێت دڵی نەیەت خۆی بیخوات ، کاریٚ بکات ، یەکێکی تر لرفی لیٚ بدات ٠

ماڵی ـ ماڵی میران بەگی جافە :ـ

بە یەکێك وا دەوترێت کە شت زۆر کار بکاتو لە ماڵدا دەست بە قرپ بێت ، دەستگرتنەوە نەزانێت ٠ واتا دەست بگرەوە ، دڵت بە ماڵەکە بسووتێت ٠ میران بەگ سەروکێکی گەورەی خێڵی جاف بووە ٠ نانبدەو خاوەن دیوەخانێکی گەورە بووە ٠

— ماڵی وا بە کۆڵیەوە :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کەجێگاو رێگایەك ـ لانەیەك ـ ی نەبێتو هەر شەوە لە شوێنێك بێت ) ٠

— ماڵی وێران بووە :ـ

١ ـ زیانێکی گەورەی لیٚ کەوتووە ٠

٢ ـ کۆستێکی گەورەی کەوتووە ٠

٣ ـ نابووت بووە ٠

مام ـ مامە خەمەیە :ـ

١ ـ هاوڕێی تەنگانەیەو هەمیشە مشوورو خەمی خەڵك دەخوات٠

٢ ـ بە یەکێك دەوترێت بە هەموو شتێك خەفەت بخوات ٠

مانگ ـ مانگ دیارەو حەوەجەی بە ئەموست نییە :ـ

کارەکە ئاشکرایە پێویستی بە روونکردنەوە نییە ٠

مانگە شەو ـ مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە :ـ

( هەموو شتێك لەسەرەتاوە باش‌و خراپی‌ی دیارە ) ٠

مانگ ـ مانگی شەرمێیەتی :ـ

واتا یەکەم مانگی شوو کردنیەتی بە یەکێك دەڵێن کە شەرم بکات‌و شەرمەکەی لە جێی خۆیدا نەبێت ٠

مانگا ـ مانگا بەکەڵە :ـ

بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە هەمیشە خەڵکی بە دواوە بێت ٠

ـــ مانگا دۆشین‌و قەزوان کورۆشتن ـ قرتاندن ـ یان نەووتوە :ـ

بە یەکێك دەوترێت کە لەگەڵ کارێکی گـــراندا بە کارێکی ترەوە خەریك بێت ٠

ـــ مانگا مردو برا دۆ برا :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە گەورەیەکی بە کەڵکی لەدەست چووبێت ) ٠

سەرچاوەی خێرو کەڵکی ، خۆشی‌ی وشك بووبێت ، برابێت ٠

مـــای ـ مای دۆکولێومان هێنایەوە ! :ـ

( مای هێنانەوەی دۆکولێو بە تێکدان‌و جووڵاندنی مـاســـتاوەکەیە لەسەر ئاگر یەك بینە تا دێتە کوڵ ٠ ئینجا ئەم رستەیە بە کەسێك دەوترێت کە کارێك بکات پێچەوانەی خواستی تۆبێت‌و تۆ چۆنت دەوێت ئەو وا نەکات ) ٠

یان خۆی کردبێت بە وەستای هەرشتێك هەرکارێك‌و هیچی لیٚ نەزانێت ٠

مــەل ـ مەلی گۆشتخۆرە :ـ

مرۆڤێکە هەڵدەگرێت خزمەتی بکەیت‌و ڕێزی تەواوی لیٚ بنێیت ٠

مەیکوتە ـ مەیکوتە جەوتە :ـ

( بۆ ئەوس بە کەسێك دەڵێن کە بە هیوایەك دوای شتێك بکەوێت‌و هیواکەشی لە جێی خۆیدا نەبێت ) ٠

مچــە ـ مچەی حەبێ کشمیشە ـ دەڵێی مچەی حەبێ کشمیشە :ـ

واتا : وەکو ئەو ژنانی‌یە ٠ مچە = پیاوێك بوو نێرەمووك جلی ژنانەی لەبەر دەکرد ، ئەتواری ئافرەتی هەبوو ، لەگەڵ ژنانیشدا تێکەڵ دەبوو ، کە بە ڕێگەدا دەڕۆیشت بە لەنجە دەڕۆیشت‌و خۆی بـا دەدا ، لە سلێمانیشدا دەژیا ئەمە بە یەکێك دەڵێن کە ژنانی بێت ٠

مڕەمڕ ـ مڕەمڕی سەر لاکە :ـ

بۆ سووکی بە هەرایەك دەوترێت کە لەسەر کەڵك‌و تەماعێـــك هەڵگیرسابێت ٠ دیارە دڕندە ، سەگ مڕە دەکات ٠

مرخ ـ مرخی لیٚ خۆش کردووە :ـ

زۆر تامەزرۆی دەستکەوتیەتی ، جاوی تێ بڕیوە خۆی بۆ ناوەتەوەو بە تەمایەتی

مردن ـ مردنی لەبەر چاوە :ـ

١ ـ مەردومێکی موسوڵمانەو لە خواترسە ٠

٢ ـ دەزانێت دەمرێت لەگەڵ ئەوەشدا وازناهێنێت‌و سووره لەسەر کارەکە ٠

مردن ـ مردن هەر جارێکە :ـ

واتا : ( نابێت سەرشۆڕی قبوڵ بکات ) یاپترسێت ٠

مردوو ـ مردوو لەمە پاکتر ناشۆرێت :ـ

( بە هەڵێك دەوترێت کە هەڵکەوتبێت ٠ واتا : هەلی چاکەو لەدەستی مەدە ) ٠

ـــ مردووی بەشی زنیدووخۆرە :ـ

بە یەکێك دەوترێت کە بێ کەڵك بێت ، بە هۆی نەخۆشییەوە بە هۆی پیرییەوە ٠ یان بێکارەو دەستەوسان بێت ٠

مس ـ مس کراوەتە گوێی ـ دەڵێی ـ مس کراوەتە گوێی :ـ

بە کەسێك دەڵێن خۆی کەڕ بکات‌و نەیەوێت هیچ ببیسێت ٠

مشت ـ مشتی داوە بە درەوشدا :ـ

( بە یەکێك دەڵێن کە بەگژ ئیشێکی گەورەدا چووبێت‌و زیانی لێوە تووش بووبێت ) ٠

مشت ـ مشت‌و ماڵ :ـ

دەڵێن ئەو خەنجەرەم بۆ مشت‌و ماڵ بکە واتا : بۆم زاخاو بەدەرەوەو جوانی بکە ٠

ـــ مشت‌و مڕ :ـ

دەڵێن ئەو مشت‌و مڕەیان لەسەر چییە ٠

مشت = کۆڵە مشتەیە . مڕ = لێمڕاندن‌و خۆ لێ خواردنەوەو قسە پێ وتنە . واتا : ئەو قسە بەیەك وتنەو مشت هاویشتنەیان لە چی‌یە .

مشك ـ مشك لە ماڵیا سەفرا داوەیەتە سەری = مشکی کوێر لە ماڵیدا ناشتا ناکات :ـ

( زۆر رژدو چرووکە ، هەرچی خواردن بێت لە ماڵیدا نییە ) .

مل ـ مل پانە ـ ملهووڕە :ـ

بە تەوس‌و گاڵتە پێ کردنەوە بە یەکێك دەوترێت کە بۆ هەموو شتێك، هەموو کەسێك سەر شۆڕ بکات ، قایلی هەموو نەنگیِ‌و نزمییەك بێت .

ـ مل کەچە :ـ

١ ـ لارەملە ، خەفەتبارە .

٢ ـ ناهومێدە . .

٣ ـ شەرمەزارە .

٤ ـ باری کەوتووە .

٥ ـ ناچارە .

ـ ملی بە نۆ تەور نابڕێتەوە :ـ

بۆ تەوس‌و ڕقە بە یەکێك دەوترێت کە بیەوێت لە سەر ورگی ئەم‌و ئەو بژی ، بلەوەڕێت ، تەمەڵی بکات .

مل ـ ملی ـ دا ـ شۆڕ کرد :ـ

١ ـ قایل بوو ، شل بوو ، ڕێکەوت .

٢ ـ بەزی هاتە ژێر بار .
خۆی بەدەستەوە دا :ـ

مـل ـ مل‌و مووش :ـ
دەڵێن ئەو چڵێســە کەوتۆتە مل‌و مووش . مل = مر = تێر . مووش = بەدوای خواردندا مووشە کردن . واتا : بۆ خۆ تێر کردن کەوتۆتە مووشە کردن‌و سۆراخ .

ملۆزم ـ ملۆزمە :ـ
ملۆزم دێوێکی زۆردارە ، شەڕانییە واتا = وەك دێوێکی زۆردارە ، کە لە خەڵکەوە ئاڵا لێی نابێتەوە تا جەزرەبەی نەگەیەنێتێ .

من ـ من هەمەو تەختەیەك دەوار × شەڕی پێ دەکەم لەگەڵ هەزار سوار :ـ
یەکێك ئەوە دەڵێت کە شتێکی هەبێت‌و بەتەما بێت گەلێك کاری پێ ئەنجام بهێنێت . ئەمـــەش ئەوپەڕی ئازایەتی‌و نەریتی ژیانی کوردەواری‌و پلەی بڕوا بە خۆ بوونی دەردەخات .

مـوو ـ موو بە بەینیاندا ناچێت :ـ
زۆر تەباو ڕێکن ، پێکەوە گونجاون‌و یەکتریان خۆش دەوێت .

ـــ موو دەقڵێشێت : ـ
( بە یەکێکی زۆر دانا دەوترێت کە هەموو شتێك لێك جیا بکاتەوە ) .

ـــ مووی راست بووەوە ـ مووی سەری ڕەپ بوو ـ دەماری لەشی هەستا :ـ
واتا : تووڕە بوو .

— موو ماست لێك دەكاتەوە جیا ـ دەكاتەوە زۆر وردو كـــارامەو بەهرەدارو بەدەســەڵاتە ٠

— موویەك لە بەراز بێتەوە هەر باشە :ـ
( بە چروكێكی پیسكە دەوترێت كە شتێكی لێ بســەنرێت ) ٠

مۆرە ـ مۆرەی بەسەر چوو :ـ
( بە یەكێك ، شتێك دەڵێن كە باوی نەمابێت ) واتا كاتی دەركەوتن و نواندنی تێپەڕیوە ٠

مووڕەغە ـ مووڕەغەی پشتی شكا :ـ
١ ـ كۆستێكی گەورەی كەوت ٠
٢ ـ ماڵ وێران بوو ٠

مۆخ ـ مۆخی بە ئاو كرد ـ مۆخی دەر هێنا :ـ
١ ـ پەرێشانی كرد ٠
٢ ـ تووشی زیانی مادیو مەعنەوی كرد ٠
٣ ـ زۆر ماندووی كرد ٠

میچ ـ میچی قومارخانەیە ـ دەڵێی میچی قومارخانەیە :ـ
١ ـ بە یەكێك دەڵێن كە زۆر حەز لە قومار بكاتو شـــەوو ڕۆژ خەریكی بێت ٠
٢ ـ ( بە یەكێكی فێڵبازی چوختی دەوترێت ) ٠

مێخ ـ مێخی دوو ماجە بە زەویدا ناچێت :ـ
( بە تكایەك دەوترێت كە دوو بێ پەلی لێ بێتەوە هەر پەلەی تكایەكی

لیٚ بێتەوە ) ٠

میز ـ میزی کەف ناگرێت : ـ
( واتا : ئەو کارەی بە تەمایت زوو بـوٚت بـکات ، بوٚت ناکات ) ٠
دەسـتو بردی لیٚ ناکات ٠

مێش ـ مێش دەقەپێنێتەوە :ـ
بوٚ گاڵتە ( بە یەکێك دەوترێت کە بیٚ ئیش دانیشـێت ) ٠

ــ مێش لە دەمی خوٚی دەرناکات :ـ
بەستەزمانو بیٚ دەسەڵاتە ، بوودەڵەیە ٠

ــ مێشی لیٚ بوٚتە گامێش :ـ
( بەسەر لیٚ شێواوێك دەڵێن کە شتێکی زوٚر کەمی لا زوٚر گەورە بێت ) ٠

مێش ـ مێشیشی میوان نابێت :ـ
١ ـ ( گوێ ناداتە قـــەو ئاموٚژگاریی کـــەسو بە دەربەسەوە نایەت ) ٠
٢ ـ بیٚ باڵو چاو نەترسە سڵ ناکاتەوە ٠

ــ مێشێکی پیٚ دەرناکرێت :ـ
بیٚ دەسەڵاتە ، بوودەڵەیە ٠

مێشك ـ مێشکی کەری خواردووە :ـ
بە تەوسو گاڵتە پیٚ کردنەوە بە کەسێك دەوترێت کە درەنگ لـــە قـــە بگات ٠ واتا : بیٚ مێشکە ٠

میوان ـ میوانی بایەنجانی :ـ

کەسێك لە مەجلیسێکدا رووی نەدرێتی ، یان بانگ نەکـــرابێت ، لە خۆیەوە چووبێت دەڵێن ئەوە بۆچی وا گرژ بوون خۆ ئێمە میوانی بایەنجانی نین .

میـوە ـ میوەی نەگەییوە ، تاڵە :ـ

بە کوڕێك یان کچێك دەوترێت کە وەختی ژن هێنان یا شووکردنیان نەهاتبێت .

# ن

ناخوون ـ ناخوون ـ نینۆك ـ چنگ ـ ی لیٰ گیر نابێت :ـ

دەستگیری نابێت ، ناکەوێتە بەر دەستی ٠

ناخوونەك ـ ناخوونەکخۆرە : ـ

( بەوە دەڵێن دەنکە دەنکە لە شتێك بخۆیت بە بیٰ کڕین یان بیٰ ئەوەی راستەوراست دانیشیت شتەکە بخۆیت ) ٠

نادر ـ نادر شلی کوتەکە ٠

مامۆستا مەلا مستەفای سەفوەت لە ( شانۆی ناومالٌ) دا لە لاپەڕە ٨٦/٨٧ دا دەڵێت : کابرایەکی میٰبازی ـ بیٰنابڕوو ـ دەبێت ناوی نادر دەبێت دەست بۆ ئافرەتان دەبات ، کوڕە کوڕەی سلێمانیش تیٰ دەیکوتن و لە قوڕاوێکدا لە قەراغ شار بیٰ جووڵە رایدەکێشن بەهار دەبێت ژنان بەبەرگی ئالٌو والاٌوە بە بەردەمیدا تیٰدەپەڕن ، گاڵتەی پیٰ دەکەن ئەویش دەڵێت : نادر شلی کوتەکە ئەگینا با ئێوە ئەتاوا بە بەردەمی مندا بڕۆیشتنایە ٠ ئەمە بە تەوس و گاڵتە پیٰ کردنەوە بە یەکێك دەڵێن کە تەمیٰ و چاوترسێن کرابێت و نەوێرێت لە هەلوێستێکدا دەست ببزوێت ، یان بەرامبەر بە یەکێك چاو بەرزکاتەوە ٠

نار ـ ناری ـ نالٌی عەلی ـ بە هەزار نالٌی ـ ناری عەلی :ـ

دەڵێن بە هەزار نالٌی ـ ناری ـ عەلی تا دۆزیمەوە ، ئینجا دۆزیمەوە واتا ( بە رەنج و ماندوو بوونێکی زۆر ) ٠ ئەشیٰ بالٌی عەلی بانگ کردنی

حەزرەتی عەلی بێت بۆ دۆزینەوەی ئەو شتەو بە فریاوە هاتنی ئەو کەسە ٠

نازانم ـ نازانم رەحەتیی گیانم :ـ

واتا : پیاو کە شتێك ، وەڵاكێك نەزانێت خۆی لێ دوورخاتەوە سەری سووکو دڵ پڕ لە ئارام ٠ یان بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە خۆی لە کارێك دوورخاتەوەو تەمەڵی بکات ، یان بە دەربەسەوە نەیەت ٠

ناز ـ نازوو جیاز :ـ

دەڵێن منداڵەکە بە نازو جیازی دایکی گەورە بێت واتا : لە کۆشـــی میهرەبانیو تێرو تەسەلیدا گەورە بێت ٠

ناز ـ نازو نووز :ـ

دەڵێن کەوتۆتە نازو نووز ٠ واتا شۆخی دەکاتو بەمەکـــر بۆیشی دەنووزێنێت ، خۆی بە مەکر دەفرۆشێت ٠

ـــ نازو نیاز :ـ

نازی هەیەو نیازی بەو نازەوە هەیە ٠

ناشتا ـ ناشتای نەکردووە :ـ

دەستی لێ گیر نەبووە ، دەستی نەکەوتووە ٠

نافەك ـ نافەکی دەبڕێت :ـ

جاران ئەتکی پیاوێکیان بکردایە نافەکیان دەبڕی ، بـــەوە لەشی دەردەکەوت ، عەورەتی دەردەکەوت ، کە ئەوەش جێی شەرمەزاری

و ئابڕو چوون بوو • واتا : ئەتکی دەکات ، سووکی دەکات ، خراپی پێ دەکات •

نافەك ــ نافەك شۆڕە :ــ
بە گاڵتەو تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە خۆی بە شتێکی زۆر تەواو دابنێتو خۆی وا بنوێنێت •

ــ نافەکت جوانە !! :ــ
بە تەوسو گاڵتە پێکردنەوە بە یەکێك دەڵێن کە فشو هووڕ زۆر بکات ، یان هەوڵی شتی گەورە بداتو لەوەپێش تێ شکابێتو شتی خراپی بەسەر هاتبێت واتا : رابوردووت دەری دەخات کە هیچت لە باردا نییەو بەدەردی خۆتەوە دانیشەو بۆ تۆ نابێت •

نان ــ نانخۆری سفرە دڕە ــ نمەك دەخواو نمەکدان دەدڕێت : واتا ( سپڵەو پێ نەزانە ) •

ــ نانو پیازی پێوە دەخوات :ــ
بەو بوختانە ، بەو قسانەی دەیگێڕێتەوە ، دەیەوێت کەڵکێکی مادی یان مەعنەوی پێ دەستگیر بێتو لایەکیشی پێ تووش بێت •

ــ نانو پیازی لەگەڵ نەخواردووە :ــ
واتا : نایناسێت ، دۆستایەتی لەگەڵدا نییە •

نان ــ نانو تف دەخوات :ــ
رژدو چرووکە •

— نان‌و دۆی بڕی :ـ

ڕۆژیی بڕی‌و لە کارەکەی دەری پەڕاند · هەژاری کرد ·

— نان‌و نمەك دەتگرێت :ـ

واتا سپلّە مەبە بێ‌وەفایی‌و ناپاکی لەگەڵدا مەکـە · چاکـــەی بەسەرتەوەیە ،ئەگینا خودا تووشی گاشەیەکت دەکات ·

— نان‌و نمەکیان بە یەکەوە خواردووە ـ نان‌و نمەکی یەکیان کردووە:ـ

( هەقیان بەسـەر یەکەوە هەیە ) ·

— نانی بە ئاو ناکات ـ نابێت ·

هەمیشە ڕەنجەڕۆو هەژارە ، دەست بڵاوە ، زوو زوو تووشـی گاشە دەبیت ·

— نانی بۆ دەخاتە شۆرباوە :ـ

( واتا دەستگیرۆیی دەکات ) ·

— نانی بێ خوێ دەخوات‌و تری سوێر دەکەنێت ( بە یەکێك دەوترێت کە زۆر لات بێت ، بەڵام قـــەی زل بێت ) · واتـا تڕ زلی باوان دەروێش بێت ·

نان ـ نانی پێژیاگە :

واتا : ( نانبڕاو بووە ) ·

— نانی دڕاو پینە دەکات :ـ

( بە یەکێکی زۆر ورياو دانا دەڵێن کە چارەسەری هەموو شتێکی پێ بکرێت ) ·

ـــ نانی شوانی خواردووه : ـ

هەر ئاژەڵێك نانی شوانەکەی بخوات دەبێت بەر لیس‌و گۆچانی شوان بکەوێت • ئەمە بە کەسێك دەوترێت کە دژی یەکێکی لە خۆی بە دەسەڵاتتر بوەستێتەوەو کار بکات • واتا : خۆی تووشی زیان‌و دەردیسەری ، کارەسات دەکات •

ـــ نانی کەوتوتە ڕۆنەوە :ـ

کارەکەی لە برەودایە ، کەوتۆتە خۆشییەوە بە مـــل قازانج‌و خۆشیدا ؛ دەستگیریی زۆردا کەوتووە •

ـــ نانی نییەو بە ئاو کوڵاوە :ـ

هەژارو نەدارایە •

نان ـ نانی نییەو چاو دەڕێژێت :ـ

بە یەکێکی لاف دەوترێت کە ڕووی کردبێتە ڕابواردن‌و لاســـایی دەستەیەك بکاتەوە کە زۆر لە خۆی باڵاتربن‌و دەستدارتر بن •

ـــ نانی نانـی‌یە :

١ ـ ( بە یەکێك دەڵێن کە نان بە نان بدات ) واتا : بە تەمای کەڵکێك نەبێت کەڵك نەگەیەنێت •

٢ ـ ( کوێرنانە ) واتا نانبدە نییە •

ـــ نانی ها ـ وا ـ لە دۆڵەی ئەودا :ـ

واتا :ـ ( نانی ئەم وا لەسەر کەوڵی نانخواردنی ئەو ، نانی ئەم بە هۆی ئەوەوەیە ) •

— نانیان ها ـ وا ـ له دولێكدا :ـ
واتا : نانیان پێكەوەیەو لە ڕەنجو بەرهەمدا هاو بەشن ·

— نانی هاریی بەدەمەوە گرتووە :ـ
بە كەسێك دەڵێن زۆر بزێو چەتوون بێت ، ( چاوی سوور بو
یاخی بووە )

— نانێكی بەو ڕۆنەوە خواردووە :ـ
( بە یەكێك دەڵێن كە كەڵكێكی لە شتێك ، لە شوێنێك وەرگرتبێت و
بە دوای ئەو كەڵكەدا ، ئەو شوێنەدا بچێتەوە ، بە تەمای كەڵكی تر
بێت ) ·

ناو ـ ناوی بە قوڕدا بچێت :ـ
واتا : ناوی كوێر بێتەوە ·

— ناوی بە گەرووی ـ كوورەگەی ئاشدا بچێت :ـ
( كوورەگە = نێی ئاشە · بە یەكێك دەوترێت كە حەزت لێی
نەبێت و نەتەوێت ناویشی بهێنیت ) ·

— ناوی بهێنن ـ ناوی لێ بنێن :ـ
واتا : بچنە خوازبێنیی ئەو ئافرەتە ، دیاریی بكەن ·

— ناوی خۆی بیستۆتەوە :ـ
بە كەسێك دەڵێن كە لە خۆی گۆڕابێت ، فیزی پەیدا كردبێت ·

— ناوی ژنی لا هێنا :ـ
دای بە گوێیدا كە ژن بهێنێت ·

ــــ ناوی گەورەو دێ وێران :ــ

واتا : هەر بە ناو زلە ، تەواوە ، ئەگینا پووچە .

نــاو ـ ناوی لە کولەکەی تەرپێشدا نەبوو

١ ـ کەس ناوی نەدەهێنا .

٢ ـ هێشتا نەهاتبوە ژیانەوە .

٣ ـ هەردیاریش نەبوو .

ــــ ناوی لە ناو ناواندایە :ــ

١ ـ بەشداری ئەو کارەیە .

٢ ـ ناوی دەرکردووە ، سا بە چاك بێت یان بە خراپ .

ــــ ناوی هەیەو ناوکی نییە :ــ

١ ـ ( ناوی هەیەو کرداری نییە ) .

٢ ـ شتێکی بێ بەهایە .

ناوچەوان ـ ناوچەوان بەردە بۆتــە :ــ

بە یەکێـك دەڵێن کــە بێ شــانـسو بەدبەخت بێت بۆ تەوسو تەشـەپێی دەڵێن .

ناوسـك ـ ناوسکی ڕەش بۆتەوە :ــ

خەفەتێکی زۆری خواردووە ، سـزایەکی زۆری دیوە .

ناوشان ـ ناوشـانی پانە :ــ

١ ـ بۆ تەوس دەوترێت . واتا : هەڵ دەگرێت وای لێ بێت .

٢ ـ بار هەڵگرو بەکێشـەو نۆکەریی ئەمو ئەوی پێ خۆشـە .

ناوك ـ ناوكو دڵی خست :ـ

ناوكو دڵ كەوتن :ـ لە ناو كوردەواریدا وا باوە كـــە ناوكو دەكەوێت ، سا یا لە خورپەوە ، یا لە هەڵگرتنی شتی قورسەو لە بازدان یا لە ترسەوە ناوك دەكەوێت دڵیش لە خـــور ترسەوە ٠ بە گەلێك شێوە ناوك دەگرنەوە ٠ یەكەم دەست دە سەر ناوكەكەو دەستی پیا دەنێن خوێنبەرێك لەوێدایە دەیگر بەری دەدەن ٠ دووەم تۆپەڵە پەڕۆیەك دەخەنە سەر ناوكەكەو لێی توند دەكەن ٠ سێیەم بە باڵ ڕاتەكاندن.چوارەم ، ئەو كەسە بە شتێكی بەرزەوە خۆی شۆڕ دەكاتەوەو تەكان دەداتە خۆیو قاچی را دەتەكێنێت ٠ پێنجەم بەسەرمەوقولات سێ سەرمەو قولات دەداتو پاشان لەسەر چیچكان دادەنیشێت تا قاچی سڕ دەبێت ٠ بەڵام دڵ گۆزەوانەیەك یا شتێكی قورس دەخەنە ســـەر ناوك تا دەمارەكە دەكەوێتە فڕەفڕ سێ جار وای لێ دەكرێت بەوە دڵەكـە دێتەوە ٠ واتا : ترساندی ، دەیشوترێت ناوكی گـــرتەوە ٠ بە تەوسەوە دەوترێت واتا : ناوكی خســـت ، بەوەی هەواڵێـــكی ناخۆشی دایە ، تووشی زیانێكی قورسی كرد ، ترساندی سا هــــەر جۆرە ترسێك بێت ٠

ناوكە رێژ ـ ناوكە رێژی كرد :ـ

ماندووو شپرزەی كرد هێندە هێنایو بردی ٠ ناوكە رێژ = وڵاخی باریی كە باری زۆری پێ ببرێتو بە تەنگیەوە نەیـــەن پشـــتی بریندار دەبێت دەڵێن ناوكەرێژ بووە ٠

ناو نیشان ـ ناونیشانی پەڵە هەورەکەیە :ـ

( دەگێڕنەوە شێتۆکەیەك هەر چەند پارەیەکی کۆ کردبێتـــەوە ، بردوویەتی لە دەشت ، لە حاستی پەڵەهەورێك بە ژێر گلیـــەوە کردووە ، وای زانیوە کە ئەو پەڵە هەورە لەجێی خۆی دەمێنێتەوە ئەمە بە یەکێك دەوترێت کە ناونیشانێك هەڵدات وەك هی ئەو پەڵە هەورە بێت ) ٠

ناهێڵێت ـ ناهێڵێت چاو بکاتەوە :ـ

بوارەی نادات ، سەرکوتی دەکات ٠

نەبەبەرخی ـ نەبەبەرخی تێر شیری خواردو نە بە کاوڕی تێر گیای خوارد :

بە یەکێك دەڵێن کە ژیانی منداڵی ناهەموارو پڕ لە کوێرەوەری بووبێتو گەورەییشی پڕ لە تاڵی ٠

نەبکەی ـ تەبکەی نە بخۆی تەماشای سای گەردنی بکەیت :ـ

واتا زۆر سپیو ناسكو جوانە ٠

نەترە ـ نە ترە دەنگی بێتو نە تسە بۆنی بێت :ـ

بۆ سووکی ( بە یەکێك دەوترێت کە لە هیچ روویەکەوە کەڵکی نەبێت ) ٠

نەخش ـ نەخشی رووی ئاوە :ـ

( واتا : زوو تێك دەچێت ٠ بە کارێك دەوترێت کە بناغەی نەبێتو هەر قسە بێت ) ٠

نەخت ـ نەختو پوخت :ـ

( شتی مایەداری بەنرخ ). نەخت = لە ( نقد ) ی عەرەبییەوە هاتووە

واتا : پارەیەکی مۆڵی بێ گیرو گرفت ٠

نەدار ـ نە دار بێت ، نە پەردوو نەحلەت بێت لە هەردوو :ـ

( بە دوو کەس ـ دووشت ـ ی خراپ دەوترێت کە یەکێك بڵێت

فلانیان لە فلان باشترە ) ٠ واتا هەردووکیان خراپن و چون یەکن ٠

نەدی ـ نەدی و بدی یە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە شتێکی بوو ئەو شتەی بەلاوە زۆر سەیر بێت و

نەزانێت چی لێ بکات یان خۆی زۆر پێوە با بدات دەڵێن نەدی و

بدی کوڕێکی بوو ـ لە جیاتی ناوکی چووکی بڕی ـ ناویان لێ نا

سەلکە کودی ٠

نەڕە دێو ـ نەڕە دێوە :ـ

بە یەکێك دەڵێن بە زۆری بە ئافرەت کە قەبەو دەنگ گڕو دەنگ

بەرز بێت ٠

نەرم ـ نەرم و نۆڵ :ـ

ئافرەت ، یان شتێك کە نەرم و شل بێت ، گۆشت و چەوری زۆر

بێت و جوان بێت ٠

ـــ نەرم و نیان :ـ

نەرم و نۆڵ ٠

نەرمان ـ نەرمانە :ـ
واتا : بۆی لە بارەو کارەکە ئاسانە ، بۆی گونجاوەو ڕێك کەوتووە ٠
بە تەوسیشەوە بە یەکێك دەوترێت کە بۆ کاری ئاسانو بێ گیرو گرفت بگەڕێت یان بیەوێت کەڵك لە یەکێك وەرگرێت کە ئاسان مل بداتو بێ بڕشت بێت ٠

نەشیش ـ نەشیش بسووتێت نە کەباب :ـ
( بە دزولا دەوترێت کە کارێکیان بەدەستەوە بێت واتا : هیچ لایەکیان پەلپ لەوی تریان نەگرێت بە ڕەنگێکی وا کەتووشی زیان بێت) ٠ با لە قازانجو زیاندا وەکو یەك بن ٠

نە گورگ ـ نە گورگخۆرەو نە دز بەرە :ـ
١ ـ ( بە شتێکی بێ نرخ دەوترێت ) ٠
٢ ـ بە گاڵتەوە بە ئافرەتێك دەوترێت کە پەکی کەوتبێتو کەڵکی ئەوەی نەمابێت کەس چاوی تێ ببڕێت

نە گوڵ ـ نە گوڵی گەنمی دیوەو نە چەقچەقەی ئاش :ـ
( بە تەوسەوە بە یەکێك دەوترێت کە لە شتێکدا خۆیت لێ گێلو هەڵە بکات ) ٠

نرخ ـ نرخەکەی شا عەباسە ـ نرخێکە شا عەباس بڕیویەتیەوە :
واتا : ئەم شتە لەو نرخە کەمتر نییە ٠

نفت ـ نفتو نۆیە ـ نورتو نۆیە :ـ
واتا : زۆر تازەیە ٠

نقام ـ نقامی گرتووه ـ فێری نقام بووه :ـ

بە ئەوسەوە ، بە رقەوە بە یەکێك دەوترێت کە فـــێری نەریتێك بووبێت لەگـــەڵ ئەوانەی دەورو پشـــتیدا نەگونجێت یان کردەوەیەك بکات رقی دەوروپشتی پێ هەڵسێنێت ٠

نمەك ـ نمەك سوێرە :ـ

واتا : چاکە لەگەڵ هەرکەسێکدا بکات پێی نازانێت‌و چاکەی بـــە خراپە دەداتەوە ٠

نمەك ـ نمەکی کردووە :ـ

نانی ئەو کەسەی خواردووە ، خێری لە دەستی ئەو کەسە دیوە ، ناپاکی لەگەڵدا ناکات‌و هەمیشە وەفای بۆی هەیە ٠

ــ نمەك کوێرە :ـ

ناپاك‌و پێ نەزانە ، چاکەی لەگەڵدا دەکەیت بە خـــراپە ئەمەکی چاکەکەت دەداتەوە چاکەی لەبەر چاو نییە ٠ سپڵەیە ٠

نمەك ـ نمەك گرتوو :ـ

( بە کەسێك دەڵێن کە لەگەڵ ئەو کەسەدا کە چاکەی لەگەڵدا کردووە بەد نمەکی بکات لە تۆڵەی ئەوەدا خوا بیگرێت ) ٠

ــ نمەکناسە :ـ

بە کەسێك دەڵێن کە چاکەی لەبەر چاو بێت ، پێ بزانێت ٠

نووزە ـ نووزە درێژە :ـ

١ ـ هەڵەوەرە لەسەر قسە زۆر دەڕوات‌و نایبڕێتەوە ٠

به منداڵێك دەڵێن كە گریا درێژەی بداتێو نەیبڕێتەوە ، نووزنە ٠

نوقلانە ـ نوقلانەی بۆ لێدا :ـ

نوقلانەی خێر ـ بوقلانەی شەڕ، بۆی رەخساند كە تووشی خێر یان شەڕ بێت ٠ دەڵێن نوقلانەی شەڕی بۆ لێدا ٠ یان نوقلانەی خێری بۆ لێدا ٠

نۆك ـ نۆكێك بە نۆ نانەوە دەخوات :ـ

زۆر رژدو چرووكە ٠

نۆنۆلە ـ نۆنۆلەیە :ـ

( بە گاڵتە پێ كردنەوە بە یەكێك دەڵێن كەڕەفتاری وەك ڕەفتاری منداڵی ساوا بێت ) ٠

نێچیر ـ بێچیری خۆت لەدەست مەدە ـ دەرمەكە :ـ

هەلێكت بۆ هات لە دەستی مەدەو كەڵكی لێ ببینە ٠

نێر ـ نێر بۆتەوە :ـ

بە ئەوسەوە بە كەسێك دەڵێن كە پێشتر سەرشۆڕی ناو كۆمەڵو بەردەستی ئەمو ئەو بێت ، سا لەبەر هەر هۆیەك بێتو كەوتبێتە قسەی زلو خۆ نواندنو هەڕەو گوڕەو خۆ بادان بەسەر ئەمو ئەودا ٠

ـ نێرە بیدۆشەیە :ـ

دەڵێن : من دەڵێم نێرەو ئەو دەڵێت بیدۆشە بە یەكێك دەڵێن كە

لەسەر قسەی خۆی سوور بێتو قسەکەش نابەجێو ناتەواو بێت
واتا : کەللە رەقێکە بیر ناکاتەوەو لێکدانەوەی نییە ·

— نێرە حەێتەیەکە بۆ خۆی :ـ
بە یەکێکی زلەی جەربەزە دەڵێن ·

نێر ـ نێرە کەرێکە بۆ خۆی :ـ
بە یەکێك دەڵێن کە ناشیرین بەسەر ئەمو ئەودا بخورێتو قسەی
ناتەواوو کردەوەی نابەجێ بکات · بۆ تەوسیشە ، بە گەنجێك دەڵێن .
کە بە دڵی گەورە رەفتار نەکات ·

— نێرە کوڕکەیە :ـ
بە کچێك دەڵێن کە حەز لە ناو کوڕان بکاتو حەز بکات یارییان لەگەڵدا
بکات ، حەز لە کاری پیاوانە بکات ·

نیشتووە ـ نیشتووەتە ملی :ـ
زۆری لێ دەکات ، بەسەر سەریەوە راوەستاوە تا کارێك بکات ؛
داخوازییەکەی بهێنێتە دی ·

نینۆك ـ نینۆکی لێ لێك دەدان :ـ
لە یەکتری بەردەدان ، بەرەنگاری یەکتری دەکردن ، لە یەك تیژی
دەکردن ·

— نینۆکیان کرد :ـ
١ ـ دەستەڵاتیان بڕی ·
٢ ـ تەمێیان کرد ·

نینۆك ـ نینۆكی نەبێت سەری خۆی بخورێنێت :ـ

واتا : ڕسواو بێ دەسەڵات بێتو كەڵكی خۆیشی پێوە نەبێت ٠

ئیوە ـ نیوەی هەزار پێنج سەدە :ـ

واتا : نائومێد مەبە ، دەروو هەر دەكرێتەوە ٠ گوێ مەدەرێ ٠

# و

وا ـ وانەدڕاوە پینە بکرێت ـ وا نەڕژاوە نەبژێت :ـ

( بە هەڵەیەك دەوترێت ئەوەندە زل بێت پینە ـ چار نەکریت) ٠ بە قەوماوێك دەوترێت کە چارەکردنی ئەنجامەکەی ستەم بێت ٠

وار ـ وارو وێخی دەرهێنا :ـ

وار = هەیە ٠ وێخ یۆخە ، واتا نییە ٠ دوو وشەی تورکین ٠ واتـا هەرچییەکی هەبوو نـەبوو بۆی فەوتاندو لە ناوی بردو هـەژاری خست ٠

والاّ ـ والاّ ڕنی کرد :ـ

بە کاڵی خواردی ٠

وای ـ وای لە قوونێو وای لە دۆشاوی :ـ

یەکێك ئەمە دەڵێت گرفتاری هەڵوێستێکی ناسك بووبێت ، دوو شتی هەبێت لە غەرغەرەو فەوتاندا بن ، هەرکامێکیان رزگار بکات ئەوی تری لە دەست بچێت ٠ وەك بڵێین : دارێکی بە دەسـتەوەیە هەردوو سەری پیسە ٠

وەجاخ ـ وەجاخ روونە :ـ

١ ـ مندالّی هەیە ، بە تایبەتی نێرینە ٠

٢ ـ منداڵەکەی جێی هومێدە ٠ باپیرانی زۆر دوور ئاگر پەرست بوون دەبوو لە هەموو ماڵێکدا وەجاخێك واتا ئاگردانێك بێت ،

گەورەی ماڵ کە پیاو بوو هەمیشە سەرپەرشتی ئـــەو ئاگرەی دەکرد کە نەدەبوو بکوژێتەوە · تەنهـــا نێرینەش دەبوو ئەو ئاگرەی بگڕاندایەو سەرپەرشتی بکردایە ، ئەگـــەر بهاتایەو ماڵێك نێرینەی لێ ببڕایەو منداڵی نێرینـــەیان نەبوایە ئەوە ئاگرەکەیان دەکـوژایەوەو وەجاخـەکەیان کـــوێر دەبوەوە ·
وەجاخی روونیش ئەوماڵە بوو کــە هەمیشـــە ئاگـــرەکەیان کوورەکانیان دەیان گڕاند ·

٣ ـ یان ( وەجاخ شوێن ئاگرە واتا چێشتخانە بووەو بۆ پیـــاوی بەخشـندە بەکار دێت ـ واتا هەمیشە چیشتیان بوژەو هەژارو نەدارای دراوسێ یان هی تر تێریان لێ خواردووە ـ لە تورکیدا بە ئوشاك هاتووە واتا منداڵ ) ·

وەجاخ ـ وەجاخ کوێرە :ـ ·
جاران بە یەکێك دەوترا کە منداڵی نێرینەی نەبوایە یان کـوڕەکانی خوێڕیو بێکارە بوونایە جێگەی هومێد نەبوونایەو لە جێی نەبوان بوونایە ، بەڵام ئێستە بە یەکێك دەڵێن کە هەر هیچ منداڵی نەبێت ، نەکوڕو نەکچ ·

وەحە ـ وەحەی لێ بکەیت دەچێتە گاگەل :
( واتا زۆر کەودەنو بێ لێکدانەوەیە ) ·

وەرز ـ وەرزی خۆی دەشکێنێت :ـ
وەرز = وەڕسی · واتا : دڵی خۆی خۆش دەکات ·

وەرەق ـ وەرەقی هەڵگێڕاوەتەوە ـ هەڵگێڕیاگەسۆ :ـ

ئەهامە تییەتی ، باری کەوتووە .

وەستا ـ وەستای قسانە :ـ

قسەزانە ، قسەقوتە . بە تەوسیشەوە بە یەکێك دەوترێت کە لە قسە کردندا بوارەی کەس نەدات .

وەك ـ وەك ئاو بخواتەوە :ـ

١ ـ واتا : زۆر بە ئاسانی کارەکەی بۆ کرا .

٢ ـ بە تەنگەوە نەهات .

ـــ وەك ئەسپێ‌و زەنگی بەلەسەی کردبێت هات بە ملما :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە لە شوێنێکی تر شێتگیرو توورە کرابێت‌و داخی دڵی خۆی بە یەکێکی تر برێژێت .

وەك ـ وەك بازەکەی ئەتا خانە بە مامرێ‌ناو ئاوایی فێرە :ـ

( بە زۆردارێکی ستەمکار دەوترێت کە هەر بە ئاوایییەکەی خۆی بوێرێت‌و زۆرو ستەم هەر لە ئاوایییەکەی خۆی بکات ) . بە یەکێك دەوترێت کە هەر بەوانە بوێرێت کە نزیکین‌و کەسین وەکو دەڵێن : هێزە هەر بە خاڵۆی خۆی خرە .

ـــ وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو :ـ

واتا : هیچی بۆ نەبوو ، بێ ئارەق دەرچوو ، رزگاری بوو ( بەرزەکی بانان مەوجوودێکی ئەفسانەییە بەو جۆرەی لە چیرۆکە فۆلکلۆرییە کوردییەکاندا باس کراوە ، زۆر درێژو باڵا بڵندە ، هەر لەسەر بانان

قیت دەبێتەوەو خۆی پیشانی خەڵکی دەدات یان بە پێ لەقە بانەکە دەکوتێتەوە گلزی خەڵکیماڵەکە دەکات ، کە بۆیشی چوون لەبەر چاو ون دەبێت) .

— وەك پیرسۆز شەوق بەر پای خۆی نادات ـ وەك مۆم رووناکی بۆ ژێر خۆی نییە ـ وەك چرایە سێبەری بۆ خۆیو تیشکی بۆ خەڵك :ـ
بە کەسێك دەڵێن کە خێری هەر بۆ بێگانە بێت نەك بۆ کەسو کاری .

وەك ـ وەك پیسایی تا چیلکەی تێوە دەیت زیاتر بۆن دەداتەوە :ـ
١ ـ ( بە مەردومی ناپاکی پیسی دەمدڕاو دەوترێت ) .
٢ ـ بە کارێك دەوترێت تا زۆرتر لێی بکۆڵیتەوە پیستری لێ ئەنجام بێت .

— وەك ترِی بن گۆم رۆیشت :ـ
ترِی بن گۆم دەنگی نییە . واتا : بە فیڕۆ رۆیشتو تۆڵەی نەکرایەوە ، لە دەست چوو بە بێ ئەوەی سۆراغێکی بکرێت ، دەست بکەوێتەوە ، کەسێك پێی بزانێت . ( بە شتێك دەوترێت کە بکرێتو کەس پێی نەزانێتو لە بیر بچێتەوە ) .

— وەك تیسکەی تفەنگ بۆی دەرچوو :ـ
واتا : زۆر بە گورجو خێرایی دەرپەڕی ، دەرچوو .

وەك ـ وەك حەمام قۆرغی کردووە :ـ
واتا : دەستی بەسەردا گرتووەو ناهێڵێت کەسی تر کەڵکی لێ ببینێت .

— وەك ـ وەسە ـ دەروازەی مزگەوتە ، نەدەفرۆشرێت نەدەسووتێت :ـ

به شتێك دەوترێت كە بەنرخ بێتو دەشێت هەر بمێنێتو دەسكاری نەكرێت ٠

— وەك ژیو كەوان هاتەوە یەك :ـ

واتا : بە قسەیەك یان كردارێك كە بەرامبەری كرا گرژو پەست بوو ٠

— وەك سەبەتەی ـ بن ـ بەن پچڕاوە ـ وەك ترازووی بەن پچڕاوە :ـ

١ ـ بێ دەسەڵاتە ٠

٢ ـ هیچی بەدەست نییە ٠

٣ـ لێ نەهاتووە ٠

— وەك ـ وەسە ـ سكل سوورە ـ لە پشكۆ گەرمترە :ـ

١ ـ جوانە ٠

٢ ـ لە سەركارەكەی هەتەرە ٠

٣ ـ تووڕەو دەمارگرە٠٠

— وەك فیشەكەشێتە بە ئاسماندا چوو دەروونی هەستاو توند بوو زۆر تووڕە بوو ٠

— وەك قوڕی زستان عافووە :ـ

واتا لێی ناگیرێتو چاوپۆشی لێ دەكرێت ، چونكە ناتەواوە ٠ ئیتر ناتەواوییەكەی هی هەرچییەك بێت ٠

وەك ـ وەك ـ وەسە ـ كەر دەروێشە :ـ

( بە یەكێك دەوترێت هاتوچۆی هەموو شوێنێك بكات ) چونكە كەری دەروێش سەر بە هەموو ماڵێكەوە دەنێت ٠

— وەك كەری ناو قوڕاو گیری خواردووە :ـ

بە تەوس و گاڵتە پێ كردنەوە بە كەسێك دەڵێن كە لە كارێكدا پەكی كەوتبێتەو چارەسەری خۆی پێ نەكرێت .

— وەك كەو چوو :ـ

( بە یەكێك دەوترێت كە بە قسەی یەكێك یان بە بینینی وا بچێت ـ تەریق بێتەوە بترسێت ـ قسەی بۆ نەكرێت ) .

— وەك كۆتر زوو دەگەڕێتەوە :ـ

واتا : بەوەفایە .

— وەك كێشكەی بە چلانە :ـ

( بە خواردنێكی كەم دەوترێت كە لەبەردەمی چەند كەسێكدا دابنرێت . واتا : ئەم خواردنە وەك چۆلەكەیەك وایە كە بۆ چل كەس دانرابێت ) .

وەك ـ وەك گای عەلی خۆی دەلێسێتەوە :ـ

بە كەسێك دەڵێن دەست بەتاڵ بێت یان تەمەڵ و كار نەكردە بێت .

— وەك گورگ بەدەم خشپەوە دەچێت :ـ

( بە یەكێكی بە هەڵپە دەوترێت كە لە هەر لایەكەوە سووسەی شتێكی كرد دوای كەوێت ) .

— وەك گوریسی گاگێرەی لێ هاتووە :ـ

بە كەسێك دەڵێن كە جڵەوی كاری لە دەست خۆیدا نەبێت .

— وەك گوریسی ناو هەمانەیە :ـ

( واتا زۆر بە پێچە ) ناڕاستو فێڵبازە ٠

— وەك گوڵۆڵە بەفرە هەتا تلەوەبێت گەورەتر دەبێت :ـ

( بە كاریك دەوترێت تا دەستی بدەیتێ خراپتر بێت ) ٠

— وەك گوێزی ئازایە :ـ

واتا : ساغو بێ خەوشە ٠ گوێزی ئازا ئەوەیە كـە كاكڵەكـەی بە ئاسانی دەربێتو توێكڵ تەنك بێت ٠

وەك ـ وەك گوێی كەر جووتن :ـ

بە دوو كەس دەوترێت كە زۆر دۆستو گونجاو بن بۆ پێكەنینو كاڵتە وایان پێ دەڵێن ٠

— وەك گیسكی دەربازبووی دەستی قەسابە :ـ

(چاوترساوی كارەساتێكی گەورەیە) ٠

— وەك گیسكی قەرزار نەگرتوو وایە :ـ

( واتا : زۆر لەڕو لاوازە) گیسكێك كە زۆر لاواز بێت خاوەن قـەرز لە بری قەرزەكەی وەری نەگرێت ٠

— وەك ـ وەسە ـ مار خۆش خەتو خاڵە :ـ

بە دیمەن جوانەو بە كردەوە وەك مار بە خەڵكەوە دەدات ٠

— وەك ماری پێ لە سكە :ـ

( بە كەسێكی رووالەت باشی دەروون خراپ دەڵێن ) ٠

— وەك مار پێچی خوارد ـ گینگڵی خوارد :ـ

بە ژانەوە بە خەفەتەوە تلاوتلی کرد · تلی‌دا ·

— وەك ماستی مەیبو وایە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت سەر راست بێت ، لە هیچ شتێکدا سەرپێچی نەبێت ) ·

وەك ـ وەك ماسی وایە جارێك سەر ئاوو جارێك ژێر ئاو دەکەوێت :ـ

( بە یەکێك دەوترێت هیچ ئەرکێکی بەسەرەوە نەبێت ) ·

— وەك مێشە لە هەموو شتێك دەنیشێت :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە شتین بێت (مادەپەرست بێت) تەماع وای لێ بکات گوێ نەداتە هیچ نەنگی‌و شەرمێك‌و بە هەموو شتێکیش قایل بێت ·

— وەك نێرەکەرەکەی عوزەیر پێغەمبەرە زەڕینی هەیەو پەڕینی نییە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت گوفتاری هەبێت‌و کرداری نەبێت ) ·

— وەك نیسك بەرو پشتی بۆ نییە :ـ

١ ـ بە کەسێکی هەلپەرستی خۆ پەرســـت دەوترێت کە بە پێی قازانجی خۆی هەر دەمە لەگەڵ یەکێك ، تاقمێکدا بێت ·

٢ ـ ( بە مەردومی دوو ڕووی دوو زمان دەوترێت ) ·

— وەك نیسکێنە زوو هەڵدەچێت :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە تووڕەو ترۆ بێت ) ·

وەك ـ وەك واشە خۆی پێدا دا :ـ

لە پڕو لە ناکاودا شتەکەی قۆستەوە ·

— وەك هێلكەو ڕۆنی سەر كلاورۆژنە وایە :ـ

( بە ئیشێك دەوترێت كە لە شوێنێك بێتو تۆ لە شوێنێكی دوو
هەوڵی بۆ بدەیت كە ئەو هەوڵە بێكەڵك بێت واتا : ئەگەر دەتەوێت
ئەو ئیشە سەر بگرێت بچۆ بۆ شوێنی خۆی لەوێ هەوڵی بۆ بدە )

وەلی ـ وەلی وەلی دەناسێت :ـ

( هەموو كەسێك هاوبیری خۆی دەناسێت ) .

وتی ـ وتی دایە هەتا تۆ ئامۆژگاریی منت كرد من سیو سێ مێشم بە گونی
كەرە كەوە ـ كەرە تاڵەوە ژمارد :ـ
بە منداڵێك بە یەكێك دەوترێت كە زۆر لاسار بێت ئامۆژگاری لـە
گوێ نەگرێت .

وتیان ـ وتیان بە كتك گووت بۆ دەرمان دەشێت كردییە ژێر خاكەوە ـ پشیلە
گووی بۆ دەرمان دەشیاە دەیكرد بە ژێر خۆڵەو :ـ
بە یەكێكی رژدی چرووك دەڵێن كە بەرچاو تەنگ بێت چاكەی بـۆ
كەس نەبێت ، شتێكی لێ بخوازن بیشارێتەوە ، حاشای لێ بكات ،
كارێكیان پێی بێت خۆی بشارێتەوە .

ورگ ـ ورگ دڕاوە :ـ
زۆر خۆرە .

— ورگی بە کۆڵیدا ـ بە شانیدا داوە :
( بە چڵێسێك دەوترێت کە دووی خواردن کەوتبێت ) ·

— ورگی سەر ناوە :ـ
بە کەسێك دەڵێن کە لەسەر خوانێك دانیشتبێت ، تێر خواردن نەزانێت ، تا خواردنەکە تەواو نەبێت دەست هەڵنەگرێت ·

وڕێنە ـ وڕێنەی نەخۆشە ـ دەبزرکێنێت :ـ
بە کەسێك دەوترێت داوای شتێك بکات نەبدرێتی ، قسەیەك بکات بۆی نەشێت · واتا قسەکەت وەر ناگیرێت‌و بیبڕەوە ·

وشك ـ وشکە ـ مرۆڤێکی وشکە ـ وشکەپیاوە :ـ
بە کەسێك دەڵێن کە لەگەڵ خەڵکدا دۆستایەتی نەنوێنێت .ناسك نەبێت ، رووی خۆش بەکەس نەدات ·

— وشك‌و تەڕی تێدا سووتا :ـ
واتا : گوناهیارو بێ گوناە پێکەوە گرفتار بوون ، بێ جیاوازی‌و لێك کردنەوەیان تیاچوون ·

وشکەڕۆ ـ وشکەڕۆی گەیشتۆتێ :ـ
واتا : لە تینواندا وشك بۆتەوەو تەڕایی لە لەشیدا نەماوە ·

وشکە سۆفی ـ وشکە سۆفی‌یە :ـ
سۆفییەکە زۆر بەتەنگ جێبەجێ کردنی دەستووری سۆفێتییەوە دێت‌و لە ژیانەوە دوورە · بە تەوسەوە بە یەکێك دەڵێن کە کوڕی

کۆڕ نەبێت ، حەز بە تێکەڵاوی‌و رابواردن نەکات .
واتا : وەك سۆفی گۆشەگیرە .

وشکە مزە ـ بە وشکە مزی کار دەکات :ـ
بێ خواردن‌و خواردنەوەو کرێ‌و پاداشت کار دە کات .

وشکەیی ـ وشکەیی دەکات :ـ
( بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە رووبامایی‌و ڕیایی بکات ) .



هـا ـ ها ـ وا ـ له بان ته‌له‌وه :ـ

به کەسێك دەڵێن كه ساویلكانه كـەوتبێته داوی پیاوی فێڵبازەوەو تووش بوو بێت ٠

ـــ ها ـ وا ـ له بان كای ئاگر تێ بەردراوەوە :ـ

به كەسێك دەڵێن كه ئەندێشـەو مەترسی گەمارۆی دابێت و ژیان و مانی له مەترسیدا بێت ٠

ـــ ها ـ وا ـ له کوورەی پەژارەدا :ـ

واتا : داخ و خەفەت تاساندوویەتی له داماویدایه ٠

هات ـ هات هاتەکەی رۆمه ـ بووه به هات هاتەکەی رۆم :ـ له هەڵوێستێکدا دەوترێت که چاوەڕێی یەکێك ، شتێك زۆری خایاندبێت و هەر نەبووبێت ٠

ـــ هاتەوه سەر ڕا :ـ

پەشیمان بۆوەوه ، گەڕایەوه ، ڕاست بووەوەو وازی هێنا ٠

هاوڕێ ـ هاوڕێ ـ فیق ـ ی قەلەندەری یه :ـ

واتا : وەك قەلەندەری لێ هاتووه ٠ ئەمه لەو پەندەوه وەرگیراوه که دەڵێت : ئەوەی دەبێته رەفیقی قەلەندەری له ریش و سمێل دەبێت بێبەری ٠ به یەکێك ئەمه دەڵێن که جۆره کردارو رەوشتێکی هەبێت جێی قایلمەندیی ئەو کەسه نەبێت که پێی دەڵێت ٠ یان تووشی زیانێك نوشوستیەك بووبێت بەهۆی ئەوەوه که هەڵـو کەوت لەگەڵ یەکێك یان تاقمێکدا بکاته خراپ بێت قەلەندەر وەك

( ابن بطوطة)[1] دەڵێت : ( قەرەندەری تایەفەیەکن ریش‌و برۆ یان دەتاشن ئەمانە سەر بە شێخ جەمالەدینی ساوی کە لە میسردان ) ابن بطوطه چیرۆکی جەمالەدین بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە دەڵێت . ( چی وای لە جەمالەدین کرد کە ریش‌و برۆی بتاشێت ؟ شێخ جەمالەدین پیاوێکی شێوە جوان بوو ئافرەتێك خەڵکی ساوە دڵی پێی دەچێت ، چەند نامەی بۆ دەنێرێت ، سەرە رێگەی لێ دەگرێت ، کە لەگەڵیدا رێك بکەوێت ، کەڵکی نابێت ، ئافرەتە لێی نائومێد دەبێت ئینجـــا پیرێژنێکی بە کۆڵکەوە دەکات . پیرێژن کاغەزێك بەدەستەوە دەگرێت‌و لە سەرە رێگەی مزگەوتیدا رێی پێ دەگرێت ، دەڵێت « کوڕەکەم ئەم نامەیەی بۆ ناردووم حەز دەکەم بۆم بخوێنیتەوە شێخ دەڵێت باشە . بەڵام پیرێژن دەڵێت کوڕەکەم ژنی هەیە بەشکو لە دالانی ماڵەکەماندا بیخوێنیتەوەو ئەو لەو دیو دەرگاکەوە گوێی لێ بێت . شێخ دووی دەکەوێت ، کە دەچێتە ئەو دیو دەرگاکەوە پیرێژن دەرگای لەسەر دادەخات‌و ژنەش کەنیزەکەکانی دەنێرێتە وێزەی بە زۆر شێخ دەبەنە ناو ماڵەکەوەو ژنەش ئەوسا زۆری لێ دەکات کە دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات شێخ کە دەبینێت هیچ دەرفەتێك‌و چارەیەك نییە دەڵێت باشە ، بەڵام دەست بەئاو دەگەیەنم ، ئاودەستەکەی پیشان دەدەن‌و ئاو لەگەڵ خۆیدا دەبات . گوێزانیـــکی تیژی پێ دەبێت سەرو ریش‌و سمێڵ‌و برۆی هەموو دەتاشێت کە دێتە دەرەوە ، ژنە بەو جۆرە دەیبینێت دڵی لە شێخ هەڵدەکەنرێت‌و لەبەر چـــاوی دەکەوێت‌و دەڵێت دەری‌بکەنە دەرەوە . بەو شێوەیە شێخ رزگاری دەبێت . پاشان هەروا مایەوەو هەرچی مریدێشی هەبوو هەموو وەك

(١) رحلة ابن بطوطة . لاپەڕە ـ ٣٤ ـ بیروت ١٩٦٠ .

ئەویان کرد · سەرو ریش‌و برۆو سمێڵیان تاشی ئیتر بەوە ناسراون )
ئەم بەندەش نیشانەی بەهێزیی پەیوەندیی کوردستانە بە دنیای
ئیسلامەوەو هوشیاریی کوردە ·

هاتینەوە ـ هاتینەوە سەر بای بەرە ـ هاتینەوە سەر یاسینی گۆلکێ :ـ
بۆ بێزاری دەربڕینە · واتا : هاتینەوە سەر باسە ، بارە ، نەشیاوو
ناتەواوەکەی جاران ، بە کەسێك دەوترێت کە هەر قسەیەك کرا یان
بارێك بوو ، بیباتەوە بسەر باسێك یان بارێکی بێزارکەری لەوەپێش ·

هاش ـ هاش‌و هووش ـ هاشەو هووشە ـ هارت‌و هوورت :ـ
خۆ هەڵکێشان‌و فشەو درۆی زل کردن · دەڵێن کەوتۆتە هاشەو
هووشە · واتا کەوتۆتە درۆو دەلەسەی قەبەی بێ جێ ·

هانا ـ هانام کردە دەمت :ـ
هانا = پەنا بردن · واتا : بەو قسانە بیت کە تۆ دەیکەیت · کەسێك
ئەمە دەڵێت کە خۆزگە بە قسەیەك بخوازێت کە بەرامبەرە کەی
بیکات ·

هەتا ـ هەتا ئەو بایە لەو کونەوە بێت حاڵ هەر ئەو حاڵە دەبێت :ـ
( بۆ کارێك ئەمە بەکار دێت کە لەبەر هۆیەك ئەنجامی ـ هەمیشە ـ
خراپتر بێت ) ·

— هەتا خۆم کوڕ بووم بە بانانەوە بەرتیلیان دەداو دەپاڕانەوە :ـ
یەکێك دەیڵێت کە لێکەوتبێت بۆ شانازی دەیڵێت ، تەشەر لە رۆزکار
دەدات کە چی لێ بسەر هێناوە · یان لەبەر دەمی یەکێکدا دەیڵێت
کە ئەم لەو باشتر بووبێت ·

— هەر کەسەو ـ یەکەو ـ لە ئاشێك دەکات :ـ

( بە کوڕێك دەوترێت کە کەس گوێ لە کەس نەگرێت‌و هەر کەسەیان بۆ خۆی قسە بکات ) • هەر یەکەیان باسی شتێك دەکات •

— هەر کەسە گوێز لە باری خۆی دەژمێرێت :ـ

( هەر کەسە بە پێی نیازو دڵ‌و دەروونی خۆی قسە دەکات ) •

— هەر ملەیەك سەختە ـ کام ملە سەختە ـ بڕۆ بیگرە :ـ

( بە یەکێك دەوترێت کە هەڕەشەت لێ بکات ) •

واتا : چیت لەدەست دێت درێخی مەکە •

— هەر موویەکی بە ساڵێك رووەوە •

( واتا زۆر وریاو چاو کراوەیە ) •

هەڕ ـ هەڕی لە بڕ ناکات :ـ

بە کەسێك دەڵێن کە سەری لە شتێك دەر نەچێت‌و هیچی لێ نەزانێت

( زۆر کەرەواڵەو هیچ نەزانە ) •

هەرا ـ هەراو زەنا = هەراو هۆریا :ـ

پشێوی‌و ئاژاوەو ژاوەژاو •

هەرە ـ هەڕەو گوڕە ـ هەڕەشەو گوڕەشە :ـ

ترساندن‌و بەربەست کردن •

هەرچی ـ هەرچی لە دیزەکەدایە دەری دەهێنم :ـ

واتا : چیم لە دڵدایە هەڵی دەڕێژم چ کەم‌و کووڕی‌و خراپییەك هەیە

دەری دەخەم‌و داخی دڵی خۆم سارێژ دەکەم ٠

— هەرچی لێی دوورە ڕەنگی سوورە :ـ

واتا : زۆر خراپە ، هەرچی لێوەی نزیك بێت بەشی پەژارەو داخ دەبێت ، پەکێکیش ڕەنگی سوور دەبێت کە لە ژیاندا دڵنیا بژی ، بە بێ دەردی دڵ‌و سەر ٠

— هەرچی‌و پەرچی :ـ

بە تاقمە مرۆڤێك دەوترێت کە سووك بێتە بە رچاو ، یان خۆیان سووك بن ، ناکەس بەچە بن ٠

هەزار ـ هەزار ئەحمەدو مەحموود دەکات :ـ

١ ـ بە پێچ‌و پەنایە ٠

٢ ـ پەلی بڵاوەو کاری زۆرە دەڵێن : سەری ئەحمەد دەکات بە قنگی مەحمووددادا هی مەحمود بە قنگی ئەحمەددا ٠

— هەزار ئاڵتم‌و ساڵتم دەکات :ـ

ئاڵتم ≑ ئالدم ٠ ساڵتم ≑ساتتم ≑ واتا : کڕیم‌و فرۆشتم ٠ دوو وشەی تورکین ٠ واتا : هەزار کەڵەکبازی ، ئاین‌و ئۆین دەکات ٠

— هەزار پەلی بە پشتی ئەودا داوە :ـ

واتا : ئەم لەو زۆر خراپترو بەد ترە ٠

— هەزار تەڵەی بە کلك تەقاندووە :ـ

ناکەوێتە داوەوە ، زۆرزانێکە ، فێڵبازێکە هاوتای نییە ٠

هەزار ـ هەزار فاكت بە فيكێكی :ـ

واتا : ئەو لە تۆ زۆرزانترەو گرەوی لێ نابەیتەوە بە دەسەڵاتترو بە توانانترە .

ـــ هەزار قوڕوو چڵپاوی بە قنگدا هەڵپڕژاوە :ـ

( واتا : لە دنیـادا زۆر قاڵ بووە ) تاڵیو سـویری ژیانی زۆر چەشتووە .

ـــ هەزار گۆزە دروست بكات یەكێكی دەستووی نییە :ـ

( بە یەكێك دەوترێت كە هەموو ئیشەكەی بە نیوەو نیوەچڵ بێت) .

ـــ هەزاری وا دەبەمە سەر ئاوو ئاوی نادەمو دەیهێنمەوە :ـ

بۆ شانازیی قسەكەرو بە سووكگرتنی ئەوی تر دەوترێت واتا : من لەو زۆرزانترمو باشتر لە ژیان دەگەم ئەو ساویلكەو بوودەڵەیە .

هەژدە ـ هەژدە هەژدە قسەدەكات :ـ

خێرا خێراو گوستاغانە دەدوێت .

هەلاجان ـ هەلاجان دەكات ـ نیشانە ناشكێنێت .

١ ـ زۆر بێ دەسەڵاتو بوودەڵەو كەم توانایە .

٢ ـ قسەكانی هیچی جێی خۆی ناگرێتو وەر ناگیرێت .

ـــ هەلاجیی لێوە دەكات :ـ

( قسە زۆر دەكاتو قسەكەیشی بەد گۆیی‌یە بە سەرو پۆتەلاكی ئەمو ئەودا دێت ، قسە دێنێتو دەبات ) .

هـەڵە ـ هەڵە داوان :ـ

دەڵێن : بە هەڵەداوان هات ٠ واتا : بە شپرزەیی‌و خێرایی هات ٠

هەلەق ـ هەلەق‌و مەلەق دەدوێت :ـ

( واتا قسەی بزرِ بزرِو شاش‌و وێش دەکات کە قسەکانی نەچنەوە سەر یەك ) ٠

هەڵەوەڕ ـ هەڵەوەڕە :ـ

بۆ سووکی بە یەکێك دەوترێت کە زۆر بڵێت‌و هەڵە زۆر بکات لە قسەدا ، یان قسەیەك بکات بە دڵی گوێگرەکەی نەبێت ٠ واتا : وەڕەی دێت‌و بە هەڵەش دەدوێت بە ناسـیاوو نەناس دەوەڕێت واتا : خراپ دەڵێت ٠

هەڵتۆقیوە ـ هەڵتۆقیوە :ـ

بە منداڵێك بەتایبەتی بە کچێك دەڵێن کە خەریك بێت پێ بگات ٠ واتا : باڵای کردووەو زوو گەورە بووە ٠ قارچك کە دەربێت ، سەر دەر بکات دەڵێن هەڵتۆقیوە ٠

هەڵگڕاوە ـ هەڵگڕاوە :ـ

واتا : زۆر دەوڵەمەند بووە پێ گەیشتووە وەك چۆن ئاگر بەرز دەبێتەوەو شەوق دەداتە ، کڵپە دەسێنێت ٠

هەڵیان ـ هەڵیان تەکاند :ـ

نابووتیان کرد ٠ وەك چۆن دەفرێك سـەرەوخوار دەکـرێت‌و رادەتەکێنرێت هیچی تێدا نامێنێت ٠

هەڵگێڕ ـ هەڵگێڕو داگێڕی کرد :ـ

سەرنجی لێ دا لێی کۆڵییەوەو بەراوردی کرد ٠

هەڵی ـ هەڵی تڕاند :ـ

بۆ گاڵتە پێ کردنە ٠ واتا : تیاچوو زیانێکی گەورەی لێ کەوت ، کارەکەی سەبری نەگرت‌و تووش بوو ٠ هەڵی تڕاند = خۆی پیس کرد ٠

هەمانە ـ هەمانەبەری بە کۆی زووخاڵ بێت :ـ

( واتا : درۆو فشەی زۆرە ، جاران درۆکانی وەکو لە هەمانەدا بووبێت وا بوو ، کەس پێی نەدەزانی ئێستە هەمبانەکەی دزراوەو درۆکانی کەوتوونەڕوو ) واتا : پەردەی لەسەر هەڵماڵراوەو رووی رەشی بەخەڵك ناسێنراوە ٠

ـــ هەمانە بەکۆڵە :ـ

خوازلۆکە ، سەر سواڵکەرە ٠

هەمانە ـ هەمانەی زۆر پەستراوە :ـ

واتا : خەریکە لەدەست دەچێت چونکە هەمانە کە زۆر پەستێورا شتی تێ ناخنرا دەتەقێت ٠ هەموو شتێك لە ئەندازەی خۆ ئەگینا لەدەست دەچێت ٠

هەموو ـ هەموو دەڵێی پشقلی بزنێکن :ـ

بۆ سووکی ( بە چەند خوشك‌و برایەك دەوترێت کە هەموو ناشیرین بن ) ٠

— هەموو ڕێیەك بۆ بانە دەچێت :ـ

واتا : بە هەموو جۆرێك یەك ئەنجام دەردەچێت ٠

— هەموو زەردێك ئاڵتوون نییە :ـ

(بە دیمەن دەسخەڕۆ مەبە ) ٠

— هەموو کەسێك مەنی ماڵی خۆیەتی :ـ

هەموو کەسێك گەورەی ماڵی خۆیەتی ٠

— هەموو گیانی جەربەندە بە نوشتەی مالووم بەندە :ـ

بە کەسێك دەوترێت کە هاواری گەلێك شوێنی ، جوستەی بکات

واتا : وەکو هەموو لەشی بە جەڕو بورغوو لێك ترابێتو جەرەکان

خاو بووبێتەوە چۆن پەکی دەکەوێت ئەویش وایە ٠

هەموو ـ هەموو لەشی ـ گیانی ـ پێ دەکەنێت :ـ

لە خۆشییەکی زۆردایە ، ئەو شتە ، ئەو شوێنەی زۆر بە دڵە

هەناسە ـ هەناسە بە قنگ دەدات :ـ

واتا : زۆر نەخۆشەو هەناسەی سوارە ٠

— هەناسەی سارد بووە :ـ

١ ـ باری کەوتووەو لێی قەوماوە ٠

٢ ـ دەردەکەی کوشندەیە ٠

٣ ـ نابووت بووە ، تووش بووە ٠

٤ ـ هومێدی بڕاوە ٠

هەنگوین ـ هەنگوین بە دەمی تاڵە :ـ

١ ـ ( زۆر خەفەتبارە ) ٠

٢ ـ دڵخوردە ٠

٣ ـ نەخۆشە ٠

ـــ هەنگوینی بێ مێشە :ـ

( بە دەسکەوتێکی بەنرخی بێ ئەرك دەڵێن ) ٠

ـــ هەنگوینی شەمەتلێنکەیە :ـ

هەنگوینێکی جیری خۆشی شان بچکۆلەیە ، لە جۆرە هەنگێـــکی تایبەتی پەیدا دەبێت :

١ ـ بە یەکێکی دڵ ناسك دەڵێن کە هەر لە خۆیەوە زویر بێت ، زوو هاواری لێ هەڵسێت ٠

٢ ـ بە یەکێك دەوترێت کە درەنگ خۆی دەربخـاتو خــۆی خۆشەویست بکات ٠

هاوسار ـ هاوسار ـ هەوسار ـ مەردوم داماڵراوە ـ لە جڵەو بەربووە :ـ

واتا : بەرەڵایەو گوێ بە کەس نادات‌و چی بە دڵدا بێت دەیکات ٠

هەوێن ـ هەوێنی نۆ قازان شیرە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە زۆر بەد بێت ، پێی بکەوێتە هەر شوێنێکەوە ، ئاژاوەی تێ بخات ٠ فێڵبازوو تەڵەکەباز بێت ٠

هەیپێ ـ هەیپێی لێ کرد :ـ

١ ـ هانیدا خێرا بڕوات ٠

٢ ـ خێرا رۆیشت تا زوو بگاتە جێ ٠

هـۆڕ ـ هۆڕ خوراوەو هەمانە ماوە :ـ
واتا : زۆر رۆیشتووەو کەمی ماوە ٠

هۆقە ـ هۆقەبازە :ـ
کەڵەکبازە ، دەغەڵی لە کاردا دەکات ، ناپاکە ، ناڕاستە ٠

هوورها ـ هوورهای ـ هەوهەوی ـ دوای گورگە :ـ
( بە یەکێك دەوترێت ماڵی یەکێکی خواردبێت بە هیچ رەنگێك لێی نەسەنرێتەوە ) واتا : هەرچی هـــاوارو پەلەقاژی بکەیت بۆت لێ ناسەنرێتەوە هەوڵو دەوڵەکەت وەك هی ئەو کەسەیە کە بە دەنگ بیەوێت بەرخێك لە گورگێك بسەنێتەوە ٠

هیچ ـ هیچ بە زمانیەوە ناوەستێت :ـ
زمان ئەسرەوتە ٠ نهێنیی قایم نییە ٠ زوو ئاشکرای دەکات ٠

ـ هیچی لە باردا نییە :ـ
بێ دەسەڵاتە ، بێ بڕشتە ، بوودەڵەیە ٠

ـ هیچی لە خۆ نەگرتووە :ـ
١ ـ خۆ ناگەیەنێتە هیچ کارێك چاکەیەك ، یاریدەیەك ٠
٢ ـ هیچ تەشەرو توانجو قسەیەك کاری تێ ناکات ٠

هیچ ـ هیچو پووچە :ـ
شتێك ، کەسێکی بێ کەڵكو بێ نرخە ٠

هێشتا ـ هێشتا ئەسپی نەکڕیوە ، ئاخوڕی بۆ هەڵدەبەستێت : بە کەسێك دەڵێن کە دەستی نەدابێتە کارێك ، شتێکی نەکڕیبێت ، خەریکی ... کردنی جێگەکەی بێتو بە خەیاڵ ئامادەی بەرخواردنی بێت ٠

ـــ هێشتا نەبووە بە قۆچەقانی ڤنگە ـ شرقە ـ ی لێوە دێت :ـ
( بە کەسێك دەوترێت کە لە پێش تەواو بوونی کارێکدا خۆی بۆ ئامادە بکات ٠ هەر وەك تەواو بووبێتو هاتبێتە کایەوە وا بێت ) ٠

هێڵ ـ هێڵی خوار لە ژێر سەری گای پیردایە :ـ
واتا : گوناهو خراپەیەك کە کراوە سووچی گەورەکەیە ٠

هێلکە ـ هێلکە بە بن هەنگڵ ـ بن باخەڵ ـ دەبرژێنێت ٠
واتا : گەنجەو خوێن گەرمە ٠

ـــ هێلکە رەنگ دەکات :ـ
مەرایی دەکات ٠

ـــ هێلکەو رۆنی سەر کلاو رۆژنەیە :ـ
( بە کارێك دەوترێت کە دووراو دوور دەستی بدەیتێ بە جۆرێکی وا کە هەوڵو تەقەلاکەی کارێکی ئەو تۆی بۆ نەبێت ) ٠

هێلکە ـ هێلکەی بێ زەردێنە دەفرۆشێت :ـ
( واتا : زۆر ناڕاستەو بە فڕوفێڵە ) ٠

هێندە ـ هێندە چەورە رۆنی لێ دەتکێت :ـ
( بۆ سەرزەنشتی کەسێکی نەخۆر بەکار دێت ) ٠

## ی

یاری ــ یاری بە پارە دەکات :ــ

پارەدارە ، ساماندارە ، دارایە ·

ــــ یاری بە ئاگر دەکات :ــ

١ ــ شەڕ دەنێتەوەو ئاشووبەو هەرا دەگێڕێت ·

٢ ــ بە کەسێك دەڵێن کە خۆی خستبێتە گێژاوێکەوە کە پڕ لە مەترسیو گاشەو ئەندیشە بێت ·

ــــ یاری شاترەو باری خاتر نییە :ــ

( واتا : هاوڕێیەکی سازی کارگوزارەو بار نییە بە سەر دڵانەوەو ئێسکی قورس نییە ) ·

یان ــ یان بە خانی خانان دەبیت یان بە بووکی بانان :ــ

واتا : لەو کارە گرانەی دەستت داوەتێ ، یا تێیدا سەردەکەویت ، سەربەرز ، بە ئامانج دەگەیت یان تێ دەشکێیت ، سەرەنگرێ دەبیت ، لە ناو دەچیت ·

ــــ یان گاڵ دێنێت یان پەموو :ــ

( یەکێك دەیڵێت کە ئیشێکی کردبێت ، ئەنجامەکەی نەزانێت · واتا : یان باش دەبێت یان خراپ ) ·

یەخە ــ یەخەی خۆی دادڕیوە :ــ

واتا : بێزارو وەڕسو خەفەتبارە ، لە دەست بارێك کەسێك ، ڕۆژگارێك ·

— یەخەی لێ هەڵتەکاند :ـ

( واتا لێی وەڕس بوو ) ٠

— یەخەی گرت :ـ

چوو بە گژیدا ، شەڕی پێ فرۆشت ٠

یەکان ـ یەکان دەردوو :ـ

یەکسەر ، بێ شەرمو پێچو پەنا ٠

یەک ـ یەک بایە :ـ

چووزی باریکە ، ئێسکی باریکە بە پێچەوانەیەوە ، دوو بایە ٠ واتا : ئێسکی ئەستوورەو لەشدارو بەخۆوەیە ٠

— یەک باڵە ـ یەک تەنە ـ یەک دەستە :ـ

واتا : یاریدەدەری نییەو بە تەنیا دەڕەنجێت کار دەکات ، هەر خۆیەتی ٠

— یەک چاو بووەوە :ـ

لە کارێک ، لە کەسێک ، لە شتێک رزگاری بوو کە خەریکی کردبوو ٠ کارەکە بەلایەکدا ساغ بووەوەو دەستی بەتاڵ بوو ٠

یەک ـ یەک دەستەن :ـ

واتا : وەکو یەکن ٠

— یەک دڵە :ـ

١ ـ پاکە ، ڕاستە ٠

٢ ـ ڕاڕا نییە ·

٣ ـ دڵنیایە ·

ـــ یەك دڵن :ـ

تەبان ، ڕێکن ، یەکیان گرتووە ·

ـــ یەك زمانە ـ یەك رووە ـ یەك ڕەنگە :ـ

١ ـ قسەی پاشملەی نییە ، پێچو پەنای نییە ·

٢ ـ راستگۆیە ·

یەکشەوە ـ یەکشەوەیە :ـ

بە یەکێك دەڵێن کە زوو ، لە ناکاودا دەوڵەمەند بووبێت شا یا بە

میرات ، یان بە شتێکی تر ·

یەکشەویلە ـ یەکشەویلەی قنگ قەویلەیە :ـ

بە گاڵتەوە بە منداڵێك دەوترێت کە زۆر قەڵەوو گەورە بێتو زوو

بە خۆیدا هاتبێت ·

یەك ـ یەك قسەیە :ـ

١ ـ سەر ڕاستە ·

٢ ـ کە گفتی دا دەیباتە سەر ·

٣ ـ لەسەر قسەی خۆی سوورە ·

ـــ یەك ماڵن :ـ

( زۆر دۆستنو ماڵیان جیا نەکردۆتەوە ) ·

ـــ یەكو دووی لێ ناکات :ـ

واتا لێی ڕاڕا نابێت ، بە بێ لێکدانەوەو لێ ڕامان پەلاماری شتەکە ،

کارەکە دەدات ·

ـــ یەکێکیان پۆڵاو یەکێکیان ئاسنە :ـ

واتا : هەردووکیان ڕەقنو لەگەڵ یەك توندو تیژن لەبەر ئەوە

لەگەڵ یەکدا هەڵ ناکەن ·

## - سوپاس -

پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا محمد مصطفى كوردی دەكەم كە بە كتێبەكەمدا چووەوەو نزیكەی سێ ئیدیۆمیكیشی بە لێكدانەوەوە خستە سەر ئیدیۆمەكان ·

هەر وەها سوپاسی مامۆستا محمد شەڵاشی دەكەم كە لە لێكدانەوەی هەندێك ئیدیۆمی هەورێمی تردا یارمەتی دام ·

(١) مامۆستا · ع · ع شەونم كە یەكێك بوو لــە ئەندامانی لیژنەی دانانی كتێبەكە لە رۆژنامەی عیراقی ژمارە (٥٢٧)ی ١٧/١١/٩٧٧ دا هەندێك رای دەربارەی دانانی كتێبەكە دەربڕیبوو كە زۆر لە راستییەوە دوورە ، لە كاتی خۆیدا ، بەرپەرچی راكانیمان دایەوە بەڵام بەداخەوە بۆیان بــڵاو نەكردینەوە ··

مامۆستا ع·ع · شەونم دەڵێت : ( من اســی ئەو كتێبەم داناوە وەكو چاپ كراوەو پێشەكییەكەیشم نووسیوە · مامۆستا عمر عارفیش لەوەدا یارمەتی داوم ، چونكە ئێمە هەردووكمان ئەندامی لیژنەی یەكەم بووین كە پێمان سپێردرا ئەم كارە بكەین · كتێبەكەم بە شێوەی تەقریرێك دا بــە نەقابەی مامۆستایانو پاش شەش مانگیش لیژنەیەكی تری پێك هێنا منو مامۆستا جلال محمود علىو عمر على امینو رشــید هــەورامی بووین · كارەكەیشمان پیاچوونەوەی كتێبەكە بوو · بڕیاریش درا سێ بەشی تری بخرێتە سەر · نەریتی كۆمەڵایەتی مامۆستا رشید هەورامی ئامادەی كرد · داوودەرمان مامۆستا جلال محمود على ئامادەی كرد ئەستێرەوانی هی حمە سلێمانە ئامادە كردنی بە مامۆستا حمە صالح سعید سپێردرا كێشــانی هەموو وێنەی كتێبەكەش مامۆستا عمر علىامین گرتییە ئەستۆی خۆی ، بە دوو حەفتە كتێبەكە ئامادە كرا ) ·

١ ـ جارێ لیژنەی یەکەم بریتی بوون لە مامۆستایان ٠ ع ٠ ع ٠ شەونم عمر عبد الرحيم ٠ عمر عارف ٠

٢ ـ اسسی کتێبەکەش تەنها بریتی بوو لە ناونیشانی هەندێك لەو بەش‌و باسانەی کە لە کتێبەکەدایە ٠

٣ ـ پێشمە کیبەکەیشی ئەو نەینووسیوە بەڵکو (مسودە)ی وەرگێڕانەکەی لە کتێبی ( الفنون الشعبیە)ی مامۆستا ئەحمەد روشدی سالح‌ەوە ئامادە کرد لیژنە لەگەڵ کتێبەکەدا بەراوردی کرد ، پاش پیـــــاچوونەوەو لێکۆڵینەوە ، بڕیاری لەسەردا ٠

ـ کاری لیژنەکەش بۆ دانانی کتێبەکە بەم شێوەیە بوو : بڕیار درا کە هەر کەسە لە ئاستی خۆیەوە بۆ هەموو بەشەکان (مادە) کۆ بکاتەوەو ئامادەی بکات ،هەندێك بەشی سەرەکیش دابەش کرا ، ویژە مامۆستا ع ٠ ع ٠ شەونم هەڵی گرت ٠ کێشانی وێنەکان درا بە مامۆستا عمر علی ٠ نەریتی کۆمەڵایەتی بە مامۆستا رەشید هەورامی ســـپێردرا دەرمان‌و تیمار کردنیش بە من سپێردرا ، بەشی ئەستێرەوانی مامۆستا محمد صالح سعید ئامادەی‌کرد کە ئەندامی لیژنەی پیاچوونەوەی کتێبەکە بوو ، لیژنەکەش بریتی بوو لە مامۆستایان محمد صالح سعید و عبدالله میدیاو عمر عبدالرحیم‌و مصطفی صالح کریم ٠ بەڵام بەشـــــەکانی تری کتێبەکە هەموو لیژنەکە دایناوە ، نەك تاکە کەسێك ٠ جگە لەوە ئەو بەشانەش کە دابەش کرابوون ویژەو تیمارو نەریتی کـــۆمەڵایەتی‌و ئەستێرەوانی ، لیژنەکە هەموو بەشداری تێدا کردووە ٠ بەڵکو ئێمە کەڵکمان لە زۆر کەسی تر کە بانگمان دەکردن بۆ نەقابە وەرگرت وەك

مامۆستا قادر محمد مصطفی کوردی که ناوی گەلێك له هەڵپەڕکێکانی
داینێ . له بەشی مۆسیقادا کەڵکێکی زۆرمان له مامۆستا قادر دیلانو
عەبەی سەیزاده وەرگرت له بەشی پیشەسازیدا مامۆستایان ابراهیم
سەرکیسو امین مووتابچی . بۆ کەلو پەلی ناژەڵ له خەڵکی مەڵکەندی
که خۆم ئەوانەم ئامادە کرد . له بەشی ئەستێرەوانیدا کەڵك له مەلا
قادری مەلاکەریمی مەڵکەندی وەرگیرا جگه له هینەکەی حمه سلیمان .

٥ ـ کتێبەکەش ئەرکو ڕەنجی سێ مانگەی هاوینی ئەو ساڵەیه که دوو تاق،
بەیانیو [illegible] ارە دەهاتینەوە نەك هی دوو حەفتەیە ، هی هەموانە نەك
[illegible] ـلام لێرەدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کەئەو ( اسـانەی )
لیژنەی یەکەم داینا بوو گەرچی هەندێك سەرباسی کتێبـەکەبوون
دەورێکی دیاری هەبوو له دانانی کتێبەکەدا .

## ـ سەرچاوەکان ـ


١ ـ گـۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ـ زانستگای بەغدا ژمارە (١٩) سـالّی ١٩٧٦ ٠

٢ ـ وشەی زمانی کوردی ـ د٠ ئەورەحمانی حاجی مارف ٠

٣ ـ پەندی پیشینان چاپی دووەم سالّی ١٩٧١ ـ شێخ محمدی خالّ

٤ ـ فەرهەنگی خالّ بەرگی یەکەمو دووەمو سێیەم ـ شێخ محمدی خالّ ٠

٥ ـ ئەستێرە گەشە ـ فاضل نظام الدین ٠

٦ ـ قامووسی زمانی کوردی بەرگی یەکەمو دووەم ـ عبدالرحمن محمد امین زەبیحی ٠

٧ ـ پەندی پێشینان ـ اسماعیل حەقی شاوەیس ٠

٨ ـ پرو پوچی پێشینان ـ اسماعیل حەقی شاوەیس ٠

٩ ـ پەندی پێشینان ـ معروف جیاوك ٠

١٠ ـ هەزار بێژو پەند ـ معروف جیاوك ٠

١١ ـ فەرهەنگی مەردۆخ ـ بەرگی یەکەمو دووەم ٠

١٢ ـ تاریكو روون ـ هێمن ٠

١٣ ـ رشتەی مرواری بەرگی ( ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ ، ٦ ) ـ علاء الدین سجادی ٠

١٤ ـ پەندی کوردی ـ عومەر شیخەلاّ دەشتەکی ٠

١٥ ـ گۆڤاری گەلاوێژ ساڵانی (٩٤١ ، ٩٤٢ ، ٩٤٣ ، ٩٤٤ ، ٩٤٥ ، ٩٤٦ ) ٠

١٦ ـ رابەر گیو موکریانی ٠

١٧ ـ لە پەندەکانی پیرەمێرد ( بەرگی ١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ) ٠

١٨ ـ رەوانبێژی ـ عەزیز گەردی ٠

١٩ ـ Toufic Whahby and Akurdish English C J Edmonds English Dictionary

٢٠ ـ جواهر البلاغة في المعاني والبيان والبديع ـ أحمد الهاشمي ٠

٢١ ـ رحلة ابن بطوطة ٠

٢٢ ـ المورد ( قاموس انكليزى ـ عربى ـ منير البطلبكى ) ٠

٢٣ ـ شانۆی ناو ماڵ ـ مەلا مستەفای سەفوەت ٠

٢٤ ـ السراج الوهاج ـ الشيخ محمد الزهرى الغمراوى ٠

٢٥ ـ المغنى المحتاج ـ الشيخ محمد الشربينى ٠

Toufic Whahby and Akurdish English C J Edmonds
English Dictionary

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
سلسلة الفولكلور
- ١ -

# الكناية في اللغة الكردية

جلال محمود علي

مطبعة حسام

رقم الايداع في المكتبة الوطنية [illegible] لسنة ١٩٨٢ السعر (١,٠٠٠) دينار